# مام دەروێش

## تەمەنێک لە تێکۆشان

ئامادەکردنی:
علی شێخ عبدالقادر عازەبانی



چاپی یەکەم
2020

# مام دەروێش

## تەمەنێک لە تێکۆشان


ئامادەکردنی

عەلی شێخ عەبدولقادر عازەبانی



٢٠٢٠

**مام دەروێش، تەمەنێك لە تێكۆشان**

---

بابەت: یادەوەری

یاداشتكردنی: دەروێش ساڵح

ئامادەكردنی: عەلی شێخ عەبدولقادر عازمبانی

تایپ: باوەڕ تاوگۆزی

هەڵەچنی: نزار نوری

دیزاینی بەرگ: دانیار عەتا

دیزاینی ناوەرۆك: نزار نوری

نۆبەتی چاپ: چاپی یەكەم

تیراژ: ١٠٠٠

چاپخانە: تاران

ژمارەی سپاردن: (١٧١٧)ی ساڵی (٢٠٢٠)ی بەڕێوەبەرێتی كتێبخانە گشتییەكانی سلێمانی پێدراوە.

# پێشکەشە

- بە گیانی ئەو شەهیدانەی تا دوا هەناسەیان بەرگرییان لە مافە ڕەواکانی میللەتەکەمان کرد، چ لە پێشمەرگایەتی لە مەیدانی خەبات و بەرخۆدان، چ لە زیندان لەبەردەم پەتی سێدارە و ئازار و ئەشکەنجەی جەللادەکان.
- بەو هەموو گوندنشینانەی کە مەکۆی خەبات بوون، پاروی دەمی خۆیان و خێزانەکانیان دەکردە ژەمە خۆراکی پێشمەرگە.
- بە خێزانەکەم، کە بەهۆی بیروباوەڕی منەوە راپێچی زیندان کران و دواجار لە شاخ و ژیانی پێشمەرگایەتیدا لە هەموو خۆشییەکی ژیان بێبەری بوون.

# پێشەکی

## مام دەروێش، دەروێشی کوردایەتی



تا ئێستا، پێشەکیم بۆ بیرەوەری هیچ سەرکردە و سیاسەتمەدارێك نەنووسیوە، بەڵام پێمخۆشە بۆ ئەم کتێبەی مام دەروێش، پێشەکییەکی کورت بنووسم، بۆ؟

لەبەر ئەوەی ئەم جوامێرە، لە شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێیشدا، پێشمەرگە بووە ماوەیەکیش لەبەر پاکی و بێباکی لە خەباتی چینایەتی، چووەتە ڕیزی حیزبی شیوعی عێراقەوە. کاتێك، دواجاریش بینیم، ماوەیەکی کەم پێش کۆچکردنی، پێی گوتم بیرەوەرییەکانم دەنووسمەوە. منیش زۆرم بەلاوە خۆشبوو، چونکە دەمزانی ئەویش پێی خۆشە نووسینی پێشەکییەکەی، بە من بسپێردرێت.

پاش ئەوەی بیرەوەرییەکەیان بۆ ناردم و چاوێکم پێیدا گێڕا، جوتیارێك لە شەستەکانەوە، لە نێو ڕووداوەکانەوە بیرەوەری و بیروباوەڕی خۆی لەسەر یەکەمین تەقەی شۆڕشی ئەیلول (١٩٦١) هەتا دوا ساتەکانی ژیانی سیاسی دەگێڕێتەوە. کاتێك لە بەسەرهاتەکانی ورد دەبینەوە، دەبینین ئەم تێکۆشەرە

نەخوێندەوارە، لاپەڕەی ڕووداوی ئەوتۆی هەڵداوەتەوە، سیاسییە گەورەکانیش باسیان لێوە نەکردووە. بۆ نموونە، لە سەرو بەندی تێکچوونی پارتی و حکومەتی قاسم، شاد ڕەوان برایم ئەحمەد چووەتە دەربەندیخان و لە کۆبوونەوەیەکدا، گوتوویەتی: "جارێ زووە بۆ دەستپێکردنی شۆڕشی چەکداری، با مۆڵەت بدەین بە عەبدولکەریم قاسم چاکسازییەکانی بکات و ئێمەش هاوکاری بین هەتاوەکوو وڵاتەکەمان ببوژێتەوە.. تاد". ئەو بۆچوونەی برایم ئەحمەد، یەکەمین جارە دەیبیستم کە دوای یەکەمین شەڕ لە دەربەندیخان کردوویەتی، ئەم بۆچوونەش بۆ ئەو هەلومەرجە قسەی زۆر هەڵدەگرێ، کە جارێ لەم پێشەکییەدا کاتی نیە.

مام دەروێش بە سادەیی باسی ڕووداوەکان دەکات. رق و کینە لە بیرەوەرییەکانیدا نیە، بەڵام خوێنەر تێدەگەنێت، پارتی و شیوعی و حکومەت، چی بوون و چییان کردووە. هەروا، دوای ئەوەش تا شۆڕشی نوێ.

سەرەڕای ئەوەی، جوتیارێکی ئاسایی بووە، بەڵام بووە بە پێشمەرگە و فەرماندە، کەچی ڕەچەڵەکی خۆی بە هەژاری باس دەکات. ژیانی ڕوون دەکاتەوە کە چۆن بە سەربەرزییەوە ژیانی گوزەراندووە. لە تەواوی بیرەوەرییەکانیدا، تاوانێکی تێدا نیە، دزی تێدا نیە، تەنها شایەتێکی ڕاستگۆی ڕووداوەکانە. خوێنەری ژیر دەتوانێ وردەکاری ڕووداوەکان لەم بیرەوەرییەدا بدۆزێتەوە و دۆخی ڕووداوەکانیش بزانێ، بە تایبەتی مام دەروێش لە نێو شۆڕشی نوێدا، هزرو بیری جوانتر دەگەشێتەوە و ڕووداوەکان بە تان و پۆی شۆڕشگێڕانە، وەك شۆڕشگێڕێك توانیبێتی ئەرکەکانی ڕاپەڕێنێ، دەهۆنێتەوە. هەست دەکرێ، شۆڕشی نوێ و کۆمەڵە و یەکێتی، بە هی خۆی زانیوە. دڵی پێیان خۆشبووە و ویژدانی ئاسوودەیە، کە لە ڕیزەکانیاندا تێکۆشەر بووە.

یەکەمین جار لە قەرەداخ، لە دێی بەڵخە، کاتێک هەڤاڵ مستەفا چاوڕەشمان برد دوای شەهید سیروان تاڵەبانی، ئەرکی هەرێمەکەی پێ بسپێرین، مام دەروێشم بینی. چاوڕەش دەیناسی و کۆن پێکەوە پێشمەرگەی شیوعی بوون و دەیشیزانی مام دەروێش قسە لە ڕووە. پێی گوتم ڕێزی بگرە، چونکە ئەم پیاوە لە دڵسۆزییەوە قسە دەکات. لە یەکەمین کۆبوونەوەی سەر کانیی بناری شاخدا، باسی شۆڕش و دۆخەکەم بۆ دەکردن، بە تایبەتی تازە شەهید سیروان و هاوڕێکانی گیانیان بەخت کردبوو. مەخابن، بەرپرسیاری دەڤەرەکەش، بەزیبوو. بەبێ سەرپەرشت هێزەکەی جێهێشتبوو، بە کورتی فەرماندەیەکی وەك مستەفا چاوڕەش نەبوایە، جڵەوی هێزەکە لەو دۆخەدا، ڕانەدەگیرا. منیش بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان و ڕێکخستنەوەی هێزەکە و سەرخستنی کاکە مستەفا، هاوڕێیەتیم کردبوو. ئەو کاتە کۆمەڵەو شۆڕش ئاوها بوو. گیانی هاوڕێیەتی پیرۆز بوو. ڕێگەی سەخت دەگیرایەبەر بۆ ئەوەی هاوڕێ و هاوسەنگەرەکەی سەرکەوتوو بێت. بەداخەوە ئەو گیانە بەرزەفڕەی شۆڕشگێڕێتی کرایە قوربانی هەلپەرستی و مشەخۆری!!

مام دەروێش لە کۆبوونەوەکەدا هەڵساو بە دەنگێکی دلێر، بۆچوونی خۆی گوت و ڕەخنەی خۆیشی گرت، منیش بە پێکەنین و ڕێزەوە، وەڵامم دایەوە. زۆری پێخۆشبوو. لەو دەمەوە بوو بە دۆست و هاوڕێم. لەم بیرەوەرییەدا، دۆستایەتییەکەی ڕەنگی داوەتەوە، بۆیە کاتێك دێتە سەر ئەو ڕووداوانەی منی تیا دیوە، بە ویژدانەوە دەیانگێڕێتەوە. بۆ نموونە، لە کاتی شەڕی قڕناقا و پشتئاشان و کێشەکانی مەڵبەندی یەکدا، دەڵێ:

"بە فەرمانی مەلا بەختیار ڕێگە درا هەموو پێشمەرگەکانی حزبی شیوعی لە قەرەداخ کۆبوونەوە و بە سەلامەتی و بەبێ شەڕ پاشەکشە بکەن بۆ شارەزوور و سورێن". ئەمە ویژدانێکی جوانە. هەن، هەر ئەو ڕووداوە بە

پێچەوانەوە دەگێڕنەوە. ئەمە لە کاتێکدا، سەدان شایەتی ڕووداوەکە زیندوون. دیارە ئەوەی بیەوێ مێژوو چەواشە بکات، گوێ ناداتە شایەت و بەڵگە. مام دەروێش، لە کاتی ڕزگارکردنی خانەقینیشدا لەگەڵمان بوو، لێرەش بە ویژدانەوە ڕووداوەکان باس دەکات، ئەوەتا دەڵێت:

"کاتێک خانەقین لە (٢٠٠٣)دا بە تەواوی ئازاد کرا، مەلا بەختیار کارەکانی خۆی گواستەوە بۆ نێو شاری خانەقین و زۆر بە هێمنانە لەو ناوچەیەدا سەرپەرشتی نەهێشتنی سیاسەتی تەعریبی کرد، بەبێ ئەوەی دڵۆپێك خوێن لە لووتی کەسەوە بێت. هەموو ئەو عەرەبانەی بە سیاسەتی بەعس بۆ عەرەبکردنی ناوچەکە هاتبوون دەریکردن.. تاد".

بەهیوام مێژووی تێکۆشەرانی وەکو مام دەروێش، با نەخوێندەواریش بووبن، بە هەر شێوەیەك بووبێت، تۆمار بکرێ و ئەو ڕووداوە نەزانراوانەی ڕووبەڕوویان بوونەتەوە، بخرێتە بەردەم ویژدانی نەوەکان.

مام دەروێش، دەروێشی کوردایەتی و کوردستان بوو. دەیان دەروێشی دیکەش هەن، لەنێو ڕووداوەکاندا بوون و قارەمانیش بوون، بەڵام زۆربەیان لەگەڵ خۆیاندا بیرەوەرییەکانیان بردووەتە گۆڕی نەمری.

ئێستا ئامێر زۆرە. توانای تۆمار کردن بێڕادەیە. هەقە ڕێچکەی مام دەروێش بگیرێتەبەر و بیرەوەرییەکانیان لە فەوتان ڕزگار بکرێ، بەڵکو هەقە دەزگای تایبەتی هەبێت بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم ئەرکە مێژووییە.

ڕۆحت شاد بێت مام دەروێش، چونکە وەجاخی مێژووت ڕۆشنە.

مەلا بەختیار

٢٠١٩/١١/٥



# وتەیەك

لە دوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی (١٩٩١) دژی ڕژێمی بەعس لە کوردستاندا، کە چەندین ساڵ بوو بە زەبری ئاگر و ئاسن فەرمانڕەوایی دەکرد، بواری نوسین و چاپەمەنی لەژێر چاودێرییەکی توندا بووە، کەشێك هاتە ئاراوە نوسین و ڕادەربڕین ئازادییەکی زۆری بەخۆوە بینی. زۆرێك لە فەرماندە و سەرکردەکان کەوتنە نوسینەوەی بیرەوەرییەکانیان و خستیانە بەردەم خوێنەران. بەندە هەرچەندە خوێندەواریم نیە، بەڵام لە ڕێگەی خوێندنەوەی منداڵەکانمەوە بە هەندێکیان ئاشنابووم. هەندێکیان زۆر زیاتر بەشان و باڵی خۆیاندا هەڵیانداوەو خۆیان کردووەتە قارەمانی سەرکەوتنەکان و نشوستو تێکشکانەکانیشیان خستووەتە گەردنی بەرامبەرەکەیان، هەندێکیشیان زۆر بە ویژدانەوە ڕووداوەکانیان تۆمار کردوەو خۆیشیو حیزبەکەیشی لەو هەڵەو کەم و کوڕییانە نەبواردووە، کە ڕوویانداوە.

لـه هـەموو شۆڕش و بەرخودانێکدا کەسانێك دەبنـە سـەربازی ون. مـن خۆم دیومەو بیستوشمە پێشمەرگەی ئاسایی وا هەبووە لە بەرەکانی جەنگدا لـە پێشـی پێشـەوە فیـداکاری وای نوانـدووە ڕێـڕەوی شـەڕەکەی بـە قـازانجی پێشمەرگە گۆڕیووە، بەڵام دەستخۆشییەکە لە کەسێکی دیکە کراوەو مەدالیای ڕێزلێنـانی وەرگرتـووە، کـە لـە دوای بـەرەکانی شـەڕەوە بـە دووربـین سـەیری شـەڕگەکەی کـردووە، یـا چـەندین کیلـۆ مـەتر لـە ڕووداوەکـەوە دووربـووە، پاشانیش لە نووسینەوەی مێژووی شەڕەکەدا خۆی بووەتە پاڵەوانەکەو ئەو پێشمەرگەیەی فیداکارییەکەی نواندووە دوورو نزیك باسی لێوە نەکراوە.

ڕاسـتە فەرمانـدە نەخشـەدانەری شـەڕەکەیەو لـە سـەرکەوتن و شکسـتدا بەشـی گـەورەی بەردەکـەوێت، بـەڵام بـا ئـەو قارەمانانـەش ڕۆڵـی ئازایانـەیان فـەرامۆش نـەکرێت، خـۆ ناشـبێت بـیرەوەری و خەباتـەکان هـەر کەسـانی سەرکردەو پلەدارەکان بینوسنەوە.

ماوەیــەکی زۆرە کەڵکەڵــەی ئــەوەم لەســەردایە هــەتا خــۆم مــاوم بیرەوەرییەکانم بخەمە دووتوێی نووسینەوەی یادەوەرییەك و بە خوێنەرانی ئاشنا بکەم و مـەڵۆی خـەباتی چەندین ساڵەی پێشمەرگایەتیم بخەمە سـەر خـەرمانی مێـژووی نەتەوەکـەم. پێمباشـە ئەوەنـدەی بتـوانم لـە پـاڵ ژیـانی تایبەتیی خۆم مێژووی گوندەکەشمان، لە ڕووی بەرخۆدان و بەشداریکردن لە شۆڕشـە یـەك لـە دوای یەکـەکان و پێگـەو سـەنگی دانیشـتوانەکەی لـە زۆر لایـەنی زۆری ژیانـەوە تۆمـار بکـەم. هـەروەها دەربـارەی ژیـانی کۆمەڵایـەتی و بـاری ئـابووری و بـواری خوێنـدن و هەڵکەوتـەی جـوگرافی و ڕۆڵ و نەخشـی مێژوویی بخەمەڕوو.

بۆ ئەم مەبەستە جگە لە زانیارییەکانی خۆم پرسیارم لە زۆر کەسی دیکە کردووەو ئەوەندەی بۆم کرابێت هەندێ زانیاریم خستۆتە نێو یادەوەرییەکەم بـۆ ئـەوەی ببێتـە مێـژوو تـا لـە فـەوتان بپارێزرێت. بـە پێویسـتی دەزانـم زۆر

سوپاسی ئەو کەسانە بکەم کە هەر مێژوویەکیان لابووە هاوکارییان کردووم.

لەم یادەوەرییەدا هەندێك شێوازی بواری کشتوکاڵیو کارە دەستییەکانی ژیانی سەردەمی کۆنو ئەو کەرەستانەم تۆمارکردووە، کە لە کاتی مێرمنداڵی و هەرزەکاری مندا بۆ بژێوی ژیانی خۆیان بەکارهێنراونو ئێستا وەك شتێکی نامۆ وان بۆ گەنجانی ئەمڕۆ، تاوەکو نەوەی ئەمڕۆ پێیان ئاشنا ببێت و بزانن باوك و باپیرانیان چۆنو بە چ شێوەیەكو زۆر سەربەرزانە ژیاون.

لەبەر ئەوەی خوێندەواریم نیە ئەم کارە بۆ من زۆر سەختو دژوار بوو، چەند جارێك هەوڵم داو وازم لێهێنا، بەڵام منداڵەکانم و خزم و کەس و کار و هاوسەنگەرانم هانیان ئەدامەوەو داوای ئەوەیان دەکرد هەتا خۆم لە ژیاندا ماوم و تەندروستیم تەواو خراپ نەبووە و ئەوانەی لە بیرم ماون تۆماریان بکەم، تا لە دەرفەتێکدا چاپ بکرێن، بەڵام گێرمە و کێشەی ژیان ڕێسەکەی لێ دەکردمەوە بە خووری. دواجار ڕۆژ بەڕۆژ تەمەن هەڵدەکشێتو پیری بەرەو لێواری مردنم دەبات، هەرچەندە هەموو مردنێك بە پیری نییە، بەڵام پیربوون نزیك بوونەوەیە لە مردن.

ئێستا تەمەنم کۆتا گەڵای هەشتا ساڵەمی بەدەم ڕەشەبای پایزەوە خەزان کردووە، وەك منداڵێکی تازە پێکردوو بەرەو هەشتا و یەك ساڵ هەنگاو دەنێم، مۆتەکەی مردن هەر مانگەی ئەندامێکی لەشم لەکار دەخات و ئیزرائیلی گیانکێشان هاوڕێی گیانی بە گیانیمە و ئامادەیە لە کات و ساتی خۆیدا پەلکێشی گۆڕم بکات، بۆیە بە هاوکاری دۆستانی خۆشەویست و منداڵەکانم و هاوڕێ و هاوسەنگەرە دێرینەکانم کۆتا بڕیارم داو دەستم دایە کۆکردنەوەی سەربووردەی ژیانی ڕابردووم، هەرچەندە زۆرێك لە ڕووداوەکان زیاتر لە نیو سەدەیان تێپەڕاندووە و بە باشی لە بیرم نەماون و زۆرێك لەو کەسانەش کە لە ڕووداوەکاندا هاوەڵم بوون لە ژیاندا نەماون یا نەخۆشن و لەسەر جێگەن، خۆیشم لەبەر ئەوەی خوێندەواریم نەبووە و لەکاتی خۆیدا نەمتوانیوە دیکۆمێنتیان بکەم، ئێستاش کۆکردنەوەو نووسینەوەیان هەروا

ئاسان نیەو دەزانم زۆر کۆسپ و ئاستەنگ دێتەڕێم، هەرچەندە باری تەندروستیشم باش نیەو لە مێژووی هەندێ لە ڕووداوەکان دڵنیا نیم، بەڵام ناوەڕۆکی ڕاستەقینەی ڕووداوەکان وەك خۆی تۆمار دەکەم‌و خۆیشم لە قەرەی ئەو ڕووداوانە نادەم کە ڕاستەخۆ پەیوەندی بە منەوە نەبووە، چونکە هەندێ ڕووداو هەیە کە لە ژیانی مندا ڕوویانداوە بەڵام لە ئاست لێپرسراوێتی سەرکردەکاندا بووە، بۆیە ئەوەندەی پەیوەندی بە ژیانی من‌و بیروبۆچوونی منەوە هەیە لەبارەیانەوە دەدوێم.

لایەنێکی دیکەی مەبەستی نووسینەوەی بیرەوەریەکانم ئەوەیە کە دەبینم ناوی پێشمەرگە گلەیی لێ دەکرێت‌و خەبات و ماندووبوونەکانیان نادیدە دەگیرێت، ئەم شۆڕشانە خەباتی زۆریان بۆ کراوەو لە پێناو سەرکەوتنیاندا خوێنێکی زۆر ڕژاوەو نابێت لەبەر چەند سیاسەتمەدار و لێپرساو و کاربەدەستی گەندەڵ ناوی پیرۆزی پێشمەرگە لەکەدار بکرێت، من خۆم چەندین خەباتگێڕم بینیوە ئامادەی هەموو فیداکاریەك بوون لە پێناو شۆڕەشەکەیانداو هەرگیز بیریان لەوە نەکردووەتەوە کە خەباتەکەیان بگۆڕنەوە بۆ پلە و پایە.

لە ژیانی پێشمەرگایەتیمدا بەشداری زۆر شەڕ و نەبەردیم کردووە و ناکرێ لێرەدا وردو درشتی تۆمار بکەم و خوێنەر زۆر سەرقاڵی خوێندنەوەی بکەم، تەنها ئەوەندە نەڵێم چەندین جار لە لێواری مەرگ گەڕاومەتەوە و نازانم خودای گەورە قەدەرەکەی بۆ کەی هەڵگرتووم و ئیزرائیل کەی و لە کوێدا ڕۆحم بەرەو دوا مەنزڵگەی ژیان بەڕێ دەکات و ئەم ژیانە پڕ لە هەوراز و نشێوە بەجێدێڵم.

زۆر داوای لێبوردن لەو کەسانە دەکەم کە ناوم نەهێناون و پێویست بوویێت ناویان بهێنرێت، چونکە بە مەبەست نیە تەنها بیرچوونە بەهۆی کاریگەری پیری، داوایشم لە هەموو دڵسۆزان ئەوەیە لە هەر هەڵە و کەم و کوڕیەك بمبەخشن، چونکە تەمەنم هەڵکشاوە و دەکرێ هەندێ شتم بە

وردەکـاری و ناوەکانــەوە بــە تــەواوی بیرنــەمابێت، ئەگــەر هەڵەیــەکیش لــە یادەوەرییەکاندا تۆمار کرابێت بە هیوام یا خۆم ئاگادار بکرێتەوە یا بە جۆرێك لە جۆرەکـان بـە دیکۆمێنتـەوە بـۆ خوێنـەری ڕاسـت بکاتـەوە، تـا چەواشـەکاری نەبێتـە هـۆی شـێواندنی مێژووی نەتەوەکـەمان و هـەر پێشـنیارێکیش هـەبێت ئاگادارمـان بکەنـەوە بـۆ ئـەوەی ئەگـەر جـارێکی دیکـە ئـەم یادەوەرییـە چـاپ کرایەوە پێشنیارەکان بەهەند وەربگرین.

# قۆناغی یەکەم

## بنەماڵەکەمان

نزیکەی سەدو چل ساڵێك لەمەوبەر فارس ناوێك سەربازی دەوڵەتی عوسمانی بوو، خەڵکی کارێزە بوو، لە جامرێز لە عەشیرەتی دەلۆ بووە. ئەرکی سەربازییەکەی لە ناوچەی وارماوا بووە، لەو کاتەدا ئۆردوی تورك بارەگای سەربازییان لەسەر چەمی سیروان لە نزیك دەربەندیخان بووە، کە ئێستا کەمپی خواری پێدەڵێن و شوێنێکی گەشتوگوزارییە. ئامینە ناوێك مارە دەکات و دەیکاتە هاوژینی خۆی، کە خەڵکی گوندی عازەبانە. پاش ماوەیەکی کەم لە دوای هاوسەرگیرییان دەستی یەك دەگرن و بەرەو گەرمیان بۆ زێدی فارس ملی ڕێدەگرن، نوایەك و ماڵێکی خنجیلانە پێکەوە دەنێن، بەڵام ئەم خۆشییە هەتا سەر نییە، چونکە لە دوای چەند ساڵێکی کەم و لە بەهاری ژیان و لە هەرەتی لاوێتییاندا نەمامی ژیانی فارس هەڵدەکێشرەت و کۆچی دوای دەکات.

پاش خۆی دوو کوڕ و کچێك بە ناوەکانی عەلی و عەزیز و زەهاو بەجێدەهێڵێت و هەتیوو دەکەون و چەپەری حەوشەکەیان ڕەشەبایەك دەیکردەوە. ناچار دایك دەستی منداڵەکان دەگرێت و بەیەك دوو هەوانە گەنمی قەندەهارییەوە بەرەو وارماوا کە زێدی خۆیەتی بەڕێدەکەون و لە گوندی (سیارە) بە یەکجاری نیشتەجێ دەبن و هەر لەوێ بە یەکجاری دەمێننەوە. ئامین بۆ جاری دووەم لەگەڵ ڕەحمان سمایل سیارەیی ژیانی

هاوسەری پێکدەهێنن و دوو کوڕ و کچێکیان دەبێت بە ناوەکانی مەحمود و ئەحمەد و ئاسکە. خزمایەتی ئەم بنەماڵەیە لەگەڵ خەڵکی گوندەکە دەچێتە قۆناغێکی نوێوە و سەرلەنوێ بناغەی ژیانێکی نوێ دادەرێژن. یەکێك لە کوڕەکان ناوی (عەلی)یە و باوکی منە، پاشان نەوەکانی فارس زۆر دەبن و بە گوندی سیارە و ناوچەکانی دەوروبەریدا بڵاودەبنەوە.

## وارماوا

حکومەتی پاشایەتی عێراق دامەزرا، ولایەتی موسڵ خرایە سەر دەوڵەتی عێراق. فەرمانڕەوای پاشایەتی کەوتە دروستکردنی ناوچە کارگێڕییەکان. بۆ ئەم مەبەستە ناحیەی وارماوای دروست کرد و مەرکەزی ناحیەکەی لە گوندی فەقێ جنە دانا. لە ساڵی (١٩٢٥) حسەین بەگی حەسەن بەگی جاف کرا بە بەڕێوەبەری ناحیەکە. ئەو کات سنوری ناحیەکە لە بانی خێلانەوە هەتا گوندی دێوانەو بە دیوی شارەزووردا هەتا گوندی تەوە قوت و ئالان و حاصل و ئاوی تانجەرۆ و هەتا گوندی قەرەگۆل و بە بناری ئاوەکەڵەدا هەتا ناوتاق سەر بە ناحیەی وارماوا بوون.

لە (١٨/١٢/ ١٩٥٢) مەرکەزی ناحیە چووە گوندی قلیجە. لەو کاتەدا گوندی قلیجە زۆر ئاوەدان بوو. بەگزادەکان دەستەڵات دار بوون، لەو کاتەدا ئەمین زەکی بەگی مێژوونووس لە بەغداد وەزیر بوو، کە لە بنەچەدا خدر بەگییە، کە لە بەگزادەکانی قلیجە و میرەدێییە. گوندی قلیجە لە شۆڕشی نوێدا چەندین شەهیدی سەرکردە و فەرماندەیان بەخشیوەتە کوردستان. لە (١٨/١٢/١٩٥٢) کاتێك مەرکەزی ناحیە چووە قلیجە، شێخ نوری شێخ ساڵحی شاعیر، باوکی خاڵە شەهاب کراوە بە بەڕێوەبەری ناحیە هەتا (٢/١/١٩٥٥)، بە دوای ئەودا عەبدولجەبار زەنگەنە بووەتە بەڕێوەبەری ناحیەکە. ساڵی

(١٩٥٨) پێش ئەوەی شۆڕشی عەبدولکەریم قاسم روویدات مەرکەزی ناحیە گواستراوەتەوە بۆ گوندی چناره و عەبدولجەبار زەنگەنە کراوەتەوە بە بەڕێوەبەری ناحیەکە. پاش چوار ساڵ لە دەوروبەری کۆتایی ساڵی (١٩٦١) لە دوای شەڕی تونێلەکە بەڕێوەبەرێتی ناحیەکە چووەتە دەربەندیخان و بە ناوی دەربەندیخانەوە ناونراوە[١].

لە ساڵی (٢٠٠٦) حکومەتی هەرێمی کوردستان ناوی ناحیەی زەڕایەنی ناونا ناحیەی وارماوا لە گوندی قەرەگۆلەوە هەتا گوندی میرەدێ سەر بەو ناحیەیە. بەڵام لە واقیعدا ئەو گوندانەی کە سەر بە وارماوان و بە وارماوایی دەناسرێن ئەم گوندانەن:-

گولانی حاجی فەرەج، وازۆڵ، ئەحمەد برندە، میرەدێ، چنارە، عازەبان، حەسەن کاری (حەسەنە گەورە)، سیارە، بیرکێ، قاشتی.

## لەدایکبوونم و گوندی سیارە

ناوم ساڵح عەلی فارس وەلی مستەفا دەلۆییە، دایکم ناوی جەمینە خەسرەوە ئەحمەدە، خەڵکی گوندی (سیارە)یە. لە ساڵی (١٩٣٨) لە گوندی سیارە لە دایکبووم، بەڵام لە ناسنامەکەمدا ساڵی (١٩٤١) نووسراوە و ڕاست نیە. لە نێو خەڵکدا بە دەروێش ساڵح یا مام دەروێش ناسراوم، مانگێك پێش لەدایکبوونم برا گەورەکەم کاکە محەمەد گوتوویەتی: ئەگەر دایکم کوڕی ببێت ناوی دەنێین ساڵح، لەو کاتەدا شێخ تەها فەرموویەتی با دەروێش بێت و ساڵح بێت. ئیتر کە لەدایکبووم دەروێش بوو بە نازناوم، ئەگەرچی لە

[١] دیوانی شێخ نوری شێخ ساڵح.

تەمەنی لاوێتیدا ماوەیەك دەروێشیم كردووە، لەبەر ئەوەی لەو سەردەمەدا قوتابخانە لە گوندەكەمان و لە ناوچەكەشدا نەبووە، منیش وەك منداڵانی ئاوایی و زۆربەی منداڵانی كوردستان بێبەش بووم لە خوێندن و بە نەخوێندەواری مامەوە، ژیان و بژێوی بۆ ئەو كات سەخت بوو، دەوڵەت هیچ هاوكارییەكی میللەتی نەدەكرد، ئەركی ژیان هەمووی لەسەر شانی خەڵكی خۆیان بوو. گوندی سیارە بەهۆی هەڵكەوتەی جوگرافی ناوچەكە بە زۆری شاخ و گرد و دارستان و چەم و دۆڵە و زەوی بۆ كێڵان و جوتیاری كردن كەم بوو، بەڵام لەوەڕگای زۆری هەبوو كە بۆ ئاژەڵداری ببووە بژێویەكی چاكی دانیشتوانەكەی. هەڵكەوتەی ناوچەكە زەوی بەرئاوی زۆر كەم بوو لە شاریشەوە زۆر دوور بوو، خەڵك بۆ پێداویستی ژیانیان دەچوون بۆ هەڵەبجە یان بۆ سلێمانی، هەندێ جاریش دەچوون بۆ خانەقین خورما و خوێیان دەهێنا. وەك باسم كرد ئێمە لەبەر ئەوەی درەنگتر هاتبووینە گوندەكە زەویمان زۆر نەبوو، ناچار بە نیوەكاریی زەوی خەڵكمان دەكێڵا یان شوانی و كاروباری مەڕوماڵاتمان دەكرد، لەبەر ئەوەی ماڵی شێخ تەها لە گوندی سیارە بوو تەكییە هەمیشە جمەی دەهات لە میوان و ئێمەش كەڵكمان لەو ئاوەدانییە وەردەگرت، چونكە باوكم دەروێش بوو، زۆربەی كات لەگەڵ شێخ بوو، ئەگەر ژیان بۆ منداڵانی دێ یەكجار سەخت بووبێت بۆ ئێمە چەندین جار سەختتر بوو، لەگەڵ دایكم دەچووین كوزەڵە و تۆڵەكەمان دەهێنا و دەمانبرد بۆ ماڵی شێخ، خەجیجەخانیش ئارد و كولێرەی دەداینێ.

لەو كاتەدا دوو ڕوداوی ناخۆش بەنیسبەت ئێمەوە ڕوویدا، یەكەمیان لەبەر ئەوەی لە ئێران گرانیی بوو بژێوی ئێمەش زۆر ناڕەحەت بووبوو، چونكە خەڵكێكی زۆر لە ئێرانەوە بە دیوی عێراقدا دەهاتن و بە دێهاتەكاندا دەگەڕان و بە نانەسكێ ئیشیان بۆ خەڵك دەكرد، لەبەر ئەوە ئێمە بە

نارەحەتتر کارمان دەستدەکەوت. دووەمیان بارکردنی ماڵی شێخ بوو بۆ سلەیمانی. ئەم دوو ڕووداوە کاریگەری ڕاستەوخۆیان لەسەر ژیانی ئێمە جێهێشت.

لە بیرمە لەگەڵ دایکمدا چووین لە شاخی پشتی دێیەکەمانەوە بارێ جەوتمان کرد و بردمان بۆ گوندی وازۆڵ، کە حەوت کیلۆمەتر لە گوندەکەمانەوە دووربوو، بردمان بۆ ماڵی مامە حەسەن (مامە سەن)، میمکە مەنیجی خێزانی تەنەکەیەك گەنمی داینێ، ئەوان لەخوار دێیەکەوە ئاشی گەنم هاڕینیان هەبوو، گوتی کە گەڕانەوە و با بۆتان بهاڕن و مزەشتان لێوەرنەگرن. جارێکی دیکەش لەگەڵ دایکمدا بووین، مەلا مەحموود کە مەلای گوندی سیارە بوو، پیاوێکی زۆر چاك بوو، بانگی کردین گوتی جەمینە هەتا کەس دیارنییە لەو کەنووە قوڕە مەنێ ئارد بەرە، دایکم کۆشی نا بە گوڵپی کەنووەکەوە و کۆشێ ئاردی هێنا کە بۆ ئەو کاتە دیارییەکی گەورە بوو. دوای ڕۆشتنی ئێمە خوشکەکەی هاتبوو گوتبووی ئەوە چیە ئارد ڕژاوە؟ مەلا مەحموود گوتبووی هیچ نییە، خۆم دەسکاریی کەنووە ئاردەکەم کردووە.



گوندی سیارە (٢٠٢٠)

## گوندی سێ دارە یان سیارە

سێ دارە دوازدە کیلۆمەتر لە باکوری ڕۆژهەڵاتی دەربەندیخاندایە، پەنجاو پێنج کیلۆمەتر لە باشوری ڕۆژهەڵاتی سلەیمانییەوە دوورە. (٦٢٧)م لە ئاستی ڕووی دەریاوە بەرزە. سەر بە کەرتی کشتوکاڵی ژمارە (٣٣)یە.

ڕووبەری گشتی گوندەکە (١٤٤٥٠٤٦٠)م٢یە، واتە؛ (٥٧٨٠) دۆنم. (٤) نولك دەکاتە (٦)م٢. ڕووبەری ئەو زەوییانەی بۆ کێڵان دەبن (٧٣٢٩٩٠٠)م٢ واتە؛ (٢٩٣٢) دۆنمە. ڕووبەری ئەو زەویانەی ناکێڵرێن (صخریە) بریتییە لە (٧١٢٠٥٦٠)م٢، واتە؛ (٢٨٤٨) دۆنم و (٦)م٢.[1]

هەڵکەوتەی گوندەکە لە باکورەوە گوندی چنارەیە، ژمارە کەرتی (٢١). لە باکوری ڕۆژئاواوە حەسەنکاری ژمارە کەرتی (٢٤)ە. لە ڕۆژهەڵاتەوە گوندی عازەبانە، ژمارە کەرتی (٣٤)ە. لە باشوری ڕۆژئاواوە گوندی ناوتاقە، ژمارە کەرتی (٣٥)ە. لە باشورەوە گوندی بیرکێیە ژمارە کەرتی (٢٦)ە. دەریاچەی دەربەندیخان دەکەوێتە باشوری ڕۆژهەڵاتیەوە[2]، گوندەکە لەبەردەم شاخێکدایە بە (بەرانان) ناسراوە، کە شەقامی سەرەکی دەربەندیخان- سلەیمانی شاخەکە و دێیەکە لەیەکتری جیادەکاتەوە، دێیەکە بە دووری حەوت سەد مەتر کەوتووەتە بەردەمی شەقامەکە.

ناوی گوندەکە لە سێ داری گەورەوە هاتووە، کە لەنزیك یەکدابوون و پێیان گوتووە سێ دارە، پاشتر لەنێو خەڵکدا بووە بە (سیارە)، دیارە بۆ گوتن ئاسانتر بووە. زۆر شار و گوندی کوردستان ژمارەیان پێوە لکاوە وەك دوودارە،

---

[1] نووسینگەی لاند بۆ ڕووپێوی لە دەربەندیخان (Google Earth Program).

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

دووکان، سێ تووان، سێ تەڵان، چوار داران، چوار قوڕنە، دوازدە ئیمام ، هەزار کانی... هتد.

هەر لە زەمانی عوسمانییەوە هەندێك گوند تاپۆی دانیشتوانەکەی بوون، لە ناوچەکەی ئێمەدا وەك سیارە و عازەبان و چنارە. یەکێك لەو گوندانە کە تاپۆی عوسمانی هەبووە سیارە بووە. دایکم (جەمینە) بۆی دەگێڕاینەوە کە بەگزادە هاتوون بەزۆر سەنەدەکانیان لە جووتیارەکان وەرگرتووە و گۆڕیویانەتە سەر ناوی خۆیان، چونکە لەو کاتانەدا بەگزادەکان دەسەڵاتدار بوون، ڕەحمان سمایل یەکێك بووە لە جوتیاری گوندەکە سەنەدی زەوییەکەی لەنێو کرۆکی قامیشی بنمیچی خانووەکەیدا، لەژێر دەسەك و نیرگەدا شاردووەتەوە و پێینەداون. زۆربەی هەرە زۆری گوندەکان هی خاوەن موڵك و بەگزادەکان بوون و جووتیار موڵکانەی داوەو موڵکانەکانیان بردووە بۆ بەگزادەکانی هەڵەبجە و دەوروبەری.

شێخ تەها بە مەبەستی کردنەوەی مەدرەسەیەکی ئایینی، مەلا حسەین ناوێکی لە تورکیا هێناوە "پاشتر بە وردی باسی هێنانەکەی دەکەم"، بۆ ئەوەی وانەی ئایینی بە فەقێکان بڵێتەوە، مەلا حسەین پیاوێکی خوێندەوار و وریا بووە کە دەزانێ خەڵکی گوندەکە تاپۆی ڕەشی عوسمانییان هەیە ڕێگەچارەیان بۆ دادەنێت کە بتوانن موڵکەکانیان بۆ وەربگرێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ مەلا مەحموود دەچن بۆ تورکیا. حەمەئەمین ڕەحمان یاوەری سەفەرەکەیان دەبێت و دەڵێت ئەوەندە تێشووی خواردن لەگەڵ خۆمان دەبەین، هەتا تاپۆی ڕەش لەگەڵ خۆمان نەهێنینەوە نایەینەوە.

کە دەگەنە ئەوێ کاربەدەستان دەڵێن مادەم هیچ بەڵگە و نوسراوێکتان پێ نیە ناتوانین هیچتان بۆ بکەین، ئەگەر بەڵگەتان هەیە بیهێنن. مەلا مەحموود و حەمە ئەمین ڕەحمان دەگەڕێنەوە بۆ گوندی سیارە. ڕەحمانی

سمایل دەڵێ من سەنەدم هەیە و پێیان دەدات و ئەوانیش دەیبەنەوە بۆ تورکیا. لەوێ بەو سەنەدەی ڕەحمانی سمایل هەموو موڵکەکانی تر دەدۆزنەوە و بەناوی سیارە و خاوەنە ڕاستەقینەکانیانەوە نووسراویان بۆ دەکەن و دەیانێرن بۆ بەغداد، کاتێك تەسویە دەردەچێت بۆ دێهاتەکان موڵکەکان بەناوی خاوەنەکانیانەوە کە خەڵکی گوندەکەن، تاپۆ دەکرێت.

بە بیرەوەری من لە ناو گوندی سیارەدا (١٣) بەرەباب لە دێرزەمانەوە وەك برا پێکەوە دەژین.

١ – بەرەبابی عەلی فارس وەلی مستەفا دەلۆیی.

٢ – بەرەبابی شێخ تەهای شێخ مەحمود.

٣ – بەرەبابی سمایل رمەزان سید ئەحمد.

٤ – بەرەبابی ئەمین خەسرەو ئەحمەد رەحیم.

٥ – بەرەبابی قادر مستەفا سلێمان ناوخاسی هەیەر.

٦ – بەرەبابی ڕەزا کاکە سور بایزخدر.

٧ – بەرەبابی وەسمان فەقی سەلیمی مەلا کەریم.

٨ – بەرەبابی محەمەد ئەحمەد کەریم.

٩ – بەرەبابی ئەحمەد عەبدوڵڵا محەمەد.

١٠ – بەرەبابی ڕەشید حسین.

١١ – بەرەبابی ئەحمەد خدر علی.

١٢ – بەرەبابی ڕەحمان حمەئەلیاس.

١٣ – بەریابی محەمەد داود.



نەخشەی زەوی و زاری گوندی سیارە




جێگەی گوندی سیارە لە نەخشەی پارێزگای سلێمانی

## شێخ تەهای شێخ مەحموود

شێخ تەها کوڕی شێخ مەحموود کوڕی شێخ حەمە ساڵح کوڕی شێخ قادری قازان قایەیە. ساڵی (١٨٩٨)ز لە دایکبووە، دایکیشی سەعدەخان لە شێخەکانی تەڕاتەوەنە، کە لە بنەچەدا ئەچنەوە سەر ساداتی بەرزنجە.

شێخ تەها و براکانی دژی سووپای ئینگلیز هاوکاریی سوپای شێخ مەحموودی مەلیك دەکەن. لەو شەڕانەدا برایەکی بەناوی شێخ باهیر و مامێکی بەناوی شێخ سەعید لە بانی مەقانی چەمچەماڵ شەهید دەبن.

بنەماڵەی شێخ تەها ئاوارەی کوردستانی ئێران دەبن و ساڵی (١٩٢٢) دەگەڕێنەوە بۆ عێراق و لە گوندی بانیخێڵان نیشتەجێ دەبن. لەگەڵ خەڵکی سیارەدا پەیوەندییەکی بەتینیان دەبێت. لەو کاتەدا وڵات و ناوچەکە تا ڕادەیەك پاشاگەردانی بووە و چونکە حکومەتی عێراق تازە درووستبووە و هێشتا سەقامگیر نەبووە.خەڵکی سیارە داوا لە شێخ مەحموود دەکەن کە باوکی شێخ تەهایە، ماڵەکەی بهێنێتە گوندی سیارە. شێخ مەحموودیش ڕازی دەبێت و شێخ تەهای کوڕی دەنێرێت، کە تازە لەگەڵ خەدیجەخانی سەعید بەگ هاوسەرگیری کردبوو، کە خەڵکی سلێمانی بووە. شێخ تەها لە ساڵی (١٩٢٤)ز بە ماڵەوە دێتە گوندی سیارە و بناغەی مزگەوت و تەکیە دادەنێت و خەڵکێکی زۆر لە عێراق و ئێرانەوە ڕووی تێدەکەن.

شێخ تەها ماوەی بیست ساڵ لە گوندی سیارەدا ماوەتەوە و زەوی و زارێکی زۆری هەبووە بۆ کێڵان و دەسەڵاتدار بووە و لەلایەن حکومەتی پاشایەتیەوە ڕێزلێگیراو بووە. لەگەڵ بەگزادە و سەرۆك عەشیرەتەکاندا پەیوەندییەکی بەتینی هەبووە، بەڵام هەرگیز ئامادە نەبووە و هەوڵیشی نەداوە یەك بست زەوی گوندەکە بەناوی خۆیەوە تاپۆ بکات.

شێخ تەها ساڵی (١٩٤٤) باردەکات بۆ سلێمانی، بەڵام پەیوەندی لەگەڵ خەڵکی گوندی سیارەدا هەر دەمێنێتەوە و لەنێو خەڵکدا بە شێخ تەهای سیارە ناسراوە. لەگەڵ خەڵکی گوندەکەدا ژن و ژنخوازی و خزمایەتی درووستبووە، ئێستەش ئەو پەیوەندییە هەر ماوە. شێخ تەها لە (١٩٧١/٧/٢٧) لە تەمەنی (٧٣) ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات و لەسەر وەسیەتی خۆی تەرمەکەی لە گۆڕستانی شێخ سادق لە گوندی سیارە بە خاك دەسپێردرێت[١].



حاکم شێخ لەتیف شێخ تەها، بەهیە کاکەبرا، شێخ قادر شێخ تەها، دەروێش ساڵح
گوندی سیارە - ٢٠٠٢

---

[١] سەرچاوەکەی (هۆشیار شێخ قادر شێخ تەها)یە.

## ڕەشبگیر

وەك لە شوێنێکی دیکەدا باسم کردووە، عوسمانییەکان چەند سەدەیەك فەرمانڕەوایی ئەم ناوچەی ئێمەیان کردووە. جار بە جاریش عوسمانییەکان لە بەرامبەر سوپای سەفەویەکان تێکشکاون. میرنشینەکانی کورد کەوتوونەتە بەر شاڵاوی داگیرکاری فارسەکان، توورکەکان بەناوی ئاین و مەزهەبەوە ختووکەی خەڵکی سوننەیان داوە و دژی فارسەکان جەنگاون. لەبەر ئەوەی کورد زۆربەی هەرە زۆری سوننە بوون، بەرگرییان لە عوسمانیەکان کردووە و بە هەزارەها لاوی کورد لەسەر سنوورە دوورەکان جەنگاون و خوێنیان ڕژاوە و هەندێکیشان بێسەروشوێن بوون.

کاتێك دەوڵەتی عوسمانی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا خۆری دەسەڵاتی بەرەو ئاوابوون دەچوو، سوپاکەیشی ڕۆژ بە ڕۆژ توانا سەربازییەکانی لەدەست دەدا، ناچار بەناوی جیهاد و بەرگری لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام پەنای بۆ سیاسەتی ڕەشبگیری برد و لاوەکانی کوردیش لەو شاڵاوە بێبەری نەبوون و زۆرێك لە لاوەکانی کوردی ڕاپێچی بەرەکانی شەڕ کرد لە باشوری عێراق دژی سوپای ئینگلیز.

سەرەتای جەنگی جیهانی یەکەمیش لەنێو خاکی ئێران، کە سوپای عوسمانی دژی سوپای ڕووس جەنگا. بە هەمان شێوە لاوەکانی کوردی لەژێر هەمان سیاسەتدا بەکارهێناو چەندین لاوی کورد بوونە قوربانی سیاسەتی دەوڵتی عوسمانی سەرەڕای کوژراو و بریندار خەڵکانێکی زۆریش بەدیل گیران و ڕەوانەی شارەکانی ڕووسیا کران. زۆرێك لەو کوردانە لە دوای تەواوبوونی جەنگیش نەهاتنەوە زێدی خۆیان، بەڵام هەندێکیان لەپاش چەندین ساڵ دوای جەنگەکە گەڕانەوە.

لە گوندی سیارە دوو پیاو بە ناوەکانی (محەمەد کاکە مەند و ڕەحمان وەسمان) و لە گوندی عازەبانیش یەك پیاو بە ناوی (شێخ حەسەن شێخ

عەلی) بەر ئەو ڕەشبگیرییە کەوتبوون. لە پاش چەندین ساڵ و لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا پیاوێك هاتەوە و واخۆی ناساند، کە شێخ حەسەن شێخ عەلی عازەبانە، هاتە گوندی سیارەش پرسیاری دوو پیاوەکەی سیارەمان لێکرد، دەیگوت ماون و حەمەی کاکە مەند ماڵ و منداڵی هەیە و لە سنووری ئێران و ڕووسیایە.

شێخ حەسەن لەگەڵ عەزیز نادردا لە گوندی عازەبان بە شوێن ئاسەواری کۆندا دەگەڕان، چەند شوێنێکیان هەڵکۆڵی و ڕاستییەکەی هیچ هەواڵێکم لا نیە ئەگەر شتێکیان دەستکەوتبێت. شێخ حەسەن پاش ماوەیەك مانەوەی لە عازەبان دووبارە ڕۆیشت و نەگەڕایەوە.

### حوجرە

لە کاتێکدا شێخ تەها ماڵی لە سیارە بوو تەکیەکەی هەمیشە گەرم و گوڕ بوو. لە تەکییەکەیدا چەندین فەقێی هەبوو، بۆ ئەوەی فەقێکانی لەڕووی ئایینیەوە زیاتر شارەزایی پەیدا بکەن وەك پێشتر باسم کردووە، مەلا حسەین ناوێك کە خەڵکی کوردستانی تورکیایە دەیهێنێت بۆ سیارە و حوجرەیەکی بۆ تەرخان دەکات، کە وانە بە فەقێکان بڵێتەوە. پاش ماوەیەك خوازبێنی نەجمە حامید عبدوڵلای بۆ دەکات و دەبێتە هاوژینی و ماڵێکی باشی بۆ پێکەوە دەنێ، بەم جۆرە کۆمەڵێك لە خەڵکی گوندەکە دەچنە حوجرەکە و دەست دەکەن بە خوێندنی وانە ئاینییەکان، لەوانەی کە لەو حوجرەیەدا دەیانخوێند (مەحموود میران سمایل، عەبدولقادر حامید عبدوڵڵا، کاکەبرا محەمەد، ئەحمەد ڕۆستەم، کەریم پیروەیس).

لە پاش یەك دوو ساڵ لە فێرکردن و خوێندنی وانە ئاینییەکان بە خەڵکی سیارە، شێخ دەچێت بۆ ئێران و مەلا حسەینیش یاوەری ئەو سەفەرەی دەبێت،

بەڵام مەلا حسەین قەدەری وا دەبێت لەوێ کۆچی دوای دەکات و حوجرەکەی سیارە بێ مامۆستا دەبێت و بەیەکجاری دەرگاکەی کلۆم دەدرێت. یەك لەو فەقێیانــە بــەناوی مــەحمودی مــیران واز لــە خوێنــدن ناهێنێــت و هــەتا کەرکوکیش بەشوێن زانیاریدا دەڕوات و پاش ئەوەی شارەزاییەکی باش پەیدا دەکات، دەگەڕێتەوە گوندەکەی خۆی و بە مەلا مەحموود دەناسرێت. چەندین ساڵ مـەلای گوندەکـە دەبێـت. بـەڵام بـۆی ڕێناکـەوێت هـەر دوازدە عیلمەکـە تـەواو بکـات. شایەنی باسە ئێستا نـەوەکانی مـەلا حسـێن لـە دەربەنـدیخان و دەوروبەری ژیان بەسەر دەبەن.

### شۆڕشی شێخ مەحموودی حەفید

لـە کۆتـایی شۆڕشـەکەی شـێخ مـەحموودی نـەمر دژی سـوپای ئینگلیـز، خەڵکانێك لە گوندی سیارە بەشداری شۆڕشەکە دەکەن، صۆفی ئامین خێزانی حەمەی سەید کە خەڵکی گوندی عازەبانە و ژنێکی بە تەمەنە بۆی گێڕامەوە، گـوتی "عـەزیزخانی بـرایم خـانی دەلـۆ بارەگـای لەشـکرەکەی لـە عازەبـان بـوو، لەگەڵ لەشکری خەلیفە یونس لە گونـدی چنارە لەشکرەکەیان یەکدەخەن و بـۆ هاوکـاریکردنی شـێخ مـەحموودی مـەلیك دژی سـوپای ئینگلیـز زەوار[١] یـان بەرەو ئاوباریك بەڕێ دەخەن. چەند کەسێکی خەڵکی گونـدی سیارەش لەگەڵ شێخ سادقی برای شێخ تەها لەو شۆڕشەدا بەشدار دەبن لەوانە:

محەمەد میران سمایل، فەرەج پیروەیس محەمەد، ڕەسوڵ قادر موستەفا

بە فەرمانـدەیی عزیـز خانی دەلۆ بەشداری شـەڕی ئاوباریك دژی سـوپای ئینگلیـز دەکـەن و ڕۆڵێکی کارایـان لـە شـەڕەکەدا دەبێت و ئـەو شـەڕەش دواین شەڕی بەرەیی (جەبهە)ی شێخ مەحموودی نەمر بووە.

---

[١] زەوار. واتە کاروانی سەربازی.

## سەفەرێکی سەرنەکەوتوو

ساڵی (١٩٤٧) بوو باری داراییمان زۆر خراپ بوو خێزانێکی قەرەباڵغ بووین، چوار پێنج مەڕ و مانگایەکمان هەبوو (٣) دیناری ئەو سەردەمە قەرزار بووین. لە گوندیش ئیش و کار نەبوو. برایەکم و خوشکێکم نەبێت هەموومان منداڵ بووین و نەماندەتوانی وەرزێری و جوتیاری بکەین.

سەرەتای بەهار بوو پیاوێك ناوەکەیم لە یاد نەماوە هاتە بنکڵێشەی باوکم و گوتی بۆ ناچی بۆ شارەزوور لەوێ ئیش و کار زۆرە و زەوییەك بە نیوەیی بگرە و بیکە بە تووتن یان بیکە بە لۆکە، کاری تووتن یا لۆکە زۆر قورس نیە و منداڵەکان دەتوانن بیکەن. باوکم و دایکم شرو شیتاڵیان پێچایەوە و مەڕەکانیشمان لەگەڵ خۆمان برد بۆ ئەوەی لەوێ بۆ ژیانی رۆژانەمان کەرەو دۆیەکەی بەکار بهێنین، بەڵام لەبەر ئەوەی مانگاکەمان نەزابوو لای ماڵێکی خزممان جێمانهێڵا و بەرەو شارەزوور بەرێکەوتین.

لە گوندی کەلۆران ناونیشانی پیاوێکمان وەرگرتبوو ناوی میرزا تۆفیق بوو، سەرکاری بەگزادە جافەکانی هەڵەبجە بوو، زۆر دەوڵەمەند و دەست رۆیشتوو بوو. لە گوندی کەلۆران ئۆقرەمان گرت و زەوییەکمان بۆ دیاری کرا. خاوەن زەوییەکە هەندێ مەسرەفی کەمی دەکرد و لەوە بەولاوە هەقی هیچی نەبوو، کاتێك بەرهەمەکە دەفرۆشرا نیوەی دەبرد، پاش ماوەیکی کەم لە ئیش کردن باوکم تووشی لەرز و تا بوو و لە جێگەدا کەوت و تەواو بڕستی لێ برا. ئێمەش شەش برا و یەك خوشك بووین لەگەڵ دایکم، کەسمان ئەوەندە گەورە و کارامە نەبوو تا بتوانین ئیشەکانی باوکم بەرێوە ببەین، بەدیار لاشەی بێهێزی باوکمانەوە قانۆڵەمان دا، بەرە بەرە هەر چوار پێنج مەڕەکەمان فرۆشت و دامان بە مەسرەفی رۆژانە، پیاوێکی شاتری هەبوو

ناوی حەمەی فرج بوو،ماڵیان لە گوندی تەپەڕەش بوو نزیك گوندی کەڵوڕان، دایکی حەمەفەرەج پورزای باوکم بوو زۆر پیاوێکی چاك بوو، لەگەڵ دایکما زوو زوو سەردانمان دەکردن و دایکم نانی بۆ دەکردن و لە ئیشی ڕۆژانەدا هاوکاری دەکردن، کاتێك کە دەگەڕاینەوە کۆڵەکەیان بۆ پڕ دەکردین لە نان و ئارد و ڕۆن، بە ڕاستی هاوکارییەکی زۆری کردین هەتا بارمان کرد دەستی پێمانەوە بوو.

لە ساڵی (١٩٧١) کە خێزانم پێکەوە نا کاکە حەمەی فەرەج هاوکاری کردم، کاتێکیش لە ساڵی (١٩٩١) بارەگای تیپەکەمان کە من فەرماندەی بووم لە سەیدصادق بوو هاتووچۆی دەکردین و بە خواردن یارمەتی بارەگاکەمانی دەدا. باخێکی هەبوو زۆربەی دارەکانی وشك بووبوو بۆ کاری ڕۆژانەمان بەکارمان دەهێنا. بەڕاستی پیاوێکی چاك بوو.

میرزا تۆفیق لە کەڵوڕان بە خشتی قوڕ خانوویەکی دووقاتی دروست دەکرد، فاتمی خوشکم و حەسەنی برام چەند ڕۆژێك ئیشیان تێدا کرد، ڕۆژی بە (٥٠ فلس)، لەبەر ئەوەی کارەکە زۆر نارەحەت بوو پێویستیان بە کرێکاری بەهێز هەبوو خوشك و براکەمیان جواب کرد.

سەرەتای پایز بوو تا رادەیەك تەندروستی باوکم باش بوو و لە مردن ڕزگاری بوو، ناچار بە دەستی خاڵی و هەوانەی بەتاڵەوە گەڕاینەوە، لەڕێگا لە گوندی حاسڵ لای ماڵی ئەحمەد ئاغای گەلالی لاماندا، کاتی درەوی مەرەزە بوو و وەرزێر ئیشیان دەکرد، دایکم و فاتمی خوشکم کێشەیان دەکرد بۆ فایق ئاغا هەر یەکەیان ڕۆژی بە مەنێ چەڵتووك، ئێمەش لە دوای ئەوانەوە گوڵە چنەو و ڕنەی چەڵتوکمان دەکرد.

ڕۆژێك پیاوێك بە ئەسپێکەوە ڕاوی ناین نەیهێڵا گوڵەچنە و ڕنە بکەین. عێزەتی برام منداڵ بوو کەوتە ژێر سمی ئەسپەکە و زۆر گریا، دیاربوو زۆر

ئازاری پێگەیشتبوو. فایق ئاغا ڕاستی کردەوە و ماچی کرد و دوو باوەش مەرەزەی داینێ، کە ڕنەمان کرد یەك تەنەکە چەڵتوکی لێدەرچوو، لە کۆتایدا پێنج تەنەکە چەڵتوکمان پەیدا کرد و گەڕاینەوە سەر هەواری خاڵی لە گوندی سیارە، خاڵی لە هەموو خواردنێك لە هەموو بەرگێك. ئەو پیاوەی کە (٣) دینار قەرزاری بووین زانی هاتوینەتەوە هاتە سەرمان بۆ پارەکەی. باوکم بە نەخۆشی و بە لارە ملییەوە گوتی پارەمان نیە و لێمان بووەستە. خاوەن قەرز لە باتی (٣) دینارەکەی مانگاکەی برد، هەرچەند باوکم و دایکم و ئێمەی منداڵ هاوارمان کرد دادی نەبوو، هەرچەند باوکم گوتی هیچمان نیە ئەو مانگایە نەبێت بۆ ئەوەی منداڵەکان دۆکەی بخۆنەوە، هەرچیمان کرد مانگای هەر برد. ناچار بە شوانی بەرخ چووم بۆ ماڵی عەلی بەگ لە گوندی میرەدێ. لەپاش ماوەیەك لالە میرانم هات بە شوێنمدا بۆ میرەدی و بردمیەوە بۆ گوندەکەی خۆمان و کردمی بە شوانی ئاوایی مانگی بە نیو دینار.



محەمەد فەرەج تەپەڕەشی

## یەکەم جار سواری ئۆتۆمبێل بووم

بە تەواوی ساڵەکەم لە یاد نیە، پێم وایە لە سەرەتای پەنجاکان بوو. لە ئەحمەد برندەوە بۆ سیارە دەڕۆشتمەوە. لە بەردەم گوندی چنارەدا سێ ئۆتۆمبێلی جێب وەستابوو، یەکێکیان کورت بوو وەك جێب قیادەی (واز)ی سەربازی وابوو. پرسیاری گوندی سیارەیان لێکردم، وەڵامم دایەوە کە من خەڵکی ئەو گوندەم. گوتیان لەگەڵمانا سواربە. ئەوە بۆ یەکەم جارم کە سواری ئۆتۆمبێل بووم. لەگەڵیان ڕۆشتم هەتا گوندی سیارە. سەرنشینەکانی ناو ئوتومبێلەکە ئەندازیار بوون و کورد بوون. جێبەکان تایەکانی جەبەلی بوون و بە بەرزی و لێژیدا دەڕۆیشتن. ئەندازیارەکانیش لەشولاریان لە وەرزشەوان دەچوو، چونکە هەندێ جووڵەی وەرزشییان دەکرد لامان سەرسوڕهێن بوو. لە نێو گوند دوو جێبە گەورەکەیان بەجێهێلا و بە جێبە بچووکەکە بە لێواری سیرواندا ڕۆیشتن. ئەو کات بەنداوی دەربەندیخان دروست نەکرابوو ئەو ڕێگایە زۆر قەرەباڵخ بوو. لە شوێنی بەنداوەکەی ئێستادا بە بەری ڕوژئاوایەوە حاجی شێخ تۆفیق باوکی مامۆستا جەلال دوکانێکی هەبوو، چاخانەیەکیش هەبوو زۆر شتی تێدابوو. جێبەکە هەتا چایخانەکە ڕۆیشت. قادر فەرەج کە خەڵکی گوندی سیارە بوو لەگەڵیانا چاوساغی دەکردن و گەر لە ڕێگەکەشدا بەردێ هەبووایە ڕێی ئۆتۆمبێلەکەی بگرتایە سیمیان لێ دەبەست، جێبەکە ئەوەندە بەهێز بوو بەردەکەی لا دەبرد. پاشتر زانیمان کە بۆ کەشفی جێگەی بەنداوەکە و ڕێگاکەی هاتبوون. لە دوایدا دینارێك کرێیان دا بە قادر فەرەج کە بۆ ئەو کاتە پارەیەکی زۆر بوو.

## ژیان لە سەردەمی پاشایەتیدا

بژێوی ژیان لە سەردەمی پاشایەتیدا زۆر ناڕەحەت بوو، ژیانی مەمرە و مەژیمان بەڕێ دەکرد، حکومەتی پاشایەتی لە بارەی ژیانی خەڵکیەوە دەستەوەستان و تەماشاکەر بوو، کەس موچەی نەبوو، ئەو کەسانەی لە ناوچەی وارماوا موچەخۆر بوون، لە پەنجەی دەستێك تێپەڕی نەدەکرد، ئەوانەیشی موچەیان هەبوو لە بواری پۆلیسیدا بوون.

لە گوندی سیارە کەس موچەی نەبوو، بژێوی ژیان بە زۆری هەر لەناو گوندەکەدا بەرهەم دەهێنرا، ئەو کەسانەی کە زەوییان نەبوو یان زەوییان کەم بوو و بەشی نەدەکردن، ناچار شوانی و جوتیاری و وەرزێرییان دەکرد. بۆ بەرچاوڕوونی خوێنەر حەزدەکەم لێرەدا باسێکی یاسای جوتیاری و وەرزێری بکەم، یاخود باسی نان پەیداکردنی ئەو سەردەمە بکەم، کە خۆمی تیایدا ژیاوم، هەروەها باسی ئەو کەرەستە سادانە و چۆنیەتی کاروباری جوتیاری ئەو سەردەمە بکەم، کە لەو کاتەدا هۆی دەستخستنی نان پەیداکردن بوون.

## جوتیاریی

ئەو کەسانەی کارامە و بە توانابوون بۆ کاری جوتیاری دەگەڕان و لەگەڵ خاوەن ماڵ ڕێکدەکەوتن بە مانگانەیەك کە لە چارەکە دینارێکەوە هەتا دینارێك کرێی مانگانە بەپێی کارامەیی جوتیارەکە و زەمەنەکە دەگۆڕا، گرێبەستی جوتیار و خاوەن ماڵ بۆ ماوەی شەش مانگ بوو، زۆربەی جوتیارەکان سەڵت بوون، واتە؛ خێزانیان نەبوو. ئەگەر جوتکردن هەبوایە جووتیان دەکرد، هەر ڕۆژەی جووتکردن نەبوایە دەچوون بۆ دارهێنان یان

بانیـان دەگـێڕا و بـە کورتییەکـەی هاوکـاری خاوەنمـاڵ بـوون لـە زۆربـەی ئیشـەکاندا، تێچـووی خـواردن و خـەو و جوتێـك پـێڵاو و شـەرواڵێك لەسـەر خاوەن ماڵ بوو. جوتیارێکی زۆریش لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتەوە دەهاتن.

ساڵی واهەبوو باران کەم بوو، لە زۆر شوێن دەغڵ و دان دەفەوتا یان ئافات لێی دەدا، دەبوو بە گرانی و جوتیار تەنیا بە نانەسکی کاری دەکرد، ئەو جوتیارەی لە کاردا ئازابوو، یاخود پێشینەیەکی جوتیاری لەگەڵ خاوەن ماڵدا هەبوو، زووتر کاری دەستدەکەوت. پەندێك هەیە دەڵێت، جوتیاری ئەم ساڵ بۆ ساڵێکی دیکە دەگیرێت.

## وەرزێری

وشـەی وەرزێـری لـە وەرز "فەسڵ"ەوە هـاتووە، کـە کەسـەکە بـۆ وەرزێـك دەگـیرا، خـاوەن گـەنم یـان جـۆ کاتێـك دەغڵەکـەی فـەریك دەبـوو، بەهـەمان شێوەی جوتیـاری لەگـەڵ وەرزێرێـك ڕێکـەوتنێکیان دەکـرد، وەرزێـر بـە زۆری خێزانـدار بـوون و لـە مـاڵی خۆیـان خواردنیـان دەخـوارد و دەخـەوتن. کـابرای وەرزێر تەماشای دەغڵەکەی دەکرد، ئەگەر گوڵی باش بوایە و بڕشتی هەبوایە و نزیك ئاوەدانی بوایە، خاوەن گەنم هەڵسوکەوتی لەگەڵدا باش بوایە زووتر لەگەڵیدا ڕێکدەکەوت. ڕێکەوتنەکەش بەم شێوەیە بوو.

وەرزێر پێش ئـەوەی دەست بکـات بـە دروێنـە، داوای هۆقەیە ڕۆنی دەکـرد بۆ خێزانەکەی، شەڕواڵێك و جوتێك کڵاشی جاشکەوشی بۆخۆی لە خاوەن گەنمەکە وەردەگرت. وەرزێر گەنمەکەی دەدوریەوە و خێزانەکەی مەلۆی بۆ دەنایەوە و دەیکێشا، خەرمانی دەکوتا و شەن دەکرا و پاك دەکرایەوە، وەرزێـر لـە حـەوت تەنەکـە گـەنم یـەك تەنەکـەی دەبـرد، واتـە؛ یـەك لەسـەر حـەوتی

خەرمان هی وەرزێر بوو، خاوەن خەرمان لە ماوەی ئیشکردنی وەرزێردا، دەبوو لانی کەم دووجار خورما و ڕۆنی بۆ بکردایە، کاتێکیش خەرمان سوور دەبوو خاوەن خەرمان سەربڕانەی بۆ دەکرد و کەڵەشێرێك یان گیسکێکی سەردەبڕی و بە لێنراوی دەیبردە سەر خەرمان.

## قۆناغەکانی نان پەیداکردن

حەزدەکەم وەك بیرەوەرییەك باسی یادەوەرییەکانی ئەو دەمانەی میرمنداڵ بووم بکەم، کە چەند بژێوی ناڕەحەت و زەحمەت بوو، ئێمەو خەڵکانی هاوشێوەی ئێمە چۆن بژێوی ژیانمان پەیدا کردووەو ئەو کەرەستانەی لەو زەمەنە و لەو ڕۆژگارەدا بەکارهاتوون چیبوون و چۆن بەکارهێنراون.

### ١ – دەسپێکی کار

کێڵانی زەوی بەدوو گا یان بەدوو گوێدرێژ یان بە گایەك و گوێدرێژێك یان بە دوو هێستر دەکرا، لای ئێمە هێستر کەم بوو، بەزۆری بە گا زەوی دەکێڵدرا، جوتیارێك دەیگوت جوتێك گام هەیە، جوتیارێکی دیکە دەیگوت لنگێ گام هەیە، واتە؛ یەك گا. پێدەچێت جوتکردنیش لەو جووتە گایەوە هاتبێت. ڕەشەوڵاخی نێرە کە تەمەنی دەگەیشتە سێ ساڵ پێیان دەگوت نەوەن کە لەگەڵ گایەکی دیکەدا هاومل دەکران و فێری جووتکردن دەکران، گای جوتکردن دەخەسێنرا لەبەرئەوەی زیاتر هێمن بێت و بەهێزتر بێت لە کاتی جوتکردندا. گای جوتکردن بە جیا لە وڵاغەکانی دیکە خزمەت دەکرا، گلێنەی بۆ دەکرایە ئاو و دەخوسا، لەگەڵ کا تێکەڵدەکرا و پێی دەدرا، گلێنە نالیکێکی چاك بوو بۆ بەهێزکردنی وڵاخ.

**کەرەستەکانی جووتکردن**

١ - هێش

٢ - دەسەکەوشە

٣ - گاسن

٤ - مژان

٥ - نیڵە

٦ - کەڵەمە

٧ - هەپە

٨ - بەلووجە

٩ - گاینجە

١٠ - وێژانبەرە

١١ - نەقیزە و هێشەماڵە

**هێش:**

لە داربەڕوو دروستدەکرا، درێژیەکەی (١٢٥) سم بوو، لە سەرێکەوە ئەستوور بوو، پەلێکی لێ دەردەچوو کە گاسنەکەی پێوە دەکرا، پشتەکەشی کونێکی تێ دەکرا، دارێك بە درێژی (٩٠) سم سەرێکی دەکرایە نێو کونەکە و سەرەکەی دیکەی جێدەستێکی هەبوو کە (١٢)سم درێژبوو جوتیار دەستی پێوە دەگرت، تا گاسنەکە بە ڕێکی بڕوات، پێی دەگوترا دەستەکەوش، کۆتایی هێشەکە ئەستوور و پان بوو، ئەگەر جووتیار بیویستایە گاسنەکە زیاتر بە ناخی زەویدا بچێت پێیەکی دەخستەسەری، کۆتایی هێشەکە باریکتر بوو، دوو کون یا سێ کونی تێدابوو، کونەکانیش دیوەدەر بوون.

**مژان:**

له دارێك دروستدەكرا كه تیرەكەی پێنج ئینج و درێژیەكەی (١٥٠) سم بوو، له سەرێكەوه دوو كونی دیوەدەری تێدەكرا كه لەگەڵ كونەكانی سەری هێشەكەدا دەبێت لە ئاستی یەكتریدا بن چونكه دەخرێنه سەر یەكتری و هەپەكه دەخرێته نێوانیانەوە. هێش و مژان پێكەوە پێی دەگوترێت هەوجاڕ.

**هەپە:**

درێژییەكەی (٢٥) سم دەبێت، پانییەكەی (٤) سم دەبێت، سەرێكی ئەستوورە، لە دەمی كونی هێشەكە گیر دەبێت، سەرێكی دیكەشی كونێكی تێدایە، كه هەپەكه سەری هێشەكه و مژانەكه پێكەوە دەبەستێت، لە خوارەوە پیمێك دروستدەكرێت، درێژیەكەی (٧) سم بێت، پێی دەگوترێت بەلوجە، كه دەكرێت بە كونی هەپەكەدا، دوو هەپە و دوو بەلوجەش بەكاردەهێنرێت.

**نێڵە:**

نێڵە لە داربەڕوو دروستدەكرێت، لە گوندەكەی ئێمە كەرەستەی جوتكردن هەمووی لە داربەڕوو دروستدەكرا، چونكه داربەڕوو لە دارە زۆر بەهێزەكانە و لای ئێمەش داربەڕوو لەبەر زۆرییەكەی بەئاسانی دەستدەكەوت. نێڵە درێژیەكەی (١٢٥) سم، دەخرێتەسەر هەردوو ملی گاكە، لە هەر سەرێكەوە دوو كونی تێدایە، نێوان كونەكان (١٥) سم دەبێت، چوار دار بە درێژی (٧٠) سم بە ئەستورایی دار گۆچانێك بە ئەندازەیەكی مام ناوەند دەچەمێنرێتەوە و دادەنرێت تا وشك دەبێتەوە و دەق دەگرێت، بەم دارانە دەگوترێت كەڵەمە، كەڵەمەكان دەكرێت بە كونی نێڵەكەدا و ملی هەر گایەك دەخەیتە نێوانی دوو كەڵەمە، لە خوارەوە بە پەتێك دەبەسترێتەوە. لە ناوەڕستی نێڵەكەدا دارێك بە درێژی (٣٠) سم لەسەر شێوەی پیتی (U)ی

ئینگلیـزی لـه ناوەڕستی نێڵەکـه لـه نێوان هـەردوو گاکـەوه هەڵدەواسـرێت، کەپێی دەگوترێت گاینجه، که مژانەکەی پێدەبەسترێتەوه به گاینجەکەوه و پێی دەگوترێت وێژانبـەره. پەنـدێکی کـوردی هەیـه، جوتیارێك گایەکی مـردار بوایەتـەوه یـان زەرەرێـکی گـەورەی بکردایـه دایـانگوت "سـەری نێڵـەی کەوتـه زەوی".

### نەقیزه و هێشەماڵه:

دارێك درێژیەکەی (١٢٠) سم دەبێت، سەرێکی تیژ دەکرێت، یان بزمارێك به نوکەکەیدا دادەکوترێت بۆ ئەوەی گاکانی پێ لێ بخوڕدرێت. بـەو سـەره دەڵـێن نـەقیزه. سـەرەکەی دیکـەی ئاسـنێکی دەم پـانی وەك بێڵـەکانی کنگـر هەڵکەنـدنی پێـوه دەکرێت، لـه کـاتی جـووت کردنـدا گاسنەکه و هێشـەکه کـه پـیس دەبێـت یـان قـوڕ دەیگرێـت، پێـی پـاك دەکرێتـەوه، بەمـەش دەڵـێن هێشەماڵه.

کەرەستەی زەوی کێڵان (جووتکردن)

وێنەکه لەلایەن وێنەکێش (محەمەد غەریب)وه کێشراوه

## ٢ - کێڵان

زۆربەی ساڵەکان لە ناوەڕاستی پایزدا باران دەبارێ و پەڵە دەدات، لە ناوچەکەی ئێمەدا (٥)ی مانگی (١١) هەقە پەڵەیە. ئەوەی وەردی هەبوایە زۆرجار پێش ئەوەی باران ببارێت زەوییەکەی دەکێڵا، بەم کێڵانە دەگوترا وشکە وەرد. وەرد ئەو زەویەیە کە دووجار دەکێڵدرێت. جاری یەکەم هیچ تۆوێکی پێوە ناکرێت، جاری دووەم کە دەکێڵدرێت ئینجا تۆوی پێوە دەکرێت، چونکە گەنمەکەی زیاتر پاکتر و بڕشتی زیاتری دەبوو. پێشینان گوتوویانە (وەردت هەبێت نانت هەیە).

کاتێك پەڵە دەدا و تۆمە دەتەقێ، جوتیار دەست بە کێڵانی زەوی دەکات. ڕۆژانە (٢٠ تا ٣٠) کگم تۆوی لەگەڵ خۆی بردووە. سەرەتا بانەی دەبڕی و تۆوەکەی پێوە دەکرد لە سەرێکەوە دەڕۆیی و هۆی دەکردەوە بۆ سەرێکی تر. لە ناوچەی ئێمە لە ناوەڕاستی پایزەوە تۆو دەکرا هەتا یەکەم ڕۆژی چلە کە (١٥)ی مانگی (١). لەو ماوەیەدا (گەنم و جۆ و نیسك و گلێنە) دەکرا لە دوای (١٥ / ١) دەست دەکرا بە وەرد بڕین، لە نەورۆزدا دەست دەکرا بە نۆك کردن، بە دوای ئەویشدا بێستان وەك (کاڵەك و ترۆزی) دەکرا. بۆ بێستان کردن گوتویانە بارانێك کەمە و دوو باران زۆرە واتە؛ لە ناوەڕاستی بەهاردا تۆوی بۆیسان دەکرا.

کاتێك دەغلەکە شین دەبوو لە زەوییەوە بەرز دەبووەوە مشك لاسکی دەغڵەکەی دەقرتاند، خاوەنەکەی دەچووە ناو زەویەکە و کونی مشکەکانی پڕ دەکردەوە و بە بەرد دەیکوتایەوە. کە بستێك دەغڵەکە بەرز دەبووەوە دەیانگوت کەروێشکە دەکات، ئینجا بژار دەکرا و کاتێك گوڵی دەکرد و فەریك دەبوو پاسە چۆلەکە دەکرا. لەبەر ئەوەی گوندەکەی ئێمە دارستانی سروشتی زۆر بوو باڵندەی چۆلەکەیشی زۆر بوو، گەنمەکەیان دەخوارد. جوتیارەکان داهۆڵیان بە چوار دەوری دەغڵەکەدا درووست دەکرد.

پێش ئەوەی گوڵە گەنمەکان وشك ببێت، هەندێ کەس قەرەخەرمانی دەکرد. گوڵی گەنمەکەی لە بەرزییەوە دەبڕی و کۆی دەکردەوە و لە سەر خەرمان بە شێوەیەك دەیسوتاند کە نیوە سوتاو دەبوو، پاشان بە دار دەیکوتا و شەنی دەکرد و پاکی دەکرد و دانەکەی بە دەستاڕ دەهاڕی و وەك ساوەر لێ دەنرا، لەبەر ئەوەی برنج زۆر کەم بوو قەرەخەرمان بۆ ئەو دەمە خواردنێکی نایاب بوو.

### ٣ - دروێنە کردن

لە کۆتایی مانگی پێنجدا گەنمەکە ئامادە دەبوو بۆ دروێنە کردن. زۆربەی کات لە گوندەکەی ئێمەدا دروێنە کردن بە هەرەوەزی بوو، خاوەن دەغڵ لای کورەچی داسی دەمەزەرد دەکرد و بە هەسان و چەوری چاك تیژی دەکرد. هەسان، بەردێکی تایبەت بوو دەمانکڕی، دەمی داسەکەمان بە ڕۆن چەور دەکرد و هەسانەکەمان پێدا دەهێنا. پەندێك هەیە بۆ ماڵێ هیچ ڕۆن لە ماڵەکەیدا نەبوایە، دەیانگوت (چەورەهەسان لە ماڵماندا نیە).

ئەو کەسەی درەوی دەکرد بە گەوزی[١] داسەکەی گەنمەکەی دەگرت و دەیبڕی هەتا دەستی پڕ دەبوو، بەم چەپکەی دەستی دەگوترا (سواڵە)، چەند سواڵیەکی لە بان یەك دادەنرا پێی دەگوترا (مەلۆ). مەلۆکان کۆدەکرایەوە بە مەلۆی گەنم دەگوترا (گەلاوێژ) بە هی جۆ و نیسك و نۆك دەگوترا (شارا). کاتێك درەو تەواو دەبوو سواڵەیەك لە ناوەڕاستیا دەبڕا و پێکەوە گرێ دەدرا و لەبان شارایەك دادەنرا و نیەتی سەربڕانەی لێ دەنرا و سەڵاوات (صلی الله علیە و سلم) لە دیاری محەمەد دەدرا و خاوەنەکەی بە پێی توانای خۆی سەربڕانەی بۆ دەکرد.

---

[١] گەوزی. بە بەشە چەماوەکەی داسەکە دەگوترێت.

### ٤ – خەرمان و کوتان

لە بەرزاییەکی زەوییەکە یا لە شوێنێکدا (با) بیگرتایەتەوە، شوێنێك تەخت دەکرا و ئاوی تێ دەکرا و بە بانگردێن دەکوترایەوە و دەبووە جێ خەرمان و گەنمەکە دەکێشرایە سەری ئەم کارە بەزۆری لەلایەن ئافرەتانەوە بە کۆڵ دەیانکرد. کێشە، بە گوریس دەکرا کە درێژی گوریسەکە نزیکەی (٧)م دەبوو. سەرێکی گوریسەکە دارێکی پێوەبوو وەك دارلاستیك وابوو پێی دەگوترا چەڵەمە، کاتێك گەنمەکە دەخرایە سەری سەرێکی گوریسەکە دەخرایە چەڵەمەکە و ئافرەتەکە لە کۆڵی خۆیی دەنا، ژنی وا هەبوو بە دوو گوریس کاری دەکرد، تا کۆڵێکی دەبرد هەتا دەهاتەوە کۆڵێکی تری بۆ ئامادە دەکرا، یەکێك تەمەڵ بوایە و بیگوتایە ماندووم دەیانگوت "برۆ ئەولاوە ئەڵێی بە دوو گوریس کێشەت کردووە". کێشە بە ڕەشکە دەکرا. ڕەشکە لە مووی بزن دروست دەکرێت، مووەکە بە تەشی دەڕێسرێت و دەکرێت بە بەن و چەن تاڵ بەنێك بە یەکەوە دەهۆنرێتەوە و ڕەشکەکەی لە شێوەی تۆڕی ماسی لێ دروست دەکرێت و هەڵاشی گەنمەکە دەخرێتە ناو ڕەشکەکە، کە پڕبوو دەمەکەی دەهێنرێتەوە یەك و دەخرێتە سەر پشتی گوێدرێژ و دەبرێتە سەر خەرمان. لەسەر خەرمان بە شێوەی بازنەیی ڕێك دەخرێت بە جۆرێك گوڵی گەنمەکە بۆ ناوەوە بێت و بە بازنەیی ڕەن دەنرێت، هەر کە کێشە تەواو بوو کوتان دەستپێدەکات.

پاشان نۆرەی کوتانی دەهات. کوتان بە گا یان گوێدرێژ یان هەردووکیان دەکرێت. لەم دواییانەدا جەنجەڕیش پەیدابوو کە لە دوو خلۆکە پێکهاتبوو، دەمی تەوریان پێوەبوو، کە بە زۆری بە هێستر ڕادەکێشرا. دوای کوتان دەبووایە گێرە بکرێت. گێرە بە چوار وڵاخ دەکرا کە بە گوریس یەك بە دوای یەکدا هاومل دەکران و دەبەسرانەوە، دەبوایە ئەو وڵاخەی لە بنەوە دەبەسترا لە وڵاخەکانی تر باشتر گێرەی بکردایە، کە پێیان دەگوت گای بنە، هەتا گای

بنـه چـاكتر بوايـه گێرەكـردن ئاسـانتر دەبـوو. پاشـان دەغڵكـە لـە ڕەنـی خەرمانەكە دەردەهێنرا و بە چوار دەوری خەرمانەكەدا دادەنرا، بەمە دەگوترا (قـرچ) بـۆ نموونـە كابرايـەك دەيگـوت ئەوەنـە قرچـە، قرچـەكە دادەنـرا و وڵاخـەكان بـە شـێوەی بازنـەيی بەسـەريدا دەڕۆيشـتن و دەخولانـەوە، وەرزێرەكـەش بـە (سێ لك)ێك ئـەو كلۆشـانەی كـە دەكەوتـە دەرەوەی قاچی وڵاخـەكان بـەرەو نـاوەوەی دەبردنـەوە، بەمـە دەگـوترا پـەڕۆناو. سێ لـك لـە داربەڕوو دروست دەكرا، بريتيبوو لە دارێك كە درێژيەكەی (١٥٠) سم بوو، لە سەرێكيەوە (٣) پەلی هەبوو هەر پەلێكی (٣٠) سم درێژ بوو، ئەم پەلانە بە تەڕيی تۆزێك كووڕ دەكرايەوە و لە بەينی دارێكدا دادەنرا تا وشك دەبوويەوە و بە كووڕيی دەقی دەگرت. لە ساڵی (١٩٥٠) بە دواوە سێلكی ئاسن پەيدا بوو كە لەلايەن ئاسنگەرەوە دروستدەكرا و لە بری (٣) لك (٤) لكی هەبوو، بەڵام هەر پێی دەگوترا سێ لك.

كاتێـك قرچـەكە نيـوە كـوت دەبـوو دوو نەفـەر بـە دوو سـێ لكـەوە قرچـەكەيان هەڵدەگێڕايـەوە، بەمـە دەوتـرا وەرد، بـە سێ لـك ئـەو كلۆشـەی دەكەوتـە بنـی خەرمانەكـە دەخرايـە ژێـر سـمی وڵاغەكـە بەمـەش دەگـوترا بنموور. گێرە بەردەوام دەبوو تا هەموو قرچەكان دەكوترا، پاشان كوتراوەكە بـە سێ لـك و شـەن كۆدەكرايـەوە و بـە ئاراسـتەی بايـەك هەڵدەكرا. چـەند بەردێك لە پێشەوە دادەنرا، كە دەست دەكرا بە شەنكردن بەردەكان دەبووە سـنووری شـەن كـرا و شـەن نـەكراو. سـێ جـۆر بـای شـەنكردن هـەبوو كـە بريتيبوون لە (بای شەماڵ، بای وەشت، بای ڕەشەبا).

بای شەماڵ لە هەموويان چاكتر و دەمڕاستر بوو. ئەو كەسەی شەنی دەكرد پێی دەگوترا شەنكار، ئەبوايە زۆر كارامە و لێزان بووايە و بە جۆرێك شەنەكەی هەڵدايە بايەكە كاكەی دەبرد و دانەكەی دەكەوتە ديوی ناوەوەی خەرمانەكە.

شەن، لە دار دروست دەكرا (٧) لكی هەبوو، ئەم لكانە بە پێستەی ئاژەڵ پێكەوە بە یەكەوە دەبەستران، بەینی لكەكان كەم بوون. وەستای قەرەج دروستی دەكرد. شەنكار بەردەوام دەبوو هەتا كەمێك پاك دەبوویەوە، بەو كەمە پاكە دەگوترا (پێخوێ) كاتێك كای ناو دانەكە بە تەواوی كەم دەبووەوە، دەیانگوت (گەڕ) بووە. بە دوای ئەوەدا بە خاكەناز شەن دەكرا پێی دەگوترا (زرنگاندنۆ). كە بەشێكی زیاتری لێ پاك دەبووەوە بە درێژایی (دوو بۆ سێ) مەترێك پێی دەگوترا (ماسوولكە). كە هەموو خەرمانەكە پاك دەكرایەوە دەیانگوت خەرمان سور بووە و ئیتر ئامادە دەكرا بۆ (كەوكردن).

كەو، لەلایەن قەرەجەكانەوە دروستدەكرا، بریتیبوو لە دەورەیەكی بازنەیی كە لە دار دروستدەكرا و ناوەكەی بە تاڵی پێستە خۆشكراو دەچنرا، بەشێوەیەك گەنمەكە لە كونەكانەوە دەكەوتە خوارەوە و ئەوەی لە (كەو)ەكەدا دەمایەوە پێی دەگوترا (كۆتەڵ). كاتێك كەوكردن تەواو دەبوو و خەرمان سوردەكرا دەبوایە بە پێی پەتیی ئیش لەسەر سوری خەرمان بكرایە، ئەو كەسەی خەرمانەكەی دەپێوا دەیكردە تەنەكە و بۆ هەر ژمارەیەك دێڕێكی ئاینیی لەگەڵدا دەگوت بۆ نموونە: ئەمە یەك (یەك هەر خوایە) یان دەیگوت: ئەمە چوار (چوار یاری نەبی ئەبوبەكر و عومەر و عوسمان و عەلی) جار بە جاریش سڵاوات لەسەر گیانی پاكی محەمەد(د.خ) لێدەدرا. ئەوانەشی كە لەسەر خەرمانكە بوون هەموویان سڵاواتەكەیان دەسەندەوە. خەرمانی سور دەكرایە ناو (هۆڕ)ێك، هۆڕ، لە دوو (تا) پێكهاتبوو كە لە خوری یان موو لە لایەن ژنانی ئاوایی دروست دەكرا، كە لە هەشت تەنەكەوە تا دوانزە تەنەكە گەنمی دەگرت، هەڵگرتنی خەرمانەكەش بە هەرەوەزی بوو. پاشان گەنم دەكرایە نێو عەمبار یان دەكرایە چاڵ كە (٣٠ بۆ ٤٠) تەنەكە گەنمیان دەگرت.

گەنمەکە دەدرا لە (بێژنگ)، بێژنگ وەك و کەو وابوو، بەڵام کونەکانی بچوکترن، گەنمەکە لە ناویدا دەمایەوە هەرچی وردەو زریزانە و پیسی بچوك هەبوایە دەکەوتە خوارەوە بەمە دەگوترا (ژێر بێژنگ)، هەر پیسیەکیش لە ناو بێژنگەکەدا کۆ دەبویەوە پێی دەگوترا (سەرکۆزەر). ئەم کارە ژنی شارەزا دەیکرد، بە شێوازێك دەستی دەجوڵاند هەر کاو کۆتەڵێك لە ناو بێژنگەکەدا بمایەتەوە خڕ دەبووەوە، بەم کارە دەگوترا (گێژ کردن). بە دەست کۆتەڵەکە لادەبرا و ئەوەی دەمایەوە دەخرایە سەر سینیەك و ژنەکە دەستی دەجوڵاند و گەنمە پاکەکە دەکەوتە خوارەوە و بەردەکان لە لایەکی سینییەکەوە کۆ دەبوویەوە و فڕێ دەدرایە لایەکی ترەوە، بەم کارەش دەگوترا (تەتەڵەکردن). پاشان بەشی تۆوکردنی لێ جیا دەکرایەوە و هەر ماڵە و بە پێی پێویستی خۆی ساوەری لێ دەکرد.

ساوەرکردن، گەنمەکە دەشۆرایەوە و دەکرایە نێو قابلەمەیەکی گەورە یان نیوە بەرمیلێك و پاشان دەخرایە سەر ئاگر کە دەکوڵا پێی دەگوترا (دانوولە). پاشان لەسەر ڕاخەرێك هەڵدەخرا تا وشك دەبوویەوە ئینجا چاڵێکی بچووك هەڵ دەکەنرا بە شێوەیەك یەك تەنەکە گەنم بگرێت، گەنمی ساوەرەکەی تێدەکرا و کەمێك ئاوی لێ دەدرا پاشان بە چەند پیاوێك بە مێکوت دەیانکوتا. بە کوتانەکە، گەنمەکە توێکڵی لێ دەبوویەوە پێی دەگوترا (پووشە ساوەر)، کە زۆر جار سوود لەو پووشە ساوەرە وەردەگیرا و دەکرا بە سەرین.

ساوەر کوتانیش چیرۆك و گۆرانی خۆی هەیە. خاوەن ماڵ چای لێ دەنا و چەند پیاوێك بە نۆرە مێکوتیان دەکوتا و بە دەوریا دەسوڕانەوە. یەکێکیان دەیگوت حەوتی، ئەوانی دیکە بە دوایدا دەیانگوت حەوگا. کەسی یەکەم

دەیگوت ئاوی (دوو ڕیشه)[1] بە دوایدا دەیانگوت تێی نیشه، لێیده، بیکوته، یا اللە. دوای کوتان ژنان گەنمە کوتراوەکەیان کۆ دەکردەوە و چەند ڕۆژێك لەبەر خۆر هەڵیاندەخست و بە بایان دەکرد و ئەوەی دەمایەوە بە دەستاڕ دەهاڕدرا. ژنان و کچان بە هەرەوەزی دەیانهاڕی. بۆ ساوەر تۆزێ زبرتر دەیانهاڕی، بەڵام بۆ دۆینە وردتر دەیانهاڕی. لە دوای هاڕین لە بێژنگ و هێڵەك دەدرا و وردەکەی دەکرا بە شۆربای (بینخەنیلکه) ئەوەشی دەمایەوە دەکرا بە ساوەر یان دۆینە. ئەو گەنمەشی بۆ ئارد دادەنرا دەشۆرایەوە و لە دوای پاککردن دەبرا بۆ ئاش.

٦- ئاشی ئاو

چەمێکی درێژ هەبوو لە بەینی گوندی چنارە و سیارەدا ناوی چەمی ئاشان بوو، چونکە لە دێرزەمانەوە چەندین ئاشی ئاوی تێدا بووە ئێستاش ئاسەواری هەندێکیان هەرماون وەکو ئاشی :- حسەین خواکەرەم ڕەشید و فەقی سەلیم مەلا کەریم، بەڵام بە بیرەوەری من سێ ئاشم بینیوە گەنمیان هاڕیوە، کۆتا ئاش تا سەرەتای حەفتاکان هەر مابوو کاری دەکرد. ئەو ئاشانەی کە من بینیومن و گەنمم لێ هاڕیون ئەمانە بوون:-

١- ئاشی عەبدولقادر حامید عەبدوڵڵا.

٢- ئاشی کەریم قادر کە لەگەڵ ماڵی فەقێ کەریم چنارەیی شەریك بوون.

٣- ئاشی مەولود ڕەحمان محەمەد، کە لەگەڵ شێخ قادری شێخ حسەینی چنارەیی شەریك بوون، شێخ تاهیری شێخ قادر ئەیگێڕا و هەتا سەرەتای

---

[1] دوو ڕیشه. کانییەکە لە نێوان گوندی سیارە و چنارەدایە.

حەفتاکان بەردەوام بوو. مەولود ڕەحمان، هەم خاوەن ئاش و هەم وەستایی ئاشەکەی دەکرد، کاتێك ئاشەکە گەنمەکەی بە زبری بهاڕیایە بە چەکوشێك لە بەردی ئاشەکەی دەدا و چاکی دەکردەوە، بەم چاککردنەوەیە دەگوترا میرازکردن.

کرێی هاڕین بە مزە بوو (دە یەك بوو) واتە؛ لە (١٠) تەنەکە ئاشەوانەکە (تەنەکەیەکی) دەبرد، جگە لەوە خاوەن ئاش لە هەر بارێك بلوچەیە ئاردی دیکەیشی دەبرد. بلوچە لە دەفرێك پێکهاتبوو کە (١٢٥٠) غرام ئاردی دەگرت، ئەو کەسەی ئاشەکەی دەگێڕا بلوچە ئاردەکەی دەکردە کولێرە بۆ خۆی.

لەم دواییانەدا کە خەڵك پارەی هەبوو بە پارە گەنمیان دەهاڕی، ئەو گەنمەی کە ئامادە دەکرا بۆ ئاش پێیان دەگوت (باراش)، ئەگەر هۆڕێ گەنم یان جۆت ببردایە بۆ ئاش دەبوایە هەوانە (هەمبانە)یەکی بەتاڵت لەگەڵ خۆت ببردایە، چونکە کاتێك گەنمەکە دەکرا بە ئارد زیادی دەکرد، بۆ ئەوەی زیادەکەی بکردایەتە نێو هەوانەکە و دەخرایە سەر بارەکە.

بەم شێوەیەی کە باسم کرد نان پەیدا دەبوو. بزانە چەند زەحمەت و دەردی سەری بوو، ساڵی وەها هەبوو ئافات یان سون و کیسەڵە یا بەراز ڕەنجی ساڵێکی جوتیاری بە با دەدا.

## کۆمپانیا و هەلی کار

وەکو دەڵێن لەدوای هەر سەرما و سۆڵەیەک بەهار دێت، بەهاری ئێمەش بە هاتنی سێ کۆمپانیای گرنگ بوو بۆ ناوچەکە، چونکە هەلی کاریان بۆ سەدەها کرێکار هێنایە ئاراوە، کارەکە بریتیبوو لە پرۆژەی بنیاتنانی بەنداوی دەربەندیخان لەسەر ئاوی سیروان و دروستکردنی تونەیلی دەربەندیخان و شەقامی سەرەکی دەربەندیخان - سلەیمانی. بە هاتنی ئەو کۆمپانیایانە خونچەی منیش گوڵی کرد و گەشایەوە، لە جێگەی مامێکم ڕۆژی بە چارەکە دینارێك دامەزرام.

یەکەم دامەزراندنم ئاوی خواردنەوەیان پێ دەکێشام بۆ کرێکارەکان. دوو پووتم دەکرد بە ئەمسەر و ئەوسەری دارێکدا و ئاوم تێ دەکردن و بە شان دەمبرد بۆ کرێکارەکان، دوای ئاو هێنانەکەش کەمە کەمە ئیشی پاچ کاریم دەکرد. لە ئیشکردندا ئازا بووم و بەو هۆیەوە بوومە جێگەی ڕەزامەندی فۆرمەن (چاودێر)ەکە. فۆرمەنەکە کە زانی ئیشی ئاو هێنانەکەم بە چاکی دەکەم، کردمی بە کرێکاری هەمیشەیی و ڕۆژانەکەم لە چارەکە دینارێکەوە گۆڕا بۆ نیو دینار.

پێشتر شوانیم دەکرد مانگی بە چارەکە دینارێك، بەڵام لە کۆمپانیاکە ڕۆژی بە چارەکە دینارێك، ڕۆژی چارەکە دینارێك بۆ ئەو ڕۆژە پارەیەکی زۆر بوو بۆ من و بۆ ئەوانەی وەك من بوون، کۆمپانیاکان پێویستیان بە هەموو کەسێك هەبوو کرێکار، وەستا، دارتاش، چاودێر و پاسەوان... هتد. بەیەك جار خەڵکی ناوچەکە هەموویان ڕوویان لەو ئیشە کرد، ئەوەندە خەڵکی زۆر هات ئیتر دامەزراندن نارەحەت بوو. ئەوانەی کە شۆفێرییان دەکرد هەموویان عەرەب بوون، چونکە لە لای ئێمە کەس شۆفێری نەدەزانی.

ڕۆژێکیان لە گوێ چەمی سیروان شۆفێرێکی عەرەب کوژرا کەس نەیزانی هۆکارەکەی چیبوو، ئیتر لە ترسا هەرچی شۆفێری عەرەب هەبوو کۆمپانیایان بەجێهێشت و گەڕانەوە شارەکانی خۆیان و کۆمپانیا پەکی کەوت و ئیش و کار وەستا، ناچار کۆمپانیا داوایان کرد هەر کەس شۆفێری دەزانێ بێت خۆی ناونووس بکات. یەکەم کەس کە کاری شۆفێرییان کرد شێخ عەلی شێخ فەرەجی چنارەیی و ڕەوف سالْح قادری شەفی کە خەڵکی قاشتی بوون، ئەم دوانە یەکەم کەس بوون شۆفڵی (ماشیگال) و گەلابەی (نوکلیت)یان لێخوڕی و یەکەم کەسیش بوون لە ناوچەی ئێمەدا مۆڵەتی شۆفێرییان دەرهێنا. شۆفێری ڕۆژانەیەکی باشی هەبوو، سەعاتی زیادەشیان بۆ ئەژمار دەکرا. پێویستە بگوترێت شێخ عەلی شێخ فەرەج کەسایەتییەکی ناوچەکەیە و هەموو کات بە دەم خەڵکەوەیە بۆ کاری ئاشتەوایی و خێرخوازی، ئێستا لە گوندی چنارەیەو باری تەندروستی ناجێگیرە.



شێخ عەلی شێخ فەرەج

## شۆڕشی عبدولکەریم قاسم و حیزب شیوعی

ساڵی (١٩٥٨) عبدولکەریم قاسم کودەتای بەسەر حکومەتی پاشایەتیدا کرد و بنەماڵە و دار و دەستەکەی لە ڕەگەوە هەڵکێشا، میللەت پێیان ناخۆش بوو کە بەو شێوەیە خێزانی مەلیك فەیسڵ لە ناو برا، بەڵام ئێمەمانان زۆر دڵخۆش بووین کە شۆڕش کرا، وامان دەزانی میللەت دەبوژێتەوە و حکومەتی کۆماری لایەکی خێرمان لێ دەکاتەوە. حیزبی شیوعی و پارتی دیموکراتی کوردستانیش هاوسۆزی شۆڕشەکە بوون. کاتێك کە لە شەریکە کرێکار بووین هەردوو حیزب کاری ڕێکخستنیان دەکرد بەتایبەتی حیزبی شیوعی زۆر چالاك بوون و ئەندام و لایەنگریان لەنێو چینی جوتیار و کرێکار و زەحمەتکێشدا زۆربوو. لەبەر ئەوەی کوردستان ناوچەیەکی کشتوکاڵی بوو جوتیاری زۆر بوو، بژێوی لادێ و شار لە ناخی زەوییەوە بەرهەم دەهێنرا و زەویش هی خاوەن موڵك بوو، دەبوو جوتیار نیوەکاری خاوەن زەوی بوایە، حیزبی شیوعی دژی ستەمی دەرەبەگی و سەرمایەداری سواری شەپۆلی ناڕەزایی چەندین ساڵەی خەڵك بوو، خەڵك ئەوەندە جەور و ستەمی دیبوو هەرزوو بەدەم بانگەوازەکەی حیزبی شیوعییەوە چوون و خۆیان ڕێکخست. بەو شیعارەی بڵاویان دەکردەوە، کە زەوی موڵکی ئەو کەسەیە کە دەیکێڵێت. شۆڕشی کۆماریش ئەوەندە هاوسۆزیان بوو خەڵکی دەیانگوت "عبدولکەریم قاسم چاوی چەپ و ڕاستم". چەند مانگێك دوای شۆڕش کرام بە سەرباز و سێ مانگم لە کەرکوك و سلەیمانی تەواو کرد و وازیان لێ هێنام و گەڕامەوە بۆ گوندەکەمان.

### بۆ یەکەم جار کردنەوەی قوتابخانە

عەبدولکریم قاسم دەستی کرد بە چاکسازی بە تایبەت لە بواری خوێندندا، نەك هەر لە شارەکان بەڵکو لە لادێکانیش ئەو کارەی ئەنجام دا، بەڵام ئەوەی بوو بە کێشە کەمی مامۆستا و بینای خوێندنگە بوو، لەبەر ئەوەی لە زەمانی حوکمی پاشایەتیدا قوتابخانە زۆر کەم بوو بە تایبەت لە لادێکاندا، ئەوەی بیتوانیایە بخوێنێت تەنها لە حوجرە لای مەلاکان دەیانخوێند.

حکومەتی کۆماری بڕیارێکی دەرکرد بۆ ئەو کەسانەی کە لە حوجرە خوێندویانە تاقیکردنەوەیەکی پێدەکردن ئەوەی دەربچوایە دەبوو بە مامۆستا و ڕەوانەی ئەو دێهاتانە دەکران کە فەرمانی کردنەوەی قوتابخانەیان بۆ دەرچووبوو.

بۆ کردنەوەی قوتابخانە لە گوندەکەمان حاجی مەولود قادر عەزیز هەوڵێکی زۆری داو فەرمانی کردنەوەی قوتابخانەی وەرگرت، بەڵام حکومەت کێشەی بینای هەبوو. حاجی مەولود لەسەر ئەرکی خۆی بە شێوازێکی ڕێك و پێك (٣) ژوری دروست کرد، حکومەتیش ڕازی بوو بۆ خوێندنی ساڵی (١٩٥٩) بەکری سۆفی سمایل ناسراو بە (بەکرە فەنی) وەك مامۆستا لە سلێمانیەوە هات بۆ گوندەکەمان، حاجی مەولود جێگەشی بۆ مامۆستا بەکر دابین کرد.

مامۆستا بەکر مامۆستایەکی زۆر دڵسۆز و چاك بوو، زۆر حەزی بە خزمەتکردن بوو. لەگەڵ قوتابیەکان خۆی ماندوو دەکرد بە ڕۆژ وانەی دەگوتەوە و بە شەویش لەبەر چرا وانەی بەو کەسانە دەگوتەوە کە تەمەنیان گەورە بوو یا نەیاندەتوانی بە ڕۆژ بخوێنن، بەڵام بە داخەوە تەمەنی قوتابخانەکە تەنها ساڵێك بوو.

ئـەو قوتابیانـەی بـە ڕۆژ یـان بـە شـەو دەیانخوێنـد ئەوانـەی بـۆم سـاغ بوویەوە ئەمانە بوون:-

١ – عومەر مەولود قادر

٢ – عەزیز مەولود قادر

٣ – حەسن ساڵح حسەین

٤ – محەمەد حسەین قادر

٥ – سابیر ئەمین خەسرەو

٦ – عەلی مەولود قادر

٧ – برایم حمەخان

٨ – ئەحمد برایم محەمەد

٩ – مەولود ئەمین خەسرەو

١٠ – مەحمود حمە مەحمود

١١ – ڕەوف ئەحمەد فەتاح

١٢ – عەلی مەحمود ڕەحمان

١٣ – ساڵح حەمە میران

١٤ – حەسەن فەتاح ڕەحمان

١٥ – قادر فەرەج عەلی

١٦ – حسەین قادر ئەحمەد

١٧ – عەبدوڵڵا محەمەد میران

١٨ – ڕەسوڵ حاجی مەحمود

١٩ – جەلال فەقێ ئەحمەد (میرەدێیی)

٢٠ – عەلی ئەحمەد عەلی

٢١ – کەریم ئەحمەد عەلی

٢٢ – کەریم حەمە ڕەحمان

٢٣ – عیزەت عەلی فارس

٢٤ – تالب حەمە مراد

٢٥ – فەرەج حەمە ئەمین

٢٦ – محەمەد عەبدولقادر حەمە ئەمین

٢٧ – محەمەد مەولود قادر

جێگەی خۆیەتی ئەگەر بە کورتیش بێت باسێکی چاکەی حاجی مەولود بکەم کە چەند پیاوێکی سەخی تەبیعەت و میوان دۆست و دیوەخاندار بوو، زۆر حەزی بە چاکەو پیاوەتی بوو، یەکەم کەس بوو لە زەمانی پاشایەتیدا ڕادیۆی هێنایە گوندەکەمان، کە بە پاتری ئیشی دەکرد، دووەم کەسیش بوو لە دێیەکەماندا کە لەگەڵ حاجی برایم بە مەبەستی (حەج) کردن زیارەتی ماڵی خودایان کردبوو، یەکەم کەس حەمە مراد حەمە ڕۆستەم بوو.

حاجی مەولود تفەنگچیەکی کەم وێنە بوو، لە ڕاودا فیشەکی بە خەسار نەدەچوو، نیشانشکێنێکی چاك بوو (خاڵێ محەمەد مستەفا) خێزانی بوو، ژنێکی دەست ڕەنگین بوو، لە تەون کردن و کاری ڕستندا زۆر کارامە بوو. حاجی مەولود لە ساڵی (١٩٧٢) کۆچی دوایی کردووە. هەزار ڕەحمەت لە ڕۆحی پاکی بێت و خوای گەورە بە بەهەشتی بەرینی شاد کردبێت.

بۆ جاری دووەم ساڵی (١٩٧٧) کە قوتابخانە لە گوندەکەماندا کرایەوە عەبدولقادر حامید خانووەکەی خۆی پێشکەش بە قوتابخانەکە کرد و حکومەتیش ڕەزامەندی کردنەوەی دەربڕی و لە سلێمانیەوە دوو مامۆستای بۆ نارد بە ناوەکانی:– مامۆستا پاکیزە و مامۆستا نەزیرە علی مستەفا.

عەبدولقادر حامید خانووی بۆ مامۆستاکان دابین کرد، لەو ساڵەی خوێندندا کارەساتێکی ناخ هەژێن ڕوویدا و گێڕانەوەی خراپ نیە. مامۆستاکان بە قوتابیەکانیان گوتبوو جانتا بکڕن بۆ کتێبەکانتان، ئەوەی دەسەڵاتی

هەبوایە جانتای بۆ منداڵەکەی دەکڕی، ئەو کاتانە خەڵکی بۆ کڕینی پێداویستیەکانیان بە کەمی دەچوون بۆ شار، عومەری حاجی قادر قوتابیەك بوو بە باوکی گوتبوو جانتای بۆ بکڕێت، حاجی قادریش گفتی پێدابوو هەرکاتێك چوو بۆ شار جانتای بۆ بکڕێت. ئەو کاتە لەلای ئێمە خەڵك یان بۆ دەربەندیخان یان بۆ سلێمانی دەچوون. لە (١٩٧٨/١/١٥) حاجی قادر لە شار جانتای بۆ کوڕەکەی کڕیبوو پیش ئەوەی بگەڕێتەوە لە ناکاودا و لە نێو پۆلدا عومەر بەلادا دێت و گیان لەدەست دەدات. دوای ئەوەی شۆردمان و کفنمان کرد و بردمان بۆ گۆڕستان، کاتێك خەریکی شاردنەوەی تەرمەکەی بووین حاجی قادر هاتەوە و جانتاکەی بە دەستەوە بوو و هات بۆ سەر قەبران داواکاری ئەوە بوو بەردەکە لابەرن و ماچێکی عومەر بکات، بەڕاستی هەمووماں دەستمان کرد بە گریان، لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا زۆر ناڕەحەتی و کارەساتم بینیوە کەم کارەسات هەبووە ئەوەندەی مردنی عومەر و بینینی حاجی قادر لەو ساتەدا ناخی هەژاندبم.

هەر لەو ساڵەدا (١٩٧٧ ـ ١٩٧٨) لەگەڵ خوێندنی بەیانیانیشدا خوێندنی نەهێشتنی نەخوێندەواریش کرایەوە، ئەوانەی تەمەنیان گەورە بوو بە شەو دەیانخوێند، منیش یەکێك بووم لەوانە، خوێندن بە زۆر بوو بە تایبەتی بۆ ئەو کەسانەی کە مووچەیان هەبوو ئەگەر نەیانخوێندایە و پشتگیری قوتابخانەکەیان نەبردایە حکومەت مووچەی پێ نەدەدان. دوای نوێژی عیشا دەچووین بۆ قوتابخانە هەمووماں بەتەمەن گەورە بووین، جارێکیان پێش ئەوەی لە قوتابخانە بڕۆینەوە مامۆستا ناوی هەمووماني لەسەر تەختە ڕەشەکە نووسی و گوتی هەر کەسێ هەستێ و ناوی خۆی بدۆزێتەوە و خەت بە ژێر ناوەکەی خۆیدا بهێنی بڕواتەوە. حەمە ئەمینی حاجی حەمەخانی هەستاند نەیدەزانی ناوەکەی خۆی کامەیە، حەمە ئەمین گوتی با هەمووی هەستێ و ناوی خۆی بدۆزێتەوە هەر ناوێ مایەوە ئەوە ناوی منە.

لە ساڵی (١٩٧٩) فەرمانی دروستکردنی قوتابخانەمان بۆ دەرچوو. بەڵێندەرەکەی محیەدین حەمە ساڵح بوو کە خەڵکی گوندی (سەلیم پیرك) بوو. قوتابخانە دروست کرا و قوتابیەکان چوونە قوتابخانەی نوێ و سێ مامۆستای دیکەی بۆ هات بە ناوەکانی:-

١ - مامۆستا سەوسەن.

٢ - مامۆستا ئیلام.

٣ - مامۆستا ژیان، (خانەقینی) بوو.

بە دوای ئەوانیشدا مامۆستا محەمەد گواسترایەوە بۆ گوندی سیارە، ئیتر قوتابخانە بەردەوام بوو تا ساڵی (١٩٨٦)، پاشان حکومەت قوتابخانەکەی داخست و کارەبای گوندەکەشی بڕی.

لە دوای ڕاپەڕینی (١٩٩١) چووینەوە بۆ گوندەکەمان و هەندێ لە خەڵکی ئاوایی پێشنیارمان کرد نەچینەوە دێ کۆنەکە لە پشتی جادەکە زەوییەك هەبوو بۆ خانووکردن زۆر لەبار بوو و خاوەن زەوییەکەش ئامادەیی دەربڕی دابەشی بکات و پێمان بفرۆشێت، جێگەی قوتابخانەشمان دیاری کرد، بەڵام سەرئەنجام خەڵکی گوندەکە ڕێك نەکەوتین و کارەکەمان سەری نەگرت.

پاشان ڕێکخراوی (K.R.O) هەرماڵە و کابینەیەکی داینێ و دەستمان کرد بە خانوو دروست کردن و چەند کابینەیەکیشمان وەرگرت بۆ قوتابخانەکە، مەحمود قادر کەریم ماڵیشی لەوێ نەبوو زەوی پێشکەش کرد و کابینەی تێدا دانرا و مامۆستا عوسمان علی حاجی مەحمود و مامۆستا نوخشەی خێزانی وانەیان تێدا دەگوتەوە، بە دوای ئەواندا چەندین مامۆستای دیکە هاتن و بۆ جارێکی دیکە ساڵی (٢٠١٢) لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە قوتابخانەیکی نوێیان بۆ دروست کردین و قوتابخانەکە تا ساڵی (٢٠١٥) بەردەوام بوو، بەڵام لەبەر کەمی قوتابی قوتابخانەکە داخرا.

## مزگەوت و مەلا

خەڵکی گوندی سیارە زۆر دیندار بوون و حەزیان لە مزگەوت و مەلا بووە لە ڕۆژو گرتن و حەجکردندا ئازا بوون، لە زەکاتدا زۆر ورد بوون و ئەوەی واجب بووە لەسەریان زەکاتیان لە ماڵ دەرکردووە، وەك زەکاتی پارە و دانەوێڵە و ئاژەڵ.

بە بیرەوەری من مزگەوت لە دێکەدا هەبووە، جگە لە دینداری کێشە کۆمەڵایەتیەکانیش لە مزگەوت چارەسەریان بۆ دەدۆزاریەوە، خەڵکی گوندەکە بە گشتی خزمەتی مزگەوتەکەیان دەکرد و لە ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتدا بەشدار دەبوون. ئەوانەی خوێندەوار بوون و بەرنوێژیان کردووە یا بانگیان داوە ئەمانە بوون:-

١ - مەلا مەحمود میران

مەلایەکی شارەزا بوو بۆ خوێندن و شارەزایی لە دین زۆر گەڕاوە و هەتا کەرکوکیش چووە، قورئان خوێن بووە و بەرنوێژی کردووە و تەڵقینی مردووی داوە. پیاوێکی میواندار و سەخی بوو، زۆر هاوکاری خەڵکی هەژار و کەم دەرامەتی دەکرد، تەنیا کوڕێکی هەبوو ناوی ئیسماعیل بوو، پیاوێکی چاك و دەست بەخێر بوو، زەوییەکی هەبوو بەخشی بە گۆڕستانی گوندەکە، ئێستا لە ژیاندا نەماوە و خوای گەورە لێی خۆش بووبێت.

٢ - عەبدولقادر حامید عەبدوڵڵا (مەلا عەول قادر):-

بەرنوێژی دەکرد و بانگی دەدا و خزمەتی مزگەوتی دەکرد، کاتێك مزگەوتەکە ڕوخێنرا و فراوان کرا زەوییەکی هەبوو پێشکەشی کرد بە مزگەوتەکە، پیاوێکی خێرخواز و قورئان خوێن بوو.

٣ - حاجی برایم:-

خزمەتی مزگەوتی دەکرد و بانگی دەدا و پیاوێکی میوان دۆست بوو.

**٤ - محەمەد حەمەئەمین مارف:-**

**بانگی دەدا و خزمەتی مزگەوتی دەکرد و پیاوێکی سەخی تەبیعەت بوو، قسەی خۆش بوو هاوڕێیەکی خۆشەویستم بوو، پیاوێکی دڵساف و خۆشەویست بوو.**

**٥ - محەمەد عەلی حسەین (حاجی محەمەد)**

**بانگی دەدا و خزمەتی مزگەوتی دەکرد و پیاوێکی بە تەقوا بوو، ئاکار جوان و کەسایەتییەکی بەرزی هەبوو.**



**محەمەد حەمەئەمین**



**عەبدولقادر حامید**



**مەلا مەحمود میران**

## شەڕی تونەیلی دەربەندیخان. ساڵی (١٩٦١)

عبدولکەریم قاسم بە هاوکاری شیوعییەکان دەستی کرد بە چاکسازی لە کوردستان وەك دروستکردنی قوتابخانە، نەخۆشخانە، ڕێگاوبان ئەوەی زۆر گرنگبوو دەستی دابووە چاکسازی لە زەوی و زاردا بۆ ئەمەش زۆر کۆسپی هاتە ڕێ. تاقمێك لە سەرۆك هۆز و شێخ و پیاوە دەسترۆیشتووەکانی ناوچەکە تونەیلی دەربەندیخانانیان گرت، تا نەهێڵن سوپای عێراق لە دەربەندیخانەوە بەرەو سلەیمانی بڕوات. لەنێو خەڵکدا وایان بڵاوکردەوە هەرکەسێك تفەنگی هەبێت و نەیەت لەگەڵماندا تووشی لێپرسینەوە دەبێت، مەحموودی خاڵە فەتاحم تفەنگێکی برنەوی هەبوو، لەشانم کرد و بێ ئەوەی ناوەڕۆك و ئامانجی ئەو شەڕە بزانم کەوتمە شوێنیان. شیوعییەکان ئەم بۆچوونەی خەڵکیان بەدڵ نەبوو، بۆیە هەوڵێکی زۆریان دا بۆ ئەوەی ڕێگری لەو بۆچوونەی خەڵك بکەن.

بۆ ڕێگریکردن لە هەڵگیرسانی شەڕ مامۆستا برایم ئەحمەدیش هاتە دەربەندیخان و لە کۆبوونەوەیەکی جەماوەریدا داوای کرد جارێ زووە بۆ دەستپێکردنی شۆڕشی چەکداری، با مۆڵەت بدەین بە عبدولکەریم قاسم چاکسازییەکانی بکات و ئێمەش هاوکاری دەبین بۆ ئەوەی وڵاتەکەمان لە ڕووی ئابووری و ڕۆشنبیری و خوێندنەوە ببوژێتەوە، هەرکات عبدولکەریم قاسم دژی داخوازییەکانمان وەستایەوە ئەوکات ئێمەش بەچەك وەڵامی دەدەینەوە.

لەبەر ئەوەی گوندی سیارە لە نێوجەرگەی شەڕەکەدا بوو، بەشێکی پێداویستیەکانی شەڕ لەلایەن گوندەکەی ئێمەوە دابین دەکرا، بەشێکیش لەوانەی کە هەڵسوڕێنەری شەڕەکە بوون لەگەڵ خەڵکی گوندەکەدا خزمایەتیان هەبوو.

ئەو کەسانەی کە لە گوندی سیارە هاوکارییان کردن ئەمانە بوون؛

١ – مەولود قادر عزیز

٢ – توفیق قادر مستەفا

٣ – ساڵح حسین خواکەرەم

٤ – علی پیراوەسی محەمەد

٥ – مەحمود رەحمان سمایل

٦ – مەحمود فتاح سمایل

سۆفی سابیر ڕۆستەم لە عازەبانەوە بە تفەنگی خۆیەوە هاتبوو لە شەڕەکەدا بەشدار بوو، بەڵام دواجار حکومەت هێرشی هێنا و چەند تۆپێکی تەقاند و هێزی عەشایەر بەرگەیان نەگرت و پاشەکشەیان کرد.

وەك باسم کرد شیوعییەکان زۆریان پێناخۆش بوو هەوڵێکی زۆریان دا بۆ ئەوەی خەڵکی دوای هێزی عەشایەری نەکەوێت، داواکەشیان ڕەوا بوو، چونکە حکومەتی عەبدولکەریم قاسم دەستی دابووە چاکسازی و بۆ یەکەمجار میللەت هەستی دەکرد کە حکومەت هەیە و خەمی دەخوات.

شیوعیەکان زۆریان پێخۆشبوو کە هێزی عەشایەر بەرگەی شەڕەکەی نەگرت، لە کاتی شەڕەکەدا فڕۆکەش بە ئاسمانەوە سوڕابووەوە، شیوعییەکان لەنێو خەڵکدا بڵاویان کردبووەوە کە فڕۆکەکان وێنەی شەڕەکەیان گرتووە و هەرکەسێ بەشدار بووبێت لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت. هەندێ کەس باوەڕیان بەم پڕوپاگەندە کردبوو و لەنێو خەڵکیدا پاکانەیان لەخۆیان کردبوو.

ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیە بە (کەوا شۆڕ) ناسرا، چونکە زۆربەی چەکدارەکان کەوا و سەڵتەیان لەبەردابوو. پاشان منیش گەڕامەوە بۆ گوندەکەی خۆمان و دەستم کردەوە بە ئیش و کاری ڕۆژانە.

## دەروێشی

لـە کوردسـتاندا دوو تەریقـەت هـەبوو، تەریقـەتی قـادری و تەریقـەتی نەقشبەندی. ئەوانەی سەر بە تەریقەتی قادری بوون پێیان دەگوترا دەروێش، پرچیان دەهێشـتەوە و ڕیشـیان دەتاشـی، شێخەکانیشـیان (تەکیـە)ی هـەبوو. ئەو کەسانەیشی سەر بـە تەریقەتی نەقشبەندی بـوون پێیـان دەگـوترا سۆفی، ئەمانیش ڕیشێکی قەڵەمییان دەهێشتەوە و شێخەکانیان (خانەقا)یان هەبوو.

شێخ تـەها لە سیارە تەکیـەی هەبوو، دوانزە مانگەکەی ساڵ تەکیەکەی ئاوەدان بوو، لە هەموو شوێنێکەوە زیارەتکاران سەردانیان دەکرد، بەتایبـەتی لـە کوردسـتانی ڕۆژهەڵاتـەوە. کاتێـك کـە بـاری کـرد بـۆ سـلێمانی هەمیشـە سـەردانی سیارەی دەکـرد و لەگـەڵ دەروێشـەکانیدا پەیوەنـدی هەبوو، منـیش چەند جارێك لەگەڵ دەستە و دایەرەکەیدا هاوەڵیان دەبووم.

لـە دوو وەرزدا دەچـووین بەسـەر دێهاتەکانـدا دەگـەڕاین، لـە ناوەڕاسـتی بەهار و لە سەرەتای پایزدا. شێخ سەردانی ئەو دێهاتانەی دەکـرد کە دەروێشی خـۆی بـوون، دەچـووینە هەرگونـدێك لـە ماڵێـك خـواردن دروسـت دەکـرا و مەسـرەفەکەش گـران بـوو بـە هـەموو کـەس نـەدەکرا. پاشـان لـە شـوێنێکی بەرفراوانـدا کـۆڕی زیکـر دەگـیرا، دوو دەروێـش کـە شـارەزاییەکی باشـیان هەبووایە لە دەف و تەپڵ لێدان دەستیان پێ دەکرد، سـەرەتا بـە خاوی تـەپڵ و دەف لێدان دەستی پێ دەکـرد و وردە وردە خێرایـان دەکـرد و دەروێشـەکانیش ڕیتمـی جوڵاندنەوەکـەیان زیـاتر دەبـوو، تـا دەهـات خێتراتـر دەبـوو، جـاری وا هـەبوو کـۆڕی زیکـر هێنـدە گـەرم دەبـوو حەماسـەتی دەروێشـەکانیش بـۆ

شێخەکە زیاتر دەبوو. لە دوای کۆڕی زیکر دەروێشێکی دەنگ خۆش سۆزێکی شێخانەی دەکرد، کە وشەکانی زیاتر پیاهەڵدان بوو بۆ شێخەکەی، ئەوەندە بە دەنگێکی خۆش سۆزی دەکرد هەستی کۆڕەکەی دەبزواند.

هەرکەس کە دەبوو بە دەروێش دەهاتە بەردەمی شێخ و دەستی لە نێو دەستی دەناو شێخیش پێی دەگوت، (بڵێ خودایە تۆبە بێت لەو گوناهانەی کردوومە، پشت بە خودای گەورەو و هیمەتی پێغەمبەر (د.خ) دووبارەی ناکەمەوە. پەیمان بێت نوێژ بکەم و ڕۆژوو بگرم و فەرزەکانی دیکەش ئەنجام بدەم و حەرام نەخۆم و درۆ نەکەم. لەکاتی زیکردا کە شمشێر لە خۆت ئەدەیت ناوی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و شێخ سمایلی ولیانی بهێنە). ئیتر ئەو کەسە دەبوو بە دەروێش.

دەروێش دەبوو لەگەڵ کاروانی شێخدا هاوەڵ بوایە و دەبوو دەست و دەم پاك و ڕەوشتی جوان بوایە و ئەمانەت پارێز بوایە و خەڵکی دیکەی هان بدایە بۆ بوون بە دەروێش. دەروێش زەکاتی خۆی و هەرکەسێکی دیکە کە پێ ڕابگایە لە گەنم و جۆ و ئاژەڵ، کۆی دەکردەوە و دەیهێنا بۆ تەکیە. هەر دەروێشێك زیرەك بوایە و زیاتر خاڵەکانی دەروێشیی جێبەجێ بکردایە و لە شێخەوە زیاتر نزیك بوایە دەبوو بە خەلیفە، شێخ تەها ساڵی جارێك یان دووجار لەگەڵ دەروێشەکانی سەفەری ڕۆژهەڵاتی کوردستانیان دەکرد و بە مانگ نەدەهاتەوە. هەرکاتێکیش خۆی نەچووایە دەروێشەکانی دەهاتن و سەردانیان دەکرد.

## ترازیدیا و کۆمەڵکوژی

لە دوای شەڕی توونەیلەکە نێوانی پارتی دیموکرات و حکومەتی عێراق ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو خراپی دەچوو، حکومەتی عێراق دەستی کرد بە هێرشکردن بۆ سەر کوردستان، بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشەکە کە بە شۆڕشی ئەیلول ناسراوە، ئەوەی لە توانایدا بوو بەکاری هێنا.

حکومەتی بەغدا بە درندەترین شێوە پەلاماری کوردستان و شۆڕشەکەیان دا. بەتایبەتی لیوای بیست کە فەرماندەکەیان زەعیم سدیق مستەفا بوو، عەرەبێکی شۆڤێنی ڕەگەزپەرست بوو، تۆڵەی بەزین و تێکشکاندنەکانی سوپای عێراقی لە خەڵکی مەدەنی و بێتاوان و گوندنشینان دەکردەوە. یەکێك لەو تاوانە گەورانەی کە ئەنجامی دا لە سیارە بوو، هۆلاکۆ ئاسا بە هەرکوێیەکدا کاروانە سەربازییەکەی تێپەڕی دەکرد لافاوی خوێن و کاولکاری بەدوای خۆیدا بە دیاری بۆ خەڵکەکی جێدەهێڵا، زۆر باسی ئەم خوێنڕێژییە کراوە و زۆریش لەسەر تاوانەکانی نوسراوە، بۆیە لێرەدا ئەوەندەی پەیوەندی بە گوندەکەی ئێمەوە هەیە و لە نزیکەوە لێی ئاگادارم لەم یادەوەرییەدا تۆماری دەکەم.

### زەعیم صدیق کێیە

ناوی سدیق موستەفایە و خەڵکی موسڵە، فەرماندەی لیوای (٥) بووە، پاشان بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشی کورد کراوە بە فەرماندەی لیوای (٢٠). لیواکەی زەعیم سدیق بەشداری شەڕی عەرەب – ئیسرایلی کردووە و بە فەخری سوپای عێراق ناسراوە. پێش ئەوەی شۆڕشی (١٩٥٨) لە دژی مەلیکایەتی ئەنجام بدرێت، بە ڕوتبەی (مقدم) یاریدەدەری فەرماندەی فەوجی (٣) بووە، کە ئەو کات عەبدولسەلام عارف (مقدم ڕوکن) بووە و

فەرماندەی فەوجی (٣) بووە کە سەر بە لیوای (١٩) بووە لە جەلەولا، کە فەرماندەی لیواکەیان عەبدولکریم قاسم بووە و مەقەڕی لیواکەش لە شارەبان بووە.

زەعیم سدیق زۆر ڕەگەزپەرست بووە، لە ساڵی (١٩٥٦) کاتێک دکتۆر مستەفا زەڵمی ئیمامی فەوجی (٣) بووە کە زەعیم صدیق یاریدەدەری فەوج بووە[١]، پێی دەڵێت بۆچی پێغەمبەران بە زۆری لە نێو عەرەبدا هەڵکەوتوون؟ دکتۆر لە وەڵامدا دەڵێت لەبەر ئەوەی عەرەب لە ناوەڕاستی جیهاندایە و دینەکە زۆر زووتر بڵاودەبێتەوە. زەعیم سدیق دەڵێت وا نیە. خودای گەورە دەڵێت ئەگەر گەلی عەرەبم بۆ چاك بکرێت، هەموو گەلانی دیکە چاککردنیان ئاسانە.

---

[١] کاروانی ژیانم. نووسینی د. مستەفا زەڵمی.

### ئەو ماڵانەی پێش ڕووداوەکە لە گوندەکەدا بوون.

ئەو ماڵانەی لە ساڵی (١٩٦٣) لە سیارەدا بوون، ئەوانەی کە ماڵ بوون و سەرۆك خێزان بوون و ژنیان هێناوە یا بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان سەرۆك خێزان بوون، ئەوەی بۆم ساغ بوویەوە ئەم ماڵانە بوون، کە ژمارەیان (٦٩) ماڵە، کە بریتین لەم کەسایەتییانە:

١ – عەلی حسین خواکەرەم

٢ – ساڵح حسین خواکەرەم

٣ – فەرەج پیروەیس ئەحمەد

٤ – عەبدولقادر پیروەیس ئەحمەد

٥ – ساڵح پیروەیس ئەحمەد

٦ – عەلی پیروەیس ئەحمەد

٧ – کریم پیر وەیس ئەحمەد

٨ – سەلیم ئەحمەد ڕۆستەم

٩ – سەعید ئەحمەد ڕۆستەم

١٠ – ئەحمەد قادر مستەفا

١١ – عەلی ئەحمەد عەلی

١٢ – ساڵح ئەحمەد علی

١٣ – حمەئەمین مارف ئەحمەد

١٤ – حەمەخان علی حمەئەمین

١٥ – حمەئەمین حمەخان عەلی

١٦ – قادر فتاح ڕەحمان

١٧ – مەحمود فتاح ڕەحمان

١٨ – ئەحمەد فتاح ڕەحمان

١٩ – عزيز كريم مەحمود

٢٠ – ئەحمەد مارف وەسمان

٢١ – ئەمين مارف وەسمان

٢٢ – ئەحمەد كەريم مەحمود

٢٣ – فەتاح ڕەحمان سمايل

٢٤ – ئەمين خەسرەو ئەحمەد

٢٥ – مەولود ڕەحمان حمەئەلياس

٢٦ – عەبدولقادر مەولود ڕەحمان

٢٧ – مەحمود ميران سمايل

٢٨ – محەمەد ميران سمايل

٢٩ – فەرەج عەلى ئەمين

٣٠ – عەبدولقادر حامد عەبدوڵڵا

٣١ – عەبدوڵڵا عەبدولقادر حاميد

٣٢ – كاكەبرا سەيد محەمەد

٣٣ – فەرەج حەمەئەمين قادر

٣٤ – مەحمود محەمەد ڕەزا

٣٥ – عەلى حمەمراد ڕۆستەم

٣٦ – زۆراب ڕۆستەم ڕەزا

٣٧ – حەمە مراد ڕۆستەم ڕەزا

٣٨ – محەمەد على فارس

٣٩ – حسن على فارس

٤٠ – ساڵح عەلى فارس، لەگەڵ دايك و برايەكى پێكەوە بوون

٤١ – حسين على فارس

٤٢ – ئەسعەد عەلى فارس

٤٣ – عزيز برايم محەمەد

٤٤ – مەولود قادر عەزيز

٤٥ – قادر حمەئەمين ڕەحمان

٤٦ – حسين فتاح ڕەحمان

٤٧ – ئەحمەد ڕۆستەم ئەمين

٤٨ – نادر ئەحمەد عەبدوڵڵا

٤٩ – كەريم ئەحمەد عەبدوڵڵا

٥٠ – محەمەد ئەحمەد عەبدوڵڵا

٥١ – تۆفيق قادر مستەفا

٥٢ – كەريم عەلى حسەين

٥٣ – مەحمود پيروەيس ئەحمەد

٥٤ – عەبدوڵڵا ميران سمايل

٥٥ – ئەحمەد ميران سمايل

٥٦ – حسن محەمەد قادر

٥٧ – مەحمود ڕەحمان سمايل

٥٨ – ڕەسوڵ مەحمود ڕەحمان

٥٩ – قادر ساڵح عەلى

٦٠ – مەحمود ساڵح عەلى

٦١ – محەمەد فەرەج عەلى

٦٢ – جەمين محەمەد ئەحمەد

٦٣ – برايم محەمەد ئەحمەد

٦٤ – عەبدولقادر محەمەد ئەحمەد

٦٥ – تۆفیق زۆراب ئەمین

٦٦ – سابیر تۆفیق قادر

٦٧ – عەلی رەسوڵ قادر

٦٨ – محەمەد مەحمود داود

٦٩ – مەحمود کریم قادر

## چالاکییەکی ئەوسەردەمە

سەرەتای ساڵی (١٩٦٣) پەلێك پێشمەرگە بە فەرماندەیی حەمە شەمێرانی و کەریم ئیمامی کە ژمارەیان (١٦) چەکدار بوون، دێنە گوندی سیارە و شەو لە گوندەکەدا دەمێننەوە، بۆ ڕۆژی دواتر بەیانیەکەی لەسەر جادەی دەربەندیخان – سلەیمانی نزیك گوندی سیارە بۆسەیەك دادەنێن و کاروانێکی سوپای عێراق دەکەوێتە بۆسەکەوە و لێیان دێنەدەست و تەفروتوونایان دەکەن، دوای ئەوەی پێشمەرگەیەکیان شەهید دەبێت، کە کوڕی حاجی ئەحمەدە و خەڵکی گوندی حاجی لەری گەرمیانە، پێشمەرگەکان لە ناوچەکە دەکشێنەوە. سەربازێکی پلەدار بە برینداری دەربازی دەبێت و خۆی دەگەیەنێتە گوندی بیرکێ، کە نزیکەی (٤) کم لە شەڕەکەوە دوورە. خەڵکی گوندەکە ڕێزی لێ دەگرن و برینەکەی تیمار دەکەن و ڕەوانەی دەربەندیخانی دەکەنەوە، سوپا لە بەرامبەر ئەو چاکەیەی خەڵکی بیرکێ، کە بەرامبەر سەربازەکە کردوویانە لە شەڕ و سوتاندن ڕزگاریان دەبێت، هەرچەندە خۆشیان خەمیان خواردبوو و شوێنی شەڕەکەش لەوانەوە دورتر

بوو، چونکە خەڵك درندەیی زەعیم سدیقی بیستبوو، کە لەهەر کوێیەك سوپاکەی لێی بدرایە گوندەکانی دەوروبەری دەسووتاند.

فەرەج عەلی ئەمین موختاری سیارە بوو. لەو کاتەدا گوندەکە شەست و نۆ ماڵی تێدابوو. ڕاوێژ بە خەڵکەکە دەکات کە خەمێك لە خۆیان و گوندەکە بخۆن، بۆ ئەوەی گوندەکەیان لە سووتاندن بپارێزن. بۆ ئەم مەبەستە ساڵح حسەین خواکەرەم و عەلی ڕەحمان حەمەئەمین دەچن بۆ دەربەندیخان بۆ لای ئامر حامییەی سوپای عێراق، کە پێی بڵێن ئەوان بێتاوانن و ئەویش ناگای لە گوندەکە و خەڵکی گوندەکەیان بێت. ئەفسەرەکە، ڕێزیان لێ دەگرێت و دڵنیایان دەکاتەوە کە بێخەم بن و لەلایەن سوپای عێراقەوە هیچ دەستدرێژییەك ناکرێتە سەریان و بڕۆنە سەر ئیش و کاری خۆیان، بەڵام موختاری گوند بەم قسانە دڵی بڕوایی نادات و جارێکی دیکە داوا لە خەڵکەکە دەکات خەمێکی دیکە بخۆن. بۆ ئەمە بە چاکی دەزانێت کە بچن بۆ سلەیمانی و لە ڕێگەی شێخ قادری شێخ تەها کە چەندین ساڵ لە سیارە بووە و لە ڕێگەی ئەوەوە بچن بۆلای شێخ لەتیفی شێخ مەحموودی مەلیك، کە لای زەعیم سدیق تکایان بۆ بکات. بۆ ئەم مەبەستە حاجی محەمەدی عەلی حسەین کە گەنجێکی بە ئاگاو وریا بووە پێکەوە دەچن بۆ سلێمانی و لەگەڵ شێخ قادردا دەچن بۆ ماڵی شێخ لەتیف. ئەویش زۆر ڕێزیان لێ دەگرێت و خۆی بە قەرزاریان دەزانێت، کە کاتی خۆی هاتووە بۆ سیارە بۆ ڕاو، خەڵکەکەی زۆر هاوکارییان کردووە. پێیان دەڵێ هەرچەند زەعیم سدیق پیاوێکی زاڵمە بەڵام ئەگەر لە کەرکوکەوە بێتەوە، دەچمە لای و داوای لێ دەکەم کە پارێزراو بن، بەڵام ئەگەر لە جەلەولاوە بێتەوە من دەستم پێی ناگات.

ئـەو کاتـەی ئـەوان سـەردانی شـێخ لـەتیف دەکـەن، پێشـتر یـەکێك لـە پیاوەکـانی بـەناوی شـێخ ڕەشـید بـۆ هـەواڵ و دەنگوبـاس چـووەتە بـازار، لـەو کاتـەدا کـە لـە بـازاڕ دەگەڕێتـەوە هێشـتا موختـار و حـاجی محەمـەد لای شـێخ لـەتیف دانیشـتوون. شـێخ پرسـیاری بـازاڕی لـێ دەکـات لـە وەڵامـدا دەڵـێ دەنگوباس وا بڵاوە دەڵێن زەعیم سدیق لە جەلەولاوە گەڕاوەتەوە و لەم دیوو دەربەندیخانەوە لە گوندێك کە سیارەی ناوە ئەوەی پیاو بووە ڕەمی کردووە، دیـارە هەواڵهێنەرەکـەی شـێخ نـەیزانیبوو ئەوانـەی لەگـەڵ شـێخ بـوون خـەڵکی گوندی سیارەن.



عەبدوڵڵا کاکەبرا، محەمەد عەلی حسەین، مام دەروێش

٢٠١٧

## ڕۆژی ڕوودانی کارەسات

ئـەو ڕۆژەی ڕووداوەکـە ڕوویـدا بەیانییەکـەی زوو دوای مـەلا بانگـدان بارێك گەنمم بـرد بۆ ئەحمەد بڕنـدە بـۆ مـاڵی فـاتمی خوشکم، کە خێزانـی عـەلی حـەلاو بـوو. لـە گەڕانەوەمـدا لـە نێـوان عازەبـان و سـیارەدا بـووم، کـە چـەمێکی قوڵـە، چـەند گوللـە هاوەنێـك نـزیکی مـن تەقییـەوە، منـیش خـۆم مەڵاسدا هەتا تەقوتۆق نەما. بۆ ئێوارەکەی گەڕامەوە نێو گوند.

سوپاکە لـە دوای نیـوەڕۆوە هاتبوونـە نێـو گوندەکە، پێشـتر مـاوەی چـەند کاتژمێرێك لەسەر جادەی قیر وەستابوون. خەڵك سوپاکەیان بینیبوو، بەڵام گوندەکەیان چۆڵ نەکردبوو، بەخەیاڵیاندا نەهاتبوو بیانکوژن، چونکە پێشـتر ڕووداوی وەهـا ڕووی نـەدابوو، سـیارە یەکـەم گونـد بـوو کـە بـەو شـێوەیە کۆمەڵکوژی تیا ئەنجام بدرێت. پێش ئەو ڕووداوە سوپا دەچووە هەرگوندێك گوندەکـەی دەسـوتاند و دوای ڕۆشـتنی سـوپاکە خەڵکەکـە ئاگرەکـەی دەکوژانـدەوە، ئەمـە لەلایـەك، لەلایـەکی دیکەشـەوە خەڵکەکـە دەسـتخەڕۆی بەڵێنی فەوجە سەربازییەکەی دەربەندیخان بووبوون و نوێنەری گوندەکە لە سلێمانی بوون. لەو کاتەدا هەموو ئەمانە پاڵنەری ئەوە بوون لە ماڵەکانیاندا بمێننەوە.

دوای ڕووداوەکـەی سـیارە دێهاتـەکانی دیکـە خـەمیان خـوارد و هـەر مەترسییەك لەسەر گوندەکەیان هەبوایە بەخێرایی گوندەکەیان چۆڵ دەکرد، بۆ نمونە کە گونـدی عازەبانیـان سـوتاند خەڵکەکەی چۆڵیان کردبـوو. سیارە یەکـەم شـوێن بـوو دەسـتی پیسـی زەعـیم سـدیقی پێگەیشـت و ڕقی پیسـی شۆڤێنیانەی بەسەر خەڵکە بێتاوانەکەیدا ڕژاند.

کارەساتەکەش بـەم شـێوەیە دەسـتپێدەکات. لـەدوای ئەنجامـدانی چـەند ڕۆژێـکی کـەم لـە چـالاکی پێشـمەرگەکان لـە بەرەبـەیانی کۆتـایی مـانگی یـەکی ساڵی (١٩٦٣)، کە ڕێکـەوتی مـانگی ڕەمـەزان دەبێت، سوپاکەی زەعیم سدیق

لەسەر شەقامی سەرەکی دەربەندیخان - سلیمانی، لە ئاست گوندی سیارە سوپاکەیان دائەبەزن و بەسەر جادەکەدا بڵاو دەبنەوە. خەڵکەکە ترسابوون، بەڵام پێشتر وەعدیان پێدرابوو کە پارێزراون. عەبدولقادر حامید ئەو رۆژە لای ئاژەڵەکانی بووە، هەندێ لە ئاژەڵەکانی لە سەربازەکان نزیک دەبێتەوە و سەربازێك ئاژەڵەکانی بۆ دەگێڕێتەوە، کە لە عەبدولقادر نزیك دەبێتەوە بە عەرەبی پێی دەڵێت: (روح للجبل .. روح .. روح) چەند جارێك ئەم ڕستەیە دووبارە دەکاتەوە، وەك ویستبێتی پێی پڵێ سوپاکە نیازی خراپە پێدەچێت دەرفەت نەبووبێت زیاتر لە یەکدی نزیك ببنەوە.

چێشتەنگاوێکی درەنگ سوپا فەرمانیان بۆ دێت و دەڕژێنە ناو دێ و دەوروبەری دێ دەگرن و بە شێوەیەکی دڕندانە پەلاماری خەڵکی سڤیل دەدەن و شەلم کوێرم ناپارێزم بێ هیچ یاسا و ڕێسایەکی جەنگ، ئەوەی دەستیان کەوت گولەبارانیان کرد و چەند کەسێکی دیکەشیان بریندار کرد. بریندارەکان بە شێوازێك لەنێو خوێنی شەهیدەکاندا خەڵتانی خوێن بووبوون وایان دەزانی کوژراون. مەلا مەحمود، کوڕە منداڵەکەی کە ناوی سمایلە بە باوەشیەوە دەبێت، قورئانەکەی دەبات و بەرەو ڕووی ئەفسەرەکە لاپەڕەکانی دەکاتەوە و داوای لێ دەکات بیکات بە خاتری ئەو قورئانە کە کەلامی خوایە و خاتری مانگی ڕەمەزان وازیان لێ بهێنن و نەیانکوژن، پێیان دەڵێت ئێمە بێتاوانین و هیچ گوناهێکمان نیە و هەموومان نوێژ دەکەین و بە ڕۆژوین. ئەفسەرەکە فەرمان بە سەربازەکان دەکات گوللەبارانی بکەن. منداڵ بە سەلامەتی بە لایەکدا دەکەوێت و قورئانیش بەلایەکی دیکەدا دەکەوێت و مەلا مەحمودیش خەڵتانی خوێن دەبێت و بە سەختی بریندار دەبێت. ژنێك ناوی (عاسە)یە، مەلا مەحمود پێی دەڵێت عاسە من نەمردووم و خەمێکم بخۆن، سەربازەکە دەزانێ نەمردووە دەگەڕێتەوە سەری و چەند فیشەکێکی دیکەی پێوە دەنێت و

ئەمجارەیان مەلا مەحمود بارگەو بنەی بە یەکجاری بۆ بەهەشتی فیردەوس دەپێچێتەوە، بەمەش زەعیم سدیق و هاوکارەکانیشی دەچنە لاپەڕە ڕەشەکانی مێژووەوە و شەهیدەکانی سیارەش لە دڵی هەمووانـدا بـۆ هـەتا هەتایـە بـە زیندووی دەمێننەوە.

ساڵح پیروەیس پیاوێکی بەخۆ و بەهێز بوو پەلاماری سەربازێکی دابوو، کە تفەنگێکی کلاشینکۆفی تازەی پێبووە لێی سەندبوو. لەو سەردەمەدا ئەو چەکە تازە بووە و هەموو کەس لەو چەکەی نەدەزانی بۆیە ئەویش لەو چەکەی نەزانیوە و هەرچەند خەریك بووبوو نەیزانیبوو بەکاری بهێنێت و وەك بڕنەو میلی هێنابوویەوە. لەم سەروبەندەدا سەربازێکی دیکە تەقەی لێدەکات و شەهیدی دەکات.

ڕەمەزان مەحمود ڕەحمان کە هاوڵاتییەکی گوندەکەیە سەربازی سوپای عێراق بووە، لەو کاتەدا بە مۆڵەت گەڕاوەتەوە بۆ نێو گوند. ڕۆژی ڕووداوەکە مۆڵەتە سەربازییەکەی نیشانی سوپاکە دەدات و دەڵێت سەربازم و بە مۆڵەت گەڕاومەتەوە، بەڵام هەوڵەکەی بێسوود دەبێت و شەهیدی دەکەن. پاشان دەکەونە کوشتوبڕی خەڵکی گوندەکە و دوای کوشتارەکە ماڵەکانیش دەسوتێنن.

لە کۆتایدا نۆزدە پیاو شەهید دەکرێت و حەوتیش بریندار دەکرێت، کە دوانیان ئافرەت بوون، برینداربوونی ئافرەتەکان بەو هۆیەوە بووە کە خۆیان داوە بەسەر پیاوەکاندا بۆ ئەوەی نەیانکوژن، بەڵام ئەم هەوڵەیان نەبووەتە هۆی ڕزگارکردنی پیاوەکان چونکە سەربازەکان وازیان نەهێناوە تا پیاوەکانیان کوشتووە بەو هۆیەشەوە ئافرەتەکانیش گوللەیان بەرکەوتووە. تەمەنی ئەوانەی لەو کارەساتەدا شەهید کراون لە نێوان (١٩ بۆ ٧٠) ساڵی

بــووه. مــەولود ڕەحمــان و فــەتاح ڕەحمــان و عەبــدولقادر حەمەئــەمین بەتەمەنـەکانیان بـووە و ڕەمـەزان مـەحمود ڕەحمـان بچوکترینیان بـووە کـە تەمەنی (١٩) ساڵ بووە.

بەو شەوە خەڵکی عازەبان و چنارە و دێهاتەکانی ئەو ناوە شەهیدەکانیان لـە مزگەوتەکـەدا کۆکردبـووەوە چـونکە خەڵکەکـە لـە ترسـا بـە ڕۆژ خۆیـان شـاردووەتەوە و بەشـەو چـوون بـۆ خـەمخواردنی لاشـەی شـەهیدەکان و بریندارەکانیشیان ناردووە بۆ سلەیمانی. مەلا ساڵحی ژاڵە ناو چووبووە لای حکومەت و مۆڵەتی وەرگرتبوو، لەدوای نوێژی نیوەڕۆ بانگەوازی کردبوو بۆ خەڵکی دەربەندیخان کە کەس نەڕواتەوە و پێداویستی لەگەڵ خۆیان بهێنن و بچن بـۆ سیارە بـۆ ئەسپەردەکردنی شـەهیدەکان، چـونکە حکومـەت مۆڵـەتی چـەند کـاژێرێکی پێـدابوون و گوتبوویـان دوای ئـەوە ژیانیـان لـە مەترسـیدا دەبێت.

خەڵك بەحەماسەتەوە بە پیر بانگەوازەکەوە بەرەو سیارە دەچن، خەڵکی دێهاتـەکان و تایەفـەی گـەلاڵی هاوکارییـەکی باشـیان کـردووە، مامۆسـتا شێخ محەمەدی ئەحمەد بڕندەش لەگەڵ مامۆستا مەلا ساڵح فتوایان دابوو کەوا شـەهیدن، شـەهیدیش شـۆردن و کفنـی ناوێـت، تـەڵقینیان کردبـوون و بـە خـەڵکیان ڕاگەیانـدبوو بـەپێی شـەریعەتی ئیسـلام ئەمـە تـاوانێکی گەورەیـە و دوورە لە هەموو بەهایەکی ئیسلام و مرۆڤایەتی.

چەند ڕۆژێك دوای ڕووداوەکە پیاوێك بە ناوی شێخ حەمەئەمین شێخ عەبدوڵڵا چنارەیی، کە باوکی شێخ سەعید چنارەییە لە نزیك گوندی چنارە لەلایـەن سـوپاکەی زەعـیم سـدیقەوە بـەر دەسـترێژی گوللـە دەکـەوێت و بـە سەختی بریندار دەبێت و پاش چوار ڕۆژ شەهید دەبێت.

پاش کارەساتەکە خەڵکی سیارە بەماڵەوە ئاوارەی دێهاتەکانی دیکە و شارەزوور بوون، هەندێك لە خێزانەکان نەگەڕانەوە و نیشتەجێی ئالان و حاسڵ بوون و کاتێك زەوی دابەش کرا وەك هەموو جوتیارێکی دیکە زەوییان پێدرا.

ناوی شەهیدەکان:

| ز | ناوی شەهید | ناوی خێزان |
|---|---|---|
| ١ | مەحمود میران سمایل (مەلای گوند) | ١- ئامینە حاجی حەسەن<br>٢- بەهیە |
| ٢ | محەمەد میران سمایل | ١- تلێخا<br>٢- ئەمنە فەرەج مەحمود |
| ٣ | ڕەسوڵ مەحموود ڕەحمان | پیرۆز فەرەج |
| ٤ | ڕەمەزان مەحموود ڕەحمان | سەڵت |
| ٥ | قادر حەمەئەمین ڕەحمان | عەینە عەبدولقادر مەحمود |
| ٦ | ئەحمەد مارف وەسمان | خاوەر سۆفی عەزیز |
| ٧ | ئەمین مارف وەسمان | نازدار حامید عەبدولقادر |
| ٨ | غەفور فەرەج علی وەسمان | سەڵت |
| ٩ | عەبدولقادر حەمەئەمین وەسمان | ١- بەسە ئەحمەد<br>٢- خانم مارف<br>٣- خاتون محەمەد ئەحمەد |
| ١٠ | عەزیز کەریم مەحمود | بەیج محەمەد میرزا |
| ١١ | فەتاح ڕەحمان ڕەزا | ئەمنە حەمە ساڵح |
| ١٢ | حسەین فەتاح ڕەحمان | خاتون عەلی حسەین |
| ١٣ | ساڵح پیرەمیس محەمەد | بەهیە عارف بێسەلمێنی |
| ١٤ | کەریم پیرەمیس محەمەد | فاتمە ئەمین ئەڵڵاکەرەم |
| ١٥ | ئەمین خەسرەو ئەحمەد | سەلمە فەتاح ڕەحمان |
| ١٦ | ساڵح ئەحمەد عەلی | تەنکە حەمەئەمین مارف |
| ١٧ | مەولود ڕەحمان حەمە ئەلیاس | بەوزان شاومیش |
| ١٨ | فەرەج حەمەئەمین قادر | سەڵت |
| ١٩ | محەمەد ئەحمەد | بەسە حەمەئەمین |



ئارامگای شەهیدانی گوندی سیارە

ناوی بریندارەکان:

١ – عەلی زۆراب

٢ – قادر فەتاح ڕەحمان

٣ – مەحموود فەتاح ڕەحمان

٤ – تۆفیق قادر مستەفا

٥ – سابیر تۆفیق قادر

٦ – خاتوون عەلی حسەین

٧ – بەوزان شاوەیس

# قۆناغی دووەم

## پەیوەندیکردنم بە حیزبی شیوعییەوە

وەك پێشتر باسم کرد لە کۆمپانیا دامەزرام باری گوزەرانمان باش بوو، لەنێو کۆمپانیادا کادیرەکانی حیزبی شیوعی زۆر چالاك بوون و خەڵکی ناسراویش بوون، بەردەوام دەهاتنە نێو خەڵکی ڕەش و ڕووت و زەحمەتکێش و دروشمی جوان و بریقەدارییان بەگوێماندا دەدا. مەیلی چوونە ناویان لە دڵمدا چەکەرەی کرد، دواجار ساڵی (١٩٦٤) لە ڕێگەی سەید کەریمی عازەبان و شێخ ئەحمەدی شێخ عبدولکەریمی ئەحمەد برندە و فەقێ ئەحمەدەوە پەیوەندیم کرد بە ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعییەوە. بۆ منێك کە زۆر مەینەتیم بەدەست ژیانەوە چەشتبوو وەك ڕزگارکەرێك لەم نەهامەتییەم دەڕوانی، لە ڕاستیدا حزبی شیوعی ڕۆڵێکی ئەرێنیان بینی لە هوشیار کردنەوەی جەماوەر، بەتایبەتی کە زەوی و زار هەمووی هی خاوەن موڵك بوو و زەوییەکانیان بە نیوە کاری دەدا بە جوتیار و سەرانەیان لێوەردەگرتن و بێگاریان پێدەکردن.

مەلا ئەحمەدی بانی خێڵان مەلایەکی دوازدە عیلم بوو کوڕی مامۆستا مەلا قادری سۆفی بوو، کە کەسایەتییەکی ئاینیی و کۆمەڵایەتی ناوچەکە و لە ریزی پێشەوەی حیزبدا بوو، رۆڵێکی کاریگەریشی هەبوو لە رێکخستنی ریزەکانی حزبی شیوعیدا. بە بۆنەی مامۆستا مەلا ئەحمەدەوە، کە پیاوێکی ئاینیی بوو ئەوەندەی دیکە حیزب گەشەی کرد و چالاك بوو، شانەکانی رێکخستن لە چینی کرێکار و جوتیار زۆر تۆکمە بوو و دەستی هاریکارییان بۆ یەك درێژ دەکرد و بە کۆمەکی دژی ئەو کۆسپانە دەبوونەوە کە دەهاتە رێگەیان.

بۆ یەکەمجار لە ساڵی (١٩٦٤) پەیوەندیم بە ریزەکانی حیزبی شیوعیەوە کرد و کۆبۆنەوەی حیزبیم دەکرد و ئابوونەم دەدا و کارو چالاکیم بۆ دەکردن. زۆرجار رووبەرووی رەخنەی خەڵکی دەبوومەوە و دەیانپرسی دەروێش ساڵح تۆ چۆن نوێژ دەکەیت و رۆژو دەگریت و لە ریزەکانی حیزبی شیوعیدا کاردەکەیت؟ وایان لێك ئەدایەوە کە شیوعیەکان رێگری لە نوێژ و رۆژ و دەکەن. کەسێکی نەخوێندەوەری وەك من هیچ شتێکم دەربارەی بەرنامەی مارکس و لینین نەدەزانی، تا بزانم لەسەر ئاین و ئیسلام چی دەڵێت، ئەوەی بەلای منەوە جێگەی هەڵوەستەکردن و قبوڵکردن بوو ئەوەبوو ئەو کارنامەیەی لەو حیزبەدا کاری یەکەمیان کە من قەناعەتم پێ کردبوون ئەوەبوو کە ئەوان دژی دەرەبەگ و هاوشێوە موڵکدارە بازرگانەکانی وەك ئەوان بوون. لەو سەردەمەشدا لە (٨٥٪)ی زەوی هی دەرەبەگ بوو و ئەوان خاوەن موڵك بوون، یا ئیش و کاری دەوڵەت و بازرگانی و عەلافی و دوکان و بازاڕ هەمووی هی دەوڵەمەندەکان بوو و بە هەموو شێوەیەك خوێنی میللەتی رەش و رووتیان دەمژی و خەڵکیش بە نانە سکی و نیوەکاری کاریانان بۆ دەکردن، کارێکی قورس بەرامبەر کرێیەکی کەم وەك زەوی کێڵان یان لە شارەکان بەردەستیی بازرگان و عەلاف و خاوەن کارگە بچووکەکان.

بۆ نموونە کابرایەکی گوندنشین هەفتەیەکی پێدەچوو تا بارە خەڵوزێکی دەکرد، پاشان بە سواری وڵاخ دەیبرد بۆ هەڵەبجە یا بۆ سلێمانی و لەوێ دەیدا بە دوو ڕوپیە، دوای خەرجیی نانخواردن و و کرێی خان و کەلەیەك شەکر و یەك دوو مەتر خامی دەکڕی و بە هەناسەی سارد دەگەڕایەوە، بەڵام کابرای دوکاندار کە لە گوندنشینەکەی دەکڕیەوە دەیدا بە چوار ڕوپیە، بێ هیچ ماندووبوونێك دوو ڕوپیە خێری دەکرد. حیزبی شیوعی لە بەرنامەکەیاندا دەیانویست ئەم جۆرە ستەمانە نەهێڵێن و لە ڕەگەوە هەڵیکێشن و لەم جۆرە شتانەیان بە گوێی خەڵکیدا دەدا، ئەگەر حکومەت و دەسەڵات بگرنە دەست، زەوی بەسەر هەژارەکاندا دابەش دەکەن و چیتر ناهێڵێن بازرگانی چاوچنۆك یاری بە قوتی خەڵك بکات.

چینی زەحمەتکێش دەیانزانی کە شیوعیەت و ئیسلامبوون دوو شتی لێك جیاوازن، بەڵام ئەوەندە کوێرەوەریان چەشتبوو، ئەوەندە زوڵم و زۆریان بینیبوو بە هانای بانگەوازەکەی حیزبی شیوعیەوە ڕۆیشتن و خۆیان ڕێکخست.

بە شێخ تەهایان گوتبوو دەروێشساڵح چووەتە ڕیزی ڕێکخستنەکانی حزبی شیوعییەوە، ئەویش لە وەڵامدا گوتبووی دەروێش ساڵح چاکی کردووە چووەتە نێو حیزبی شیوعییەوە، بەڵام باشتر وایە نەچێتە سەر پەیڕە و پرۆگرامە فکرییەکەیان. شێخ قادر کوڕە گەورەی شێخ تەها لە ڕیزەکانی حیزبی شیوعیدا ئەندامێکی چالاك بوو، شێخ تەها خۆیشی دژی حزبی شیوعی نەبوو، بەڵکو لایەنگری عبدالکریم قاسم بوو. دەیگوت پیاوێکی وەتەنییە ئەگەر کۆسپ و تەنگوچەڵەمە نەهێننە ڕێگەی خزمەتی میللەت دەکات، باوەڕی وابوو عبدالکریم قاسم لە بەعسیەکان و عبدالسلام عارف باشترە. هەرچەندە شێخ تەها و کوڕەکانی تا ڕادەیکی باش ژیانێکی خۆشتریان لە چاو

خەڵکی دیکە بەسەر دەبرد، بەڵام هەمیشە ئەوەندەی بۆیان کرابێت هاوخەمی خەڵکی هەژار بوون و بە تەنگ کێشەکانیانەوە بوون.

مەسەلەی دیانەت شتێك بووە هیچ یەکێك لە حیزبە سیاسییەکانی عێراق بە گشتی و کوردستان بەتایبەتی هەرگیز لەبارەیەوە دژایەتی خۆیانیان دەرنەبڕیوە، چونکە زانیویانە ئەم مەسەلەیە لای خەڵکیی بەهەند وەرگیراوە. من بۆ خۆم بۆ یەکەمجار لە ناو ڕیزەکانی حیزبی شیوعیدا کارم کردووە لە دوایدا لە ناو پارتی دیموکراتی کوردستان و دواجاریش لە ناو کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بە ڕابەرایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، هەرگیز نەبووە و ڕووینەداوە بۆ جارێکیش بێت ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ ڕێگریم لێ کرابێت بۆ نوێژکردن یا بووبنە لەمپەر لە بەردەممدا بۆ پەیڕەویکردنی نەریتەکانی ئیسلام. جاروبار لە لایەن هەندێ هاوڕێ و برادەرەوە بە ئەدەبەوە پێیان دەگوتم تۆ چۆن نوێژ دەکەیت و لەنێو حیزبێکی عەلمانیدایت؟ هەمیشە وەڵامم ئەوەبوو دەمگوت دینەکەم بۆ دنیایەکی دیکەیە، بەڵام سیاسەتەکەم بۆ ئەم دنیایەیە و بۆ کێشەی میللەت و نەتەوەکەمە. خۆ ئەگەر بەرنامەکەی ئیسلامیش وەك خۆی جێبەجێ بکرایە هەموو کەس مافی خۆی وەردەگرت و بە ئاسوودەیی دەژیا. بۆیە دەبێت ئەوە بزانین تا چەند بەرنامەو پەیڕەوپرۆگرامت باش و بەهێز بێت گەر وەك خۆی لەسەر زەوی جێبەجێ نەکرێت هیچ بەهایەکی نابێت.

ساڵی (١٩٧٢) لە شۆڕشی ئەیلولدا پێشمەرگە بووم و فەرماندەی مەفرەزە بووم. ئەو کات بارەگامان لە سێوسێنان بوو، ڕۆژێکیان بۆ کارێك چووینە گوندی عەلیاوا لە قەرەداغ، عیزەدینی مەلا سلێمان و واحیدە خڕە لێپرسراومان بوو، لە مانگی ڕەمەزاندا لە ماڵێك خواردنمان بۆ کرابوو تا بڕۆین لەوێ نان بخۆین، بەڵام لەبەر ئەوەی من بە ڕۆژوو بووم نەچووم بۆ

ماڵەکە و گوتم ئەچم بۆ مزگەوت بۆ ئەوەی نوێژەکەم بکەم و پشوویەك بدەم. عیزەدین و واحید زۆر داوایان لێکردم ڕۆژووەکە بشکێنم و لەگەڵیان نان بخۆم گوتیان ئەو هەموو خواردنە دروستکراوە و وەرە لەگەڵمان بخۆ. گوتم ئەو خواردنە لەو دنیا دەخۆم. گوتیان بە کەیفی خۆت (بە تەنزەوە) گوتیان بەس لەوەی ئەو دنیا تۆ بەشمان بدە. منیش گوتم نابێ لە هەردوو سفرەکە بخۆیت، دەبێت لە سفرەیەکیان بخۆیت یان ئەوەی ئێستا یان ئەوەی ئەو دنیا، بەڵام ئەوەی ئەو دنیا خۆشتر و بەتامترە و نەبڕاوەیە. بیرکردنەوەی ئەوان وابوو هی منیش وابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ئیش و کار و ئەرکی ڕۆژانەی پێشمەرگایەتیدا لەبەر ئەوەی بەڕۆژوو بووم یارمەتیان دەدام.

ئەگەر لەو کاتەدا مەلاکان یا هەرکەسێکی ئاینی بە ناوی دینەوە بزوتنەوەیەکی دروست بکردایە و دژی ئەو هەموو نەهامەتیەی بەسەر خەڵکی هەژاردا هاتووە ڕاپەڕیبایە و بە دەنگی بەرز بیانگوتایە مرۆڤ بە ئازادی لەدایکبووە و دەبێت بە ئازادی بژێت و نابێت کابرایەك هەزارەها دۆنم زەوی هەبێت و ئاو و کانی و چەم و دارستانەکان بۆ خۆی پاوان بکات و خەڵك بەنیوەیی کاریان بۆ بکات، من یەکەم کەس دەبووم کە دەبوومە کەواسوری بەر لەشکر و پاڵپشتیان دەبووم و بەرگریم لێ دەکردن، بەڵام هەندێك لە پیاوانی ئاینیی لەو ڕوداوانە بێدەنگ بوون یان بە شێوەیك لە شێوەکان شەریکی خاوەن موڵك بوون.

کاتێك لە نێو کۆمەڵەدا بووم لە سەرەتاوە بە شێوازێك پەروەردە دەکراین لە نێو جەماوەردا بووبووینە جێگەی ئاواتیان بە تایبەتی خەڵکی زەحمەتکێش و چینی هەژار، بەڵام لەم وڵاتەی ئێمەدا سروشتی مرۆڤ و حیزبەکان وەهایە کاتێك گەشتنە دەسەڵات بە شێوازێکی تر ڕەفتار دەکەن جیاواز لەو پەیرەو و پرۆگرامەی لە سەرەتا و کاتی شۆڕشەکەیاندا پروپاگەندەی بۆ دەکەن.

## چەك هەڵگرتن و شەڕی بانی خێڵان

ساڵی (١٩٦٥) بڕیاری چەك هەڵگرتنم دا لە ناو ڕیزەکانی حیزبی شیوعی عێراقدا، لە لقی (١٠) بووم بە پێشمەرگە کە پیاوێکی عەرەب ناوی سعید مەتەر بوو (ئەبو عەلی)یان پێدەگوت، سەر لق بوو. ماوەیەك بارەگایەکمان بردە گوندی کوێرەك و دەستمان کرد بە کار و چالاکی، زۆربەی کاتەکان ئەرکمان لەسەر ماڵی عەلە ڕەش بوو، خۆیشی پێشمەرگە بوو. دادە خانمی خێزانی زۆر خزمەتی دەکردین و ئەرکی زۆر گران بوو، ناچار هەر پێشمەرگەیەك ئیشێکی بۆ دیاری کرا، منیان دانا بۆ ئاوهێنان. لە کانی بە کونەیەکەوە ڕۆژانە ئاوم دەهێنا. ئەم کارە بۆ من زۆر ناڕەحەت بوو، چونکە شەرمم دەکرد بۆ پڕکردنی کونەکە دەبوایە بچمە کانی ژنان. لای هاوڕێیەکەم دەردەدڵی خۆمم کرد، ئەویش بەرنامەی بۆ دانام کە لەگەڵ دادەخانم بیکەم بە شەڕ. بە گوێم کرد و شەڕم نایەوە، بە دادە خانمم گوت لە وەکیلی مامە عەلەوە برۆ تەڵاقت کەوتبێ و لەم ماڵە برۆ دەرەوە. ئەویش کۆڵی پێچایەوە و بەرەو گوندی خۆیان (بانی بی)، کە کیلۆمەترێك دوورە لە گوندی کوێرەکەوە، کەوتەڕێ. لە ڕێگەدا توشی عەلە ڕەشی هاوسەری دەبێت و پرسیاری لێ دەکات خانم بۆ کوێ دەڕۆیت؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت دەروێش ساڵح لە وەکیلی تۆوە تەڵاقی داوم و دەڕۆمەوە بۆ ماڵ باوکم. عەلەڕەش لە حاڵەتەکە تێدەگات و پێی دەڵێت بگەڕێرەوە و دەروێش ساڵح ئاشت بکەرەوە.

ئەو سەردەمەی کە لە ڕیزی حزبی شیوعیدا پێشمەرگە بووم بەشداری چەند شەڕێکم کردووە. یەك لەوانە لەسەر جادەی سەرەکی دەربەندیخان باوەنوور لەنزیك گوندی بانی خێڵان. مەفرەزەییەکی حیزبی شیوعی بە

فەرماندەی مەلا ڕەئوف پەلاماری کاروانێکی مغاویری سوپای عێراقمان دا، کە فەرماندەکەیان تەها شکرچی بوو. زیانێکی زۆرمان لێدان و چەندین کوژرا و برینداریان هەبوو. هەندێك دەسکەوتمان هەبوو لە چەك و تەقەمەنی. پاشان لە دەربەندیخانەوە سوپای عێراق هات بەهانای هێزە شکست خواردووەکەیانەوە، بەڵام پێش ئەوەی بگەنە ناوچەی شەڕەکە لەو سوپایەشمان داو تێکمان شکاندن، لەو نەبەردییەدا پێشمەرگەیەك بە ناوی حمە کڵاو شەهید بوو. ساڵحی کوێخا عەزیز و پێشمەرگە بانی خێڵانییەکان لەو شەڕەدا دەورێکی کاریگەریان هەبوو.



مام دەروێش، خانم فەرەج محەممەد (خێزانی عەلە ڕەش)

٢٠١٨

## ئەحمەد برنده و کێشەی عەریف تالیب

ساڵی (١٩٦٥) حیزبی شیوعی و پارتی نێوانیان باش بوو، شیوعییەکان بە ئازادی چالاکی خۆیان دەکرد. حیزب بارەگایەکی لە گوندی ئەحمەد برندە دانا کە سەید کەریم و شێخ ئەحمەد لێپرسراوی بوون. مولازم شێخ تاهیری نێرگسەجاری ئەندامێکی چالاکی حیزب بوو، لە سلێمانییەوە چەند کارتۆنێ دەرمانی بۆ بارەگای حیزب ناردبوو. عەریف تالیب سەر لقی پارتی بوو، لە دووری (١٠٠) مەتر لە بارەگای شیوعییەکانەوە بارەگای دانابوو، کە زانی ئەو هەموو دەرمانە بۆ حیزب هاتووە، پێی ناخۆش بوو بۆیە کەوتبووە ئیفتیزاز کردنی شیوعییەکان و تەشقەڵەی پێ دەکردن، هەرچەندە ڕێککەوتن لە نێوان هەردوو حیزبدا هەبوو، بەڵام عەریف تالیب پێی ناخۆش بوو بارەگای شیوعییەکان کراوەتەوە و بیانوی پێ دەگرتن.

جارێکیان لە واجب دەگەڕامەوە بەرەو بارەگای خۆمان دەچووم، لە دوورەوە منی بینیبوو بە بە پێشمەرگەکانی گوتبوو بچن ئەو جاشە چەك بکەن. دوو سێ پێشمەرگە بەرەو ڕووم هاتن و گوتیان چەکەکەت دانێ، منیش چوومە پاڵ بەردێك و میلی تفەنگم لێ ڕاکێشا و سوێندم خوارد هەمووتان دەکوژم. عەریف تالیب هاواری لێ هەستا و گوتی سەید کریم فریاکەوە ئەو پێشمەرگەیە سەنگەری لێ گرتووین. کاك سەید کەریم گوتی حەق لای دەروێش ساڵحە، تۆ بە پێشمەرگەکان دەڵێیت ئەو جاشە چەك بکەن، دەزانی دەروێش پێشمەرگەیەکی قارەمانە و دوو مانگە لە واجبە و ئێستا گەڕاوەتەوە و کەس ناتوانێ چەکی لێ بسێنێت. ئیتر چۆن بڕیارێکی وا دەدەی. ئیتر کێشەکە بە کۆتا هات و چیتر عەریف تالیب بیانووی بە شوعییەکان نەدەگرت.

## کاری ڕێکخستن

شانبەشانی پێشمەرگایەتی لە کۆبوونەوەوە حیزبییەکانیشدا بەشدار دەبووم و ئابوونەی مانگانەم دەدا. زۆربەی کۆبوونەوەکان باسی فەلاح و کرێکار و چینی پرۆلیتاریان دەکرد، زۆربەی شیعارەکانیان سەرانسەری و عێراقیانە بوو، دەیانگوت با هەموو کرێکارانی جیهان یەك بگرن، بەڵام وڵاتی ئێمە ئەوەندە کارگەی تێدانەبوو تا ژمارەی کرێکارەکان ئەوەندە زۆر بێت بتوانن ڕەوتی ڕووداوەکان بگۆڕن. هەوڵی خۆڕۆشنبیرکردن یەکێك بوو لە کارە گرنگەکانیان، هەرگیز باسی نەتەوایەتی و کوردایەتیان نەدەکرد بە پێچەوانەوە هەستی نەتەوایەتی و کوردایەتیان لە دڵی جەماوەردا خامۆش دەکرد، لە نێو چینی جوتیاراندا زۆر گرنگییان بە بواری ڕۆشنبیری دەدا، بۆ یەکەمجار ئەوان ئەو بەستەڵەکەیان شکاند کە جوتیار بەرامبەر خاوەن موڵك بوەستێ و داوای مافی زەوتکراوی خۆی بکات، بەدنەدانی حیزب لە زۆر شوێن شەڕی چەکداری لە نێوان جوتیار و خاوەن موڵکدا ڕوویدا، هەندێك جار ئاریشەکان بە قازانجی جوتیار کۆتایی پێدەهات.

ئەوەی بەلای منەوە جێی هەڵوەستە لەسەرکردن بوو ئەوەبوو کە کوردیان بە نەتەوە نەدەزانی، باسی ڕزگاری کوردستان و حکومەتی سەربەخۆی کوردیان نەدەکرد. زۆر باسی برایەتی کورد و عەرەبیان دەکرد و بە پێویستیان دەزانی کە لەیەك نیشتماندا پێکەوە بژین. لەبەرامبەردا پارتی دیموکرات تا دەهات گەشەی دەکرد و جەماوەری لە دەور کۆدەبوویەوە، چونکە بانگەشە حیزبیەکەی نەتەوەیی بوو، داوای مافی نەتەوەیی بۆ میللەتی کوردی دەکرد، بۆیە ڕۆژ بە ڕۆژ مەودای چالاکی نێو خەڵك و پێشمەرگایەتییان فراوانتر دەبوو، لە زاخۆوە تا خانەقین زەبریان لە دوژمن دەدا.

ئەوەی بەلای منەوە گرنگ بوو لەپاڵ نەهێشتنی چەوسانەوەی چینایەتی مافی نەتەوە و رزگارکردنی نیشتمانەکەم بوو لە ژێر دەستی داگیرکەرەکان. پێم نارەحەت بوو بەدیار دروشمێکی جیهانییەوە گیانی خۆم بەخت بکەم و دوای دروشمی (ئەی کرێکارانی جیهان یەکگرن)ەوە چاوەڕێ بم. ڕۆژ بە ڕۆژ تۆوی هەستی نەتەوایەتی و کوردایەتی لە دڵمدا زیاتر گەشەی دەکرد، وا هەستم دەکرد ئەم ئاواتەی من لەناو دروشمەکانی پارتیدا زوتر دەگاتە لوتکە، کە بریتییە لە ڕزگاری کورد و کوردستان، بۆیە بڕیارم دا خەباتم بگوازمەوە نێو هێزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان، کە ئەو بڕیارەم دا پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و برادەرایەتیەکانم لەگەڵ حیزبی شیوعیدا مایەوە، ئەو پەیوەندییە زۆر جار دەبوویە کێشە بۆم و لەنێو پارتیدا پێیان دەگوتم تۆ هێشتا هەر شیوعیت.

# قۆناغی سێیەم

## پەیوەندیکردنم بە پارتی دیموکراتی کوردستانەوە

پەیوەندیم بە پارتییەوە کرد و ساڵی (١٩٦٧) بووم بە پێشمەرگە لە بەتالیۆنی عەزیز قازی لە لقی خورشید بارزانی کە جێگرەکەی حەسەن عەلیاوایی بوو. لەبەر ئەوەی پێشینەی پێشمەرگایەتیم لەنێو حیزبی شیوعیدا هەبوو لای ئەوان فەرماندەی مەفرەزە بووم و قاڵبووی کاروباری پێشمەرگایەتی و کاری چەکداری بووم، پاش ماوەیەك بە پلەکەی خۆم بە فەرماندەی مەفرەزە دانرام.

شۆڕشی ئەیلوول ڕۆژ بە ڕۆژ لە گەشەدا بوو، سەرکردایەتی پارتی بە هەردوو شێوازەکەی کاری دەکرد هەم لەڕووی چەکدارییەوە کە ژمارەی چەکدارەکانی بە هەزارەها بوو، ڕۆژانە کارو چالاکی سەربازی ئەنجام دەدا و هیوای لە دڵی میللەتدا پەیداکردبوو کە شۆڕشەکە دەگاتە ئامانجی خۆی و میللەتی کورد بەهیوای خۆی دەگات. جار بەجاریش بە گفتوگۆ و دانوستان درێژەیان بە کاری سیاسی دەدا. دواجار کۆی هەموو هەوڵ و تێکۆشانەکانی پارتی بە بەیاننامەی یازدەی ئازاری (١٩٧٠) گەشتە ئامانج و لەگەڵ بەعسدا دانوستان دەستی پێکرد و جۆرێکی تر لە کاری سیاسی هاتە نێو کۆڕی خەبات، بەیاننامەی یازدەی ئازار زۆر دەسکەوتی بۆ کورد دەستەبەر کرد، بەعس زۆر گفتی هەمەلایەنەی بە شۆڕشدا. پێشمەرگە تا ڕادەیەك بوژایەوە و جەماوەر

ئاهێکی خۆشیی بەبەردا هات، ئاسایش لە وڵاتدا بەرقەرار بوو، مۆتەکەی شەڕ بەرۆکی هەرێمەکەمانی بەردا و شەڕی لوولەی تفەنگەکان لە شاخ و بەرەی جەنگەوە گواسترایەوە بۆ نووکی قەڵەم و مێزی گفتوگۆ. بەم شێوە چوار ساڵی ئارامیمان بەڕێکرد.

## پرۆسەی هاوسەرگیری (١٩٧١)

چەند جارێك دەمویست ژن بهێنم بەڵام بە بۆنەی پێشمەرگایەتییەوە بۆم نەدەگونجا. لەو سەردەمەدا هاوسەرگیری ئاسان نەبوو. بە دوو شێوە دەبوو، یا دەبوو خوشکێکت هەبوایە و ژن بە ژنت پێ بکردایە. ئێمەش تەنها یەك خوشکمان هەبوو برایەکم دابووی بە ژن بۆ خۆی. یان دەبوایە پارەیکی زۆرت هەبوایە و بتدایە بە شیربایی. ساڵی (١٩٧١) کاتی گفتوگۆی نێوان دەسەڵات و شۆڕش بوو دەرفەتم وەرگرت و لە زەڕایەن کەسێکیان بۆ دۆزیمەوە بە ناوی بەهیە کاکە برا ئەوانیش داواکاریەکی وەهایان نەبوو کە بە من نەکرێت بۆیە پرۆسەی هاوسەرگیریم ئەنجامدا، لەگەڵ بنەماڵەی کاکە برا پەیوەندیەکی لە پێشینەمان هەبوو، کاکە برا هاتوچۆی سیارەی دەکرد. کاکە برا کوڕی کەریمی هەواسە، کەریمی هەواس کاتی خۆی ماڵی لە (کانی میل) بووە و پیاوێکی دەوڵەمەند و دەست ڕۆیشتوو بووە. دوای کانی میل گوندی زەڕایەنی کۆنی ئاوەدان کردووەتەوە.

بەهیە بەخت یاوەری نەبوو، چونکە بووە هاوژینی پیاوێك کە ناوی پێشمەرگە پاشگری ناوەکەیەتی و هەموو کات لەبەرەی گەلدایە، بۆیە ناڕەحەتی و سەختی ژیان دەبێتە دەست لەملانی بەهیەخان و هەموو تەمەنی گەنجی لە ئەشکەوت و ئاوارەیی و ناڕەحەتیدا سەرف دەکات، بەڵام

گەورەیی و خۆشەویستی و دڵسۆزی ئەم ژنە بۆ خێزانەکەی، نەبووە هۆی ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان پێشنیاری ئەوە بکات هاوسەرەکەی واز لە خەباتی پێشمەرگایەتی بهێنێت، کە دواتر بەپێی پێویست باسی دەکەم.

پاش تەواوکاری پرۆسەی هاوسەرگیری بۆ جاری یەکەمماڵێکمان لە سیارە پێکەوەنا و سەرەڕای کاری پێشمەرگایەتی بە نیش و کاری گوندەوە خەریك دەبووم و بەرەبەرە لەگەڵ بەهیەخاندا بناغەی ژیانێکی نوێمان دارشت.



مام دەروێش – بەهیە کاکەبرا (خێزانی دەروێش ساڵح)

گوندی سیارە. ساڵی (٢٠٠٠)

## هاوكاریی شەهیدانی گوندی سیارە

لە دوای بەیاننامەی (١١)ی ئازار بارەگامان لە گوندی دوكانی قەرەداغ بوو ، یەكێك لە خاڵەكانی ڕێكەوتنی نێوان شۆڕش و حكومەت ئەوەبوو كە شەهیدەكانی كوردستان مووچەیان بۆ ببڕدرێتەوە. ئەحمەد سوور زەنگنەیی فەرماندەی بەتالیۆن بوو، پیاوێكی دڵسۆز و خەمخۆری خانەوادەی شەهیدان بوو. ڕۆژێك گوتم كاك ئەحمەد شەهیدانی سیارە هیچیان بۆ نەكراوە، ئەویش گلەیی لە بەرپرسانی ناوچەكە كرد، كە بۆ هیچیان بۆ نەكردوون. پێشنیاری بۆ كردم خانەوادەی شەهیدەكان دوو كەس بكەن بە نوێنەر و سەردانم بكەن. منیش چووم بۆ سیارە شتەكەم بۆ باس كردن، ئەوانیش (حاجی مەحمودی ڕەحمانی مامەم و قادر فتاح)یان كرد بە نوێنەری ماڵە خاوەن شەهیدەكان و هاتن بۆ لای كاك ئەحمەد لە دوكان. ئەویش زۆر ڕێزی لێگرتن و داوای لێبوردنی لێكردن كە درەنگ ئاوڕیان لێ دراوەتەوە. پاشان نوسراوی بۆ كردن بۆ هێز، ڕێنوێنی كردن كە چی بكەن و لە هەركوێدا كارەكەیان بۆ نەكرا ئاگاداری بكەنەوە، تا هاوكاریان بكەن. دواجار كارەكەیان بۆ كرا و وەكو شەهیدەكانی دیكە هاوكاری ماددییان بۆ بڕایەوە.

## ڕەوشی گفتوگۆ

كاتی گفتوگۆی نێوان شۆڕش و حكومەت ئەو كاتانەی كە واجبمان نەبوو لەنێو گوندی سیارەدا خۆم بە كشتوكاڵی و ئاژەڵدارییەوە خەریك دەكرد. مانگانە بڕی (١٠) دیناری پێشمەرگایەتیمان هەبوو لە هەڵەبجە وەرماندەگرت، مانگانە سێ ساڵح ناو (دەروێش ساڵح، ساڵح محەمەد علی

ناسراو بە ساڵحی حەمەی یەلی کانی بەردینەیی و ساڵحی ئەولکەریمە سوور) جێبەکەی ساڵح خەیاتمان دەگرت و دەچووین بۆ هەڵەبجە. بەم شێوەیە بەردەوام بووین تا ساڵی (١٩٧٣)، بەڵام لەم مێژووە بەدواوە تا دەهات ڕەوشی گفتۆگۆ بە کەشێکی نا ئارامدا تێدەپەڕی. هەمیشە دوژمنەکانی کورد هەرکاتێك لە بەرەکانی شەڕدا تێکدەشکان و نەیاندەتوانی ڕووبەڕووی پێشمەرگە ببنەوە پەنایان بۆ گفتۆگۆ دەبرد تا جارێکی دیکە خۆیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوە ئامادە دەکرد بۆیە ئەمجارەش پاش پشوویەکی درێژ بەردەوام لە گفتوگۆ، ڕۆژ بە ڕۆژ ڕەوشەکە بەرەو خراپی دەچوو. پاش چەندین هەوڵ و تەقەلای دۆستان، دواجار ئامانجەکانی گفتۆگۆ لەگۆڕ نرا و جارێکی دیکە چەخماخەی شەڕ کوردستانی کردەوە بە ئاگر و شەڕ و ماڵوێرانی جارێکی دیکە یەخەی ڕۆڵەکانی گەلی عێراقی بە کورد و عەرەبەوە گرتەوە و کەوتنەوە بەر بەرداشی حوکمڕانی دەسەڵاتدارانی بەغدا.


مام دەروێش


ساڵح محەمەد عەلی


ساڵح عەبدولکەریم باوەخۆشێنی

## دەسپێکردنەوەی شەڕو ئاوارەبوون

ساڵی (١٩٧٤) ڕۆژ بە ڕۆژ کەشەکە بەرەو ئاڵۆزی دەچوو، خەڵك لە دڵە ڕاوکێدا بوو، هەردوو لایەنی گفتوگۆ مێزی دانوستانیان فەرامۆش کردبوو، ورده ورده هێزیان کۆدەکردەوە بە تایبەتی لایەنی دەسەڵات لە هەموو قۆڵەکانەوە خۆی قایم دەکرد و بەرەکانی ڕووبەڕووبونەوەی بەهێز دەکرد.

لە (١٩٧٤/٣/٧) عوسمانی عەلە چەتوون سەر لقی پارتی بوو، لە نزیك گوندی چنارەی نێوان دەربەندیحان و زەڕایەن کە لە سلێمانیەوە بەرەو دەربەندیخان دەچوو، ڕێگەی لە کاروانێکی سەربازی گرت، لەو کاتەدا بارەگای پارتیش لە گوندی چنارە بوو، مامۆستا جمال تاهیر لێپرسراویان بوو، بێئاگابوون لەوەی کە عوسمانی عەلە چەتوون لەو کاروانە بدات. لە کاروانەکە درا و بوو بە شەڕ، پێشمەرگەیەکی بارەگاکەی گوندی چنارە ناوی شێخ حیسام خەڵکی قەرەداغ بوو، بە هانای هێزەکەی پێشمەرگەکانەوە دەچێت و شەهید دەبێت، کە پێشمەرگەیەکی ئازاو قارەمان بوو.

گوندەکانی نزیك ڕووداوەکەی کارەساتی (١٩٦٣)ی زەعەیم صدیق ماران گەستەی کردبوون، هەر ئەو شەوە گوندەکانیان چوڵ کرد. منداڵەکانی منیش ماوەیەك لەگەڵ خەڵکی ئاوایدا لە ئەشکەوتەکانی سنوری گوندەکەدا خۆیان حەشاردابوو، بەپەلە هەندێ پێداویستی سەرەتاییان کۆ کردبووەوە و لەگەڵ ماڵ و منداڵی ساڵحی حەمەی یەلی، کە خێزانەکەی شەمسەی ناو بوو هەروەها ماڵی شێخ عمری بەرزنجی، کە خێزانەکەی حەیاتی شێخ مجید عازەبانی بوو، بەرەو بیارە ڕۆشتبوون. من و ساڵح و شێخ عمریش پێشمەرگە بووین، لە بیارە بەهۆی ئەوەی ئاوارەیەکی زۆر ڕوی تێکردبوو ماڵ و منداڵەکانمان لە بیارە جێگەو ڕێگەیان زۆر ناڕەحەت بووبوو، ناچار خۆیان

کۆکردبووەوە و ڕۆشتبوون بۆ ئۆردوگای سەریاس لە ئێران. لەو کاتەدا دوو منداڵمان هەبوو گوڵاڵە و عەلی، لە ئۆردوگای سەریاس خێزانەکەم بووبوویە دراوسێی ماڵی عەلە ڕەش. وەك پێشتر باسم کردووە لەگەڵ ماڵ و منداڵی عەلە ڕەشدا ناسراوییەکی زەمانی پێشمەرگایەتی پێشووترم هەبوو، دادە خانمی خێزانی کە ئێستاش لە ژیاندا ماوە باری تەندروستی تەواو خراپە، هەتا بڵێی ژنێکی قارەمان بوو، کە ئاوارەی ئێران بوو بۆ ماوەی (٢١) ساڵ لە ئاوارەییدا مایەوە، بە ئاوارەیی (٦) منداڵی بەخێو کردووە. عەلە ڕەشی هاوسەری ساڵی (١٩٧٧) لەگەڵ ئازاد و کامەرانی کوڕیدا، بۆ هەڵگیرسانی شۆڕشی نوێ بە ڕابەرایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، گەڕانەوە بۆ کوردستانی عێراق. ئازایەتی و جوامێری عەلە ڕەش بە پاڵپشتیی دادە خانمی خێزانی بوو، کە وەك دیوارێکی پۆڵاین پشت و پەنای بوو، دادە خانم یەکێکە لەو ژنانەی کە ڕەمزی ژنی بەوەفا و قارەمانە، لەگەڵ عەلە ڕەش و خێزانەکەیدا چەندین وێسگەی ژیانمان پێکەوە بووە و تەمەنێکی زۆر پێکەوە پێشمەرگە بووین، بۆیە لە زۆر شوێندا ناوی خێزانە بەڕێزەکەیان دەهێنرێت.

لە دوای (١٣) مانگ لە ئاوارەیی دەربەدەری، لە دوای هەرەسی شۆڕش جارێکی دیکە گەڕاینەوە بۆ گوندەکەمان. پێویستە بگوترێت لەو کاتەی کە منداڵەکانم ئاوارە بوون ئەوەندە بە پەلە ڕۆشتبوون ماڵەکەیان بە تەواوی کۆ نەکردبووەوە، خەڵکی ئاوایی بۆیان کۆ کردبووینەوە. لەو کاتەدا هیزەیەك ڕۆنی خۆماڵیمان هەبوو، میمکە ئەمنەی خێزانی حاجی عەبدولقادر بردبوویە لای خۆی بە ئەمانەت هەڵیگرتبوو، کە گەڕاینەوە بۆ گوندەکەی خۆمان هیزە ڕۆنەکەی بۆی هێنواینەوە، بۆیە باسی ئەمە دەکەم کە بزانرێت لەنێو میللەتی کوردا چەندین نموونەی ژنی دەست پاك و ئەمانەت پارێزی وەك میمکە ئەمنە هەیە.

## شەڕی شاخی گوڵان و سەرتیز و هەندرێن

دوای ئەوەی کێشەی ماڵ و منداڵم نەما و ئاوارەی ئێران بوون، خۆم ساز و ئامادەکرد بۆ هەرکارێك کە پێم بسپێرن، لە شاخی گوڵان شەڕێکی گەورەمان لەگەڵ سوپای عێراق کرد، لەو شەڕەدا حیزبی شیوعیی هاوکاری سوپای عێراق بوو، چونکە لەگەڵ حزبی بەعسدا لەیەك بەرەدا بوون. لەو شەڕەدا ساڵحی حەمەی یەلی و مەحمودی مەلا مارف ئەحمەدبرندەیم لەگەڵدا بوو بۆ یەکەمجار لەو شەڕەدا بریندار کرام. دوای چاکبوونەوەم گواسترامەوە بۆ لقی (فەریقی مینە مەنمی)، لەو کاتەدا دەوڵەت هێرشی توندی بۆ زۆزك و سەرتیز دەکرد، لقەکەی ئێمەش بۆ هاوکاریکردنی پێشمەرگەکان چووین بە هانایانەوە. گڕی ئەمجارەی شەڕ زۆر توندبوو، بەشی هەرە زۆری خەڵکی کوردستانیش لەپشت شۆڕشەکەیان وەستان و ڕوویان لە شاخ کرد. شۆڕش ناوچەی ڕزگارکراوی زۆری هەبوو.

جێی خۆیەتی باسێکی شەڕی سەرتیز و زۆزك بکەم، چونکە شەڕەکە شەڕێکی زۆر سەخت بوو، شەڕی لەو جۆرە مەگەر لە جەنگی جیهانیدا ڕوویدابێت. بەعس بە هەموو هێزی خۆی هێرشی هێنابوو، هەموو جۆرە چەکێکی بەکاردەهێنا تا ئەو ڕادەیەی چەکی قەدەغەکراوی نێودەوڵەتیشی بەکارهێنا. یەك لەو کەسانەی بەو چەکە قەدەغەکراوانە بریندار کرا زاهیری برای مستەفا چاو ڕەش بوو کە بە چەکی فسفۆڕ بریندار کراو هەموو گیانی سووتا، ئەوە یەکەمجار بوو پێشمەرگە بەو شێوەیە بریندار بکرێت، بۆیە ناچار ڕەوانەی نەخۆشخانەکانی ئێران کرا. کاك مستەفا چاو ڕەش خۆیشی لە هەمان ئەو بەرەیەی شەڕ بوو، پلەی لێپرسراوێتیشی هەبوو.

لە شەستەکاندا لەگەڵ کاك مستەفا پێشمەرگەی حیزبی شیوعی بووین، جارێك لە هەندرێن پێی گوتم: دەروێش ئاگات لەخۆت بێت نەکوژرێیت، ئەمە حاڵی ئێمەی کورد بێت گەر ئەم شۆڕشەش ئەنجامی نەبێت ئەوا

چەندین شۆڕشی دیکە بەرپا دەبێت، با بمێنیت بۆ شۆڕشەکانی دیکە. لەو سەردەمەدا کاك مستەفا بە نهێنی لە ڕیزەکانی کۆمەڵەی مارکسی لینیندا ئەندام بوو، دەیزانی منیش پەیوەندیم هەیە.

ڕۆژ بە ڕۆژ شەڕ لە سەرتیز گەرم دەبوو، یەك پارچە شاخ دەسووتا و دەبوو بە ئاگر، دەوڵەت دەیویست بە هەر نرخێك بێت سەرتیز و زۆزك بگرێت، بۆ ئەوەی تەنگ بە بارەگای بارزانی هەڵچنێت. شەڕەکە درێژەی کێشاو هەندێك ڕەبایەشی گرت. لەو شەڕەدا بۆ دووەمجار بریندار بووم، بەڵام ئەمجارەیان برینەکەم زۆر سەخت نەبوو بۆیە بەرەی شەڕم جێنەهێشت و دوای تیمارکردنم لەلایەن پزیشکی شۆڕشەوە باری تەندروستیم باشتربوو و گەڕامەوە سەنگەرەکەم. بۆ یارمەتیدانی بەرەی شەڕ مەفرەزەکەی من گوازرایەوە بۆ هەندرێن و لەوێ ڕووبەڕووی شەڕێکی دەستەو یەخە بووینەوە،


شەهید قادر ئایش

ڕۆژی (١٩٧٤/١١/١٨) لە شەڕەکەدا پێشمەرگەیەك بە ناوی قادر عەبدوڵڵا کە بە (قالەی ئایش) ناسرابوو، لە مەفرەزەکەی مندا بوو شەهید کرا، پیاوێکی نیشتمان پەروەر، پێشمەرگەیەکی ئازا و قارەمان بوو. ئێستا کوڕێکی بە ناوی (عەلی) فەرمانبەرە لە بانکی دەربەندیخان، کوڕێکی زۆر بە ئەدەب و ڕۆشنبیرە.

شێخ جەعفەری شێخ مستەفا قەرەداخی لەو کاتەدا کوڕێکی گەنج بوو، پلەی لێپرسراوێتی هەبوو، پێشمەرگەیەکی ئازا و وریابوو، هەر لە سەرەتاوە نیشانەکانی سەرکردەیی تێدا بەدی دەکرا، ئەویش لەو شەڕەدا بەشداربوو.

## گیرانم لەلایەن عەبدولوەهاب ئەتروشی

تا دەهات شەڕ گەرمتر دەبوو، سەربازەکانی حکومەت چەند ڕەبایەیەکی گرتبوو. ئەوان بەچەکی پێشکەوتووی وڵاتان لە پێشیانەوە یەکێتی سۆڤییەتی ئەو کاتە لێی دەدایین، ئێمەش بە چەکی قورسی ئەمریکا و ئێران وەڵاممان دەدانەوە.

ڕۆژێك بۆ پشوودان لە ئەشکەوتێکدا بووین گوتم ئەم شەڕە شەڕی ئێمە نیە و شەڕی نێوان وڵاتی عێراق و ئێرانە، لەوەش گەورەتر شەڕی بەرژەوەندییەکانی ڕوسیا و ئەمریکایە و ئێمەی کورد بووینەتە قوربانی ململانێکانی ئەوان، مەنجەنیقێکیان سازداوە و ڕۆژانە بە دەیان ڕۆڵەی کورد دەبێتە قوربانی و هەرکاتێکیش نیشیان پێمان نەما و سەودا و مامەڵەی خۆیان تەواوبوو دەستمان لێ بەردەدەن و گورگانخواردمان دەکەن. کوردستان هەمووی وێران بووە، بە سەدان شەهیدمان داوە، بەشی هەرە زۆری خێزانەکان ئاوارەی ئێران بوون، بەش بە حاڵی خۆم ئایندەی ئەم شۆڕشە باش نابینم و وا هەست دەکەم ڕۆژێکی تاریك چاوەڕوانمان دەکات. لە سەرووی ئەمانەشەوە هەندێك لە لێپرسراوەکان لە نێو ئێراندا خەریکی کاری بازرگانی دەبوون.

پاش ئەوەی ئەو قسانەم کرد ئەوەندەی پێنەچوو خۆم و مەفرەزەکەمیان چەك کرد و من و جافر سێوسێنانی و برایەکی گیراین و لە کوونە ڕەشێکیان ئاخنین. هێشتا برینی برینداریيەکەم ساڕێژ نەبووبوو زیندانیان کردم. زانیم ئەم دەزگیرکردنە بە فەرمانی عەبدولوەهاب ئەتروشی بووە، چونکە ئەو سەردەمە ئەو بەرپرسی گشتی هێزی پێشمەرگەی دەڤەرەکە بوو. کە بردینیان بۆ لای گوتی ئێوە شیوعین و دەتانەوێ کاری گێرەشێوێنی بکەن.

ڕەسوڵ هەمزەتۆف کە نوسەرێکی داغستانییە دەڵێت: گەر شەڕ لەگەڵ کەسێکدا بکەیت کە ئەو لەسەر بینایەك ڕاوەستاوە و تۆ لە خوارەوەی، ئەگەر ئەو خشتێکت بۆ بهاوێت یا تۆ خشتێك بەرەو ڕووی ئەو بهاویت کە تۆ لە خوارەوەیت، لە هەردوو حاڵەتەکەدا خشتەکە هەر بەر تۆ دەکەوێت کە لە خوارەوەیت. لەم وڵاتەی ئێمەشدا لەگەڵ ئەوانەی پلەی لێپرسراوێتیان هەیە و لەسەرووی تۆوەن، گەر ڕەخنەیان لێ بگریت، ئەگەر لەسەر حەقیش بیت ئەوا هەر تۆ تووشی سزا و لێپرسینەوە دەبیت. منیش بەو شێوەیە کە لەسەر هەق بووم و قسەیەکی ڕاستم کرد، وەك خشتەکەی ڕەسوڵ هەمزەتۆف بەر خۆم کەوت و تووشی سزاو لێپرسینەوە بووم. بەهۆی ئەوەی هەرگیز لە بۆچوونی ناڕاست یا شتی ناهەق بێدەنگ نەبووم، چەندین جار لەسەر ئەم بۆچوونانە تووشی کێشەبووم.

لەو کاتەدا کە من لە زیندان بووم حەمە ئاغای مێرگەسوور و فاخیر و جەوهەری کوڕیشی لەوێ زیندان بوون. فاخیر مێرگەسووری پێشنیاری ئەوەی بۆ کردم هەواڵ بنێرم بۆ ئیبراهیم ئەحمەد، تا هەوڵی بەربوونمان بدات. بەڵام دوایی زانیمان کە ئەو هەوڵ و تەقەلای خۆی دابوو، بەڵام نەیتوانیبوو بەرمان بدات.

عەبدولوەهاب زۆر بە توندی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکردین و لە زیندان زۆر ئەشکەنجە دەدراین. لەو کاتەدا حەمە شەمێرانی لەگەڵ هێزەکەی کە بۆ شەڕی زۆزك هاتبوون، هەموو سەنگەرە داگیرکراوەکانی لەژێر دەستی حکومەت دەرهێنابوویەوە و بەڕاستی ئازایەتییەکی بێوێنەی نواندبوو، لە گەڕانەوەدا بە عەبدولوەهابی گوتبوو تا دەروێش ساڵح و هاوەڵەکانی بەرنەدەیت ناڕۆمەوە. واتە: یان ناڕۆم یان ئەوانیش لەگەڵ خۆم دەبەمەوە، چونکە دەروێش ساڵح پیاوێکی ماندووە و لە شەڕدا بریندار بووە و

منداڵەکانیشی ئاوارەی ئێران بووە، گەر قسەکیشی کردبێت بە مەبەست نەیکردووە. عەبدولوەهاب ئەتروشی قسەکەی نەشکاند و ئازادیان کردین و لەگەڵ خۆیدا گەڕاینەوە بۆ قەرەداخ.

دوو مانگ بوو یارمەتیم وەرنەگرتبوو، باری داراییشم زۆر خراپ بوو، یارمەتی هات و دابەش کرا و ناوی منی تێدا نەبوو، کە پرسیارم کرد گوتیان تۆ یارمەتییەکەت ڕاگیراوە، چوومە لای نوری ئەتروشی کە لێپرسراوی دارایی بوو، بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، ماڵی ئاوابێت یارمەتی هەردوو مانگەکەی بۆ خەرج کردم، کە چل دینار بوو، بۆ من هاوکارییەکی باش بوو.

بەم شێوەیە لە شۆڕش کردن بەردەوام بووین و منیش لە ناوچەکانی قەرەداخ و داری کەلی بەشداری چەندین شەڕی دیکەم کرد، تا بە پلانگێڕیی وڵاتە زلهێزەکانی جیهان و وڵاتانی ناوچەکە بۆ بەرژەوەندی خۆیان گەلەکۆمەکییان لە شۆڕشەکە کرد و ئەو شۆڕشە گەورەیە هەرەسی هێنا و بەشی زۆری خەڵك و پێشمەرگە خۆیان ڕادەستی حکومەتی عێراق کردەوە و بەشێکی دیکەش بەرەو ئێران ڕۆیشتن و بە ئاوارەیی لە ئۆردوگاکانی ئێران مانەوە.

## گوندی داربەڕوولە و دوو بیرەوەری

داربەڕوولە گوندێکە لە نزیکی سلێمانی، دانیشوانەکەی بە خزمایەتی پێمان دەگەنەوە و خەڵکانێکی زۆر چاکەخوازن.

### یادەوەری یەکەم

ساڵی (١٩٧٥) کە شۆڕشی ئەیلول هەرەسی هێنا و بێ ئومێد بووین لە درێژەدان بە خەبات. بەشێکی پێشمەرگە چارەنووسی ئاوارەییان هەڵبژارد و روویان لە ئێران کرد و هەندێکیشیان لە ئێرانەوە بەرەو ئەوروپا کۆچیان کرد، بەشەکەی دیکە بە خۆیان و چەکەکانیانەوە خۆیان ڕادەستی حکومەتی عێراق کردەوە و ئەویش لە بەرامبەردا بڕێك پارەی کەمی پێ ئەدان.

منیش بڕنەوێکی ئەڵمانی و ڕەزن و فیشەکەکانیم پێبوو، دێ بە دێ بە نهێنی هاتم و چوومە گوندی (داربەڕوولە). لە ماڵی حاجی حەمەخان کە خێزانەکەی ناوی شەمسە بوو، تفەنگ و فیشەکەکانم دا بە ئەوان بۆم بشارنەوە تا کاتێکی تر خۆم ئەگەڕێمەوە بۆی. لەو کاتەدا گەر تفەنگێك لە هەر ماڵێکدا بگیرایە سزای بەندکردن یا سێدارەدانی بۆ دەردەچوو، بەڵام ئەو ماڵە نەیانگوت ئەو کارە ناکەین.

لە ڕاستیدا بۆیە ئەو تفەنگەم حەشاردا چونکە پەیوەندییەکی سەرەتایم بە ڕێکخستنی کۆمەڵەوە هەبوو، ئومێدی ئەوەشم هەبوو جارێکی دیکە ئیشم بەو تفەنگە هەبێت. زۆر کەسی دیکە لەوانەی متمانەم پێیان هەبوو هانم ئەدان تفەنگەکانیان رادەستی حکومەت نەکەن، چونکە رۆژێك دەبێت دووبارە شۆڕش هەڵگیرسێتەوە. دواتر لە ساڵی (١٩٧٦) زۆر بە نهێنی لەگەڵ برایمی مامە عەزەم چوومەوە بۆ ماڵی حاجی حەمەخان و بە هەر حاڵێك بوو تفەنگەکەم هێنایەوە بۆ گوندەکەی خۆمان. ساڵی (١٩٧٩) کە بۆ جاری سێیەم ڕووم کردە شاخ بۆ پێشمەرگایەتی بە چەك و تفاقی خۆمەوە

پەیوەندیم بە هێزی پێشمەرگەی شۆڕشی نوێوە کرد بە ڕابەرایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

**یادەوەری دووەم**

لەگەڵ ماڵی حاجی حەمەخان هاتوچۆمان هەبوو و بەردەوام سەردانی یەکتریمان دەکرد. دوای ساڵی (١٩٧٦) ماڵیان لە داربەڕوولەوە گواستبووەوە بۆ سلێمانی. داوای کچێکیان کردبوو بۆ برایمی کوڕی. ماڵە باوانی کچەکە لە گوندی (دێ کۆن)ی شارەزوور بوو. بۆ گواستنەوەی بووکێ بانگکرابووین. من و بەهیەی خێزانم و برایمی مامە عەزەم چووین و ئەو شەوە لە گوندەکە ماینەوە، بۆ بەیانییەکەی بووک ئامادە کراوە و بە جێبێک کەوتینەڕێ بۆ سلێمانی، کە گەشتینە ماڵی حاجی حەمەخان، بەداخەوە شەمسە خانی خێزانی تازە بە تازە کۆچی دوایی کردبوو، شاییەکەمان لێ بوو بە شیوەن، کە بۆ هەموو لایەکمان ڕووداوێکی زۆر ناخۆش بوو.



**گوندی داربەڕوولە (٢٠١٣)**

**لای ڕاستەوە: ئیسماعیل سابیر ئەمین – حەمە فایەق حەمەخان – عەلی مام دەروێش مام دەروێش – ڕێبوار برایم عەزیز – مەولود عەلی. ئەوەی راوەستاوە: مەهدی عەبدوڵڵا کاکەبرا**

## گەڕانەوەم بۆ سیارە

دوای هەرەسهێنانی شۆڕش منداڵەکانم لە ئۆردوگای سەریاس و ئەنزڵەوەوە هێنایەوە و بۆ جاری سێیەم لە گوندەکەمان (سیارە) ماڵمان پێکەوەنا و دەستم کردەوە بە کاروباری ئاژەڵداری و جارجاریش بۆ کرێکاری دەچووم بۆ بەغداد.

ساڵی (١٩٧٦) لە فەرمانگەی کشتوکاڵ بە کاتیی خەڵکیان وەک کرێکار وەردەگرت، کە لە لێواری شەقامەکاندا سنەوبەریان پێ دەڕواندن، منیش خۆم ناونووس کرد و وەرگیرام. ڕۆژانە لە سیارەوە دەچووم بۆ سەر ئیش و دەگەڕامەوە. خەڵکی ئەو دێهاتانەی دەوروبەرمان زۆرێکیان وەک من وەرگیرابوون. جارێکیان نەماممان دەناشت کرێکارێک بە خراپی سنەوبەرەکانی دەناشت، پێمگوت بۆ خەساری دەکەیت بۆ چاک نایڕوێنیت؟ کرێکارەکە لە وەڵامدا گوتی: ماڵی حکومەتە با سەوز نەبێت. گوتم کاکە گیان ڕاستە ئەوە هی حکومەتە، بەڵام سوودەکەی بۆ ئێمەیە، ئەگەر بەچاکی بیڕوێنین بۆ خۆمان کەڵکی دەبێت هەم بۆ جوانی و هەم بۆ ژینگە، کاتێکیش کە گەورەبوون پێشمەرگە لەنێو ئەم درەختانەوە خۆی حەشار ئەدا و تەقەش لە حکومەت دەکات. بە پێکەنین و سەرسوڕمانێکەوە گوتی: جا بۆ پێشمەرگە ماوە! بە تەمای جارێکی دیکە پێشمەرگە لە کوردستاندا دروست ببێتەوە؟ گوتم بەڵێ، زۆر نابا شۆڕش سەرهەڵئەداتەوە و لەسەر ئەم جادەیە چالاکی پێشمەرگایەتی دەبینی. بەڵام کرێکارەکە باوەڕی بەم قسەیەی من نەبوو و عەقڵی نەیدەبڕی. دوای چەند ساڵێک کە شۆڕش دروست بووبوویە و چالاکی

پێشمەرگەی بیستبوو، ئەم قسەیەی منی بۆ کرێکارەکان گێڕابوویەوە.

ساڵی (١٩٧٧) کە خۆم ناونووس کرد بۆ کارکردن بە گرێبەست، زۆری نەبرد ناوەکەم هاتەوە و وەك کرێکار لە نەخۆشخانە دامەزرام، ماوەیەکی زۆری نەبرد ناوەکەم هاتەوە و بووم بە کرێکاری هەمیشەیی.

# قۆناغی چوارەم

## پەیوەندی کردنم بە کۆمەڵەوە

لە سەرەتای حەفتاکانەوە ڕێکخراوێك بە ناوی کۆمەڵەوە دامەزرابوو، بەڵام بە نهێنی لە نێو شۆڕشی ئەیلوولدا کاریان دەکرد. دامەزرێنەرانی ئەم ڕێکخراوە لە کەسانی گەنج و ڕۆشنبیرەکانی کوردستان پێکهاتبوون، ڕێکخراوەکە بە ناوی کۆمەڵەی مارکسی لینینییەوە ناویان بڵاو بووبوویەوە. دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلول کەوتنە جموجوڵی کاری ڕێکخستن و ڕۆژ بە ڕۆژ ئەندام و لایەنگریان لە زیادبووندا بوو. ڕێکخستنێکی چالاك و تۆکمەیان هەبوو.

ساڵی (١٩٧٣) لە ڕێگەی (مەلا ڕەئووف بانیخێڵانی و عەلە ڕەش و حەمە فەرەج کانی بی)یەوە وەك لایەنگر یا هاوسۆز پەیوەندیم بە ڕێکخستنەکەیانەوە کردبوو، بەڵام ئەو کاتە هیچ چالاکییەکی سیاسیم لە تەکیاندا نەبوو. پاش نسکۆ هەواڵم زانی کە بەردەوامن لە کاری ڕێکخستن. کەوتمە سۆراغ و توانیم پەیوەندییان پێوە بکەم.

ساڵی (١٩٧٦) سەرلەنوێ پەیوەندیەکانم گرێدایەوە و ئەمجارەیان دەستم بە کاری سیاسی و چالاکی ڕێکخراوەیی کرد لە دەربەندیخان و دەوروبەریدا. من پەیوەندیم لەگەڵ مامۆستا مەحموود قەرەداخی و مامۆستا جەلالی حاجی شێخ تۆفیق و ساڵحی کوێخا عزیز هەبوو، مامۆستا واحیدی حەمەخانیش، کە لە ڕێکخستندا بوو دوای نسکۆ نەفیی کرابوو بۆ خوارووی عێراق، کە گەڕایەوە بۆ کوردستان پێکەوە ئیشمان دەکرد و پەیوەندیمان هەبوو.

لە گوندەکەی خۆمانەوە دەستم پێکرد و توانیم چەند کەسێك بکەمە ئەندامی ڕێکخستنەکە لەوانە: برایم کەریم پیروەیس، کەریم ڕەسوڵ مەحموود، عومەر حاجی عبدوڵڵا، ڕزگار کاکەبرا، برایم مەحمووود ڕەحمان، حەمەی کەریم پیروەیس، عوسمان ساڵح پیروەیس و محەمەد مەحموود فەرەج ناسراو بە (بەختیار) و کەریم ڕەحمان ناسراو بە (کەریم کۆمەڵە). لە گوندی قلیجەش: نوری مەلا حسەین و ئازادی مامە عەزەم و مەهدی و خەلیلی برازام و لە گوندی ئەحمەد برندەش ئازاد حەمە ڕەشید عەبدوڵڵا. لە ساڵەکانی دوایدا ئەم ئەندامانەی کە ناوم بردن یەك بە دوای یەك و لە کاتی جیاجیادا بوون بە پێشمەرگە لە مەفرەزەکەی خۆم یا لە مەفرەزەیەکی تری یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

ساڵی (١٩٧٧) شەهید ئارام هاتە ناوچەی قەرەداخ گوڕو تینێکی زیاتری دایە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە. ئەو کاتە من ئابوونەوەم کۆدەکردەوە و دەمبرد بۆ گوندی ناوتاق، لەوێ ڕادەستی خزمێکی کاك سەردارم دەکرد و ئەویش هەر ڕاسپاردەیەکی ڕێکخستنەکانی لابوایە دەیدامێ و دەمهێنایەوە بۆ ناو شار.

شەهید ئارام کەسێکی لەڕادەبەدەر دڵسۆز بوو بۆ بیرو باوەڕی کۆمەڵەی ڕەنجدەران، بەڵام بەداخەوە ئەم کەسە کاریزمایە زۆر بە زوویی دەستی خیانەت و تاوانکاری لە بۆسەیەکی نامەردانەدا لە سەرەتای ساڵی (١٩٧٨) شەهیدیان کرد، بەڵام ئەوەی مایەی خۆشی بوو هاوەڵەکانی بە ئەمانەتەوە باوەڕەکەیان درێژە پێداو ئەو ئاڵایەی شەهید ئارام هەڵیکردبوو هەر بە شەکاوەیی ڕاگیرا و خوێنی شەهید ئارام و هەموو هاوڕێکانی بەهەدەر نەچوو.

ئەو سەردەمە کارکردن لە ڕێکخستندا زۆر ناڕەحەت بوو، حکومەتی بەعس بە هەموو شێوەیەك چاودێریی جموجوڵی خەڵکیی دەکرد، تا ئەو ڕادەیەی کە حزبی شیوعی بەرەیان هەبوو لەگەڵ حزبی بەعسدا، بەڵام

ئەندامەکانیان لەژێر چاودێریدا بوون و تەنگیان پێ هەڵچنرابوو، ڕۆژ بە ڕۆژ کـار و چـالاکییان بەرتەسـك دەبوویـەوە و دووچـاری بـەرگرتن و ڕاوەدوونـان دەبوونەوە و ئەندامەکانیان دەگرتن و پاکانەیان پێدەنووسین.



برایم عەزیز فارس    مەهدی محەمەد عەلی    نوری محەمەد حسەین    محەمەد کەریم پیرومیس



ئازاد حەمەرەشید عەبدوڵڵا    خەلیل مەحمود پیروەمیس    رزگار کاکەبرا    محەمەد مەحمود فەرەج



عومەر عەبدوڵڵا میران    برایم مەحمود رەحمان    کەریم رەحمان    ئازاد عەزیز فارس

## دامەزراندن و کاری ڕێکخستن

ڕۆژانــە لــە ســیارەوە دەچــووم بــۆ دەربەنــدیخان و لــە کــەمپی خــوار لــە نەخۆشـخانە دەوامـم دەکـرد و ئێـوارە دەگەڕامـەوە گوندەکـەمان، عەلـە ڕەش لەگـەڵ سـەردار ناوتـاقی سـەردانیان دەکـردم، شـەوێك عەلـە ڕەش هـات (٥) کەسی لەگەڵدا بوو کە ئەمە ناوەکانیانە: ڕەوفی یاسە، کەریمی حەمە ئەمین چنارەیی، مجید عزیز، سعید حاجی عەبدولقادر و هەڵۆ ناوێك کە کادیر بـوو، خەڵکی سلێمانی بـوو. سـعیدی حـاجی عەبـدولقادریش خـەڵکی گونـدی خێڵـی یاقووە لە ناحیەی مەیدان. کاك سەعید ساڵی (١٩٧٨) بووەتە پێشمەرگە و لە ئەنفالەکەشـدا هاوژینەکـەی و (٣) منـداڵی و خوشـکێکی و دایـکی بـەر شاڵاوی ئەنفال کەوتن و بێ سەرو شوێن کران و لەگەڵ دەیان هەزار کوردی دیکەدا لە بیابانەکانی نوگرەسەلمان زیندەبەچاڵ کران.

ئـەو شـەوە عەلـە ڕەش گـوتی دەروێـش هەرچـۆنێك کـردووە هەنـدێك فیشەکی کلاشینکۆف و برنەوم بۆ پەیدا بکە. گوتم بـۆ فیشـەکی کلاشـینکۆف جارێ پەلـەم لێ مەکـە، بـەڵام سـەد فییشـەکی برنـەوم هەیـە و هـی سـەردەمی شۆڕشـی ئەیلوولـە لـەو کاتـەوە هـەڵم گرتـووە. فیشـەك و ڕەزن و تاقمەکـەم پێدان کە زۆر بـەنرخ بـوو بەلایەوە. بـە عەلـە ڕەشـم گـوت بـا بزانـی ئێسـتا لـە فەرمانگـەی کشـتوکاڵ نـەماوم و لـە نەخۆشـخانە بـە هەمیشـەی دامـەزراوم. ئـەویش نـاوی هەنـدێ کەسـی پێگـوتم کـە پەیوەنـدیان بـە خۆیـەوە هـەبوو کـە دڵنیابم لێیان و هاوئاهەنگبین.

لـەدوای ئـەو شـەوەوە بڕیـاری ئـەوەم دا بـە گـوڕو تینـێکی زیـاترەوە هـەوڵ بدەم. بۆ ئەم مەبەستە لەبارەی کۆمەڵە و دروستبوونی شۆڕشی نوێوە لەنێو

خەڵك و كۆڕ و كۆمەڵدا زۆر قسەم دەكرد و ئاگادارم دەكردنەوە كەوا شۆڕش بە ڕابەرایەتی یەكێتی نیشتمانی كوردستان دەستی پێكردووەتەوە و خەڵكێكی زۆریش بوونەتە پێشمەرگە و ڕوویان لە شاخ كردووەتەوە.

ڕۆژێك خزمێكمان لە پەنایەكەوە و بە سرتە پێی گوتم ئاگات لەخۆت بێت لەم لاولا قسە زۆر دەكەیت و لە ژێر چاودێریدایت، لەوانەیە بتگرن. منیش كەوتمە خۆم، پیاوێك هەبوو لە عەشرەتی دەلۆ ناوی هیدایەتی حاجی محەمەد كارێزەیی بوو. هیدایەت خزممان بوو، ئەو كاتە جێگری پارێزگاری سلەیمانی بوو. ڕۆژێك سەردانی سلەیمانیم كرد و چومە لای. لەو كاتەدا شێخ حەسەنی شێخ ئەمینی دەربەندیخانی لابوو. پاش دانیشتن و چاوەڕوانی تا كەسی لانەما، پێمگوت لە نەخۆشخانە دامەزراوم و دەزانم ناحەزم هەیە و لەبەر ئەوەی لە شۆڕشەكانی پێشووتردا پێشمەرگەبووم لەوانەیە ڕۆژێ لە ڕۆژان ناحەزان تۆمەتێكم بۆ هەڵببەستن و تووشی بەزمێك ببم و بگیرێم. ئەویش دەیزانی خەریكی ئیشێكم، بەڵام بە تەواوی نەیدەزانی چیە. گوتی ئاگاداری خۆت ببە ئەگەر گیرایت با بەڵگەو شتت بە دەستەوە نەگیرێت یان كارێك نەكەیت كە خەڵك شاهیدیت لەسەر بدات و بڵێن بینومانە ئەو ئیشەی كردووە، ئەوا من لەوانەیە بتوانم بەرت بدەم، بەڵام بە پێچەوانەوە هیچم پێناكرێ. بەم وەڵامە كەمێك نەهەوەن بوومەوە بەڵام بێ خەم نەبووم، چونكە ئەو كاتە دەربەندیخان شارێكی بچوك بوو چواردەورەكەیشی بە سەربازگە و ڕەبایە گیرابوو، لە ڕووی سەربازییەوە بە تەواوی سەیتەرەی بەسەردا كرابوو.

جارێكیان لە دەوام بووم، نایلەی ژنی مامۆستا جەلالی حاجی شێخ تۆفیق منداڵێكی سووتابوو، هێنابووی بۆ چارەسەر. حەمەلاو سێوسێنانی ئەندامی ڕێكخستنی كۆمەڵە بوو لە نەخۆشخانەی دەربەندیخان برینپێچ بوو، خەریكی

چارەسەری منداڵەکە بوو، گوتی مام دەروێش ئەم ژنە ناناسی؟ گوتم نەخێر. گوتی خێزانی مامۆستا جەلالی شێخ تۆفیقە. ئیتر لەوێدا یەکتریمان ناسی. هەرچەند من و مامۆستا پێکەوە پەیوەندی کاری ڕێکخستنمان هەبوو، بەڵام خێزانەکەیم نەدەناسی. مامۆستا ماوەیەکی کەم بوو چوبووە دەرەوە و بووبوو بە پێشمەرگە.

حەزدەکەم لێرەدا بەسەر هاتێکی خۆش بگێڕمەوە. کاتێك لە نەخۆشخانە دەوامم دەکرد، زۆر جار ئەو دکتۆرانەی کە نەقڵی نەخۆشخانەکەمان دەکران هەندێکیان عەرەب بوون و زۆربەشیان لای ڕژێم جێی گومان بوون یا دڵسۆز نەبوون بۆ حزبی بەعس، لەسەر ئەم کارەیان سزای سیاسی دەدەران و دەنێردران بۆ کوردستان. دکتۆرێکی عەرەبمان بۆ هاتبوو پیاوێکی زۆر باش، خەڵکی بەغدا بوو، بەداخەوە ناوەکەیم لەبیر نەماوە. هەستم پێدەکرد ڕقی لە بەعس بوو، ڕۆژێکی وەرزی زستان بە کارێك چوومە ژوورەکەی کە هاتمە دەرەوە گوتی: دەروێش (سد الباب). لەبەر ئەوەی عەرەبیم نەدەزانی وام زانی (سد الباب) ناوی کەسێکە بانگی بکەم. بە نێو نەخۆشخەکاندا گەڕام و چەند بانگم کرد (سد الباب) کێیە دکتۆر بانگی دەکات، کەس وەڵامی نەدایەوە. ناچار گەڕامەوە لای دکتۆر و پێم گوت زۆر پرسیارم کرد سد الباب دیار نییە لەوە دەچێت ڕۆشتبێتەوە، لەو کاتەدا لە ژوورەکەی دکتۆر برینپێچێکی خۆمانی لابوو عەرەبی باش دەزانی. گوتی مام دەروێش مەبەستت لە چیە؟ گوتم دکتۆر پێی گوتم (سدالباب)ی بۆ بانگ بکەم، منیش گەڕام نەمدۆزییەوە. ئەویش دەستی کردە پێکەنین و گوتی مام دەروێش دەزانی (سدالباب) مانای چییە؟ واتە: دەرگاکە دابخە، نەك ناوی کەسێك بێت تا بانگی بکەی.

## پەیوەندیکردنم بە شاخەوە

دوای ئـەوەی هەسـتم کـرد مانـەوەم لـەنێو شـاردا مەترسـیە و لـە ژێـر چـاودێریدام، بڕیـارم دا بچـمە شـاخ. لـەو کاتەشـدا شـۆڕش زۆر پێویسـتی بـە پێشمەرگە هەبوو، منیش دەمتوانی بەردێك بخەمە سەربەردێك و خزمـەتێك بکەم. لەبـەر ئـەوەی تەمـەنێکم لـە پێشـمەرگایەتیدا بـەڕێکردبوو، تـا ڕادەیـەك ئـەزموونێکی باشـم لـە خـەباتی چەکداری و شۆڕشـدا هـەبوو. بۆیـە بڕیارمـدا خەباتی شار بگوازمەوە بۆ شاخ.

پێش ئەوەی بڕۆم مامۆستا واحیدی حەمـە خانم بینی کە ماوەیەك بـوو لــە خــوارووی عــێراق لــە نەفیکردنەکــەی گەڕابوویــەوە و پێکــەوە کــاری ڕێکخسـتنمان دەکـرد. پـاش مشـتومڕێکی زۆر هـەر ئـەو ڕۆژە خـودا حـافیزیم لێکـرد و ئـەویش زۆری پێخۆشـبوو بـەو تەمەنـەوە دەچـمە شـاخ، ئامـادەیی خۆیشی دەربڕی بۆ هەموو هاوکاریەك.

لـە کۆتـایی مـانگی چواری سـاڵی (١٩٧٩) بڕیـاری یـەکجاریم داو بـۆ ئـەم مەبەسـتە سـەردانێکی مامۆسـتا مـەحمود قـەرەداخیم کـرد و پێمگـوت بڕیـاری یەکلاکـەرەوەم داوە و دەچـمە شـاخ. پاشـان ئـەویش نامەیـەك و راسـپێرییەکی زارەکی دامێ بۆ مامۆستا ئەنوەر کە کادری ڕێکخستن بـوو لە هەرێمی (٥)ی قەرەداخ. دواتر لەگەڵ ساڵحی ئەولکەریمە سوور، ناوی خوامان لێهێنا و بـەرەو قەرەداخ بەڕێکەوتین.

سەرەتای مانگی پێنجی (١٩٧٩) لە بەلـەکجار پەیوەنـدیمان بـە برادەرانی شـاخەوە کـرد و بووینـە پێشـمەرگە لـە ڕیـزی یـەکێتی نیشـتمانی کوردسـتان. بـرادەرانیش پـاش بـەخێرهێنان خۆشـحاڵیی خۆیانیـان دەربـڕی، مـن لەگـەڵ

هەندێکیاندا ئاشنایەتی و دۆستایەتی لە پێشینەم هەبوو بەو حوکمەی لە قۆناغەکانی پێشتردا پێکەوە پێشمەرگە بووین.

ئەو کاتەی پەیوەندیم پێوەکردن چەند رۆژێك بوو سیروان تاڵەبانی شەهید بووبوو، هێشتا برینی شەهید بوونەکەی ساڕێژ نەبووبوو. خەڵك و پێشمەرگە زۆر غەمبار و زۆربەیان ڕیشی خەفەتباریان نەتاشیبوو، هەرێمەکەش هێشتا بێ فەرماندە مابوویەوە چونکە پڕکردنەوەی جێگەی کەسێکی وەك شەهید سیروان هەروا ئاسان نەبوو.



مام دەروێش - مامۆستا واحید حەمەخان

٢٠١٨

## شەڕی سەربازگەی خاتوو نازدار

ماوەیەکی کەم بوو بوویووم بە پێشمەرگە بڕیارماندا بچینە سەر سەربازگەی خاتوو نازدار لە نزیک ناحیەی قەرەداخ. دوای ئەوەی زانیاری تەواومان وەرگرت، بەشەو چووینە شوێنی دیاریکراو تەقەمان لە سەربازگەکە کرد. من ئاربیجییەکم تەقاند بەر تەنکی بەنزین کەوت و گڕی گرت، ئەو ناوە بە شێوازێك ڕووناك بوویەوە مەترسییمان لەسەر درووست بوو، برادەرانیش لە چەند لایەکەوە سەربازگەکەیان دایە بەر دەسرێژی چەکەکانیان. لەو پێشمەرگانەی لە چالاکییەکەدا بەشداربوون و ناوەکانیانم لە بیرماوە بریتی بوون لە:

سالْحی کوێخا عەزیز، عەلە ڕەش و ئازادی کوڕی، سەردار ناوتاقی، حسەینی حامید (ژاڵەناوی) و چەن پێشمەرگەیەکی دیکەیش بەداخەوە ناوەکانیانم لەبیر نەماوە. ئەم شەڕە لە لایەکەوە بۆ ئەوە بوو بە حکومەت بڵێین پێشمەرگە بوونی هەیەو دەتوانێ چالاکی سەربازی ئەنجام بدات و زەبری کاریگەر بوەشێنێ. لە لایەکە دیکەشەوە ورەی جەماوەرەکەمان بەرز بکەینەوە و سەرەنجی خەڵکی کوردستان بەلای خۆماندا ڕابکێشین.

لەم شەڕەدا حەمە قاشتیشمان لەگەڵدا بوو بە پێویستی ئەزانم کەمێك لەبارەی ئەم کەسایەتییەوە بدوێم، کە تەمەنێك لە مەفرەزە و کەرت و تیپەکاندا پێکەوە بووین و وەك دوو هاوڕێ زۆر لە نزیکەوە پەیوەندیمان هەبوو. کاکە حەمە پێشمەرگەیەکی ئازا و ڕۆح سووك و گورج و گۆڵ بوو و لە مەیدانی شەڕدا زوو دەهاتە دەست. ساڵی (١٩٧٤) کاتێك حیزبی شیوعی لەگەڵ حیزبی بەعس لە یەك بەرەدا بوون تەمەنی لە دەوروبەری (١٣)

سـالّیدا دەبێـت، تفـەنگێکی کلاشـینکۆفی شـیوعیەکان دەفرێنێـت و لـە دەربەندیخانەوە بەپێ دەچێت بۆ گوندی چنارە کە بارەگای پارتی لەوێ بووە ئەو کاتە مامۆستا جەمال تاهیر لێپرسراوی بارەگاکە بووە، لای ئەوان دەبێت بە پێشمەرگە تا کۆتایی شۆڕشی ئەیلول، ساڵی (١٩٧٥) لەگەڵ خێزانەکەیان ئاوارەی ئێران دەبن و هەمان ساڵ دەگەڕێنەوە بۆ عێراق و نەفی دەکرێن بۆ پارێزگای حللە.

ساڵی (١٩٧٧) گەڕانەوە بۆ قاشتی. هەمان ساڵ لە ڕێگەی عەلی حسێن و سـۆران و شـەهید حەمەسـعید ئیمـام قـادری پەیوەنـدی بـە کۆمەڵـەی ڕەنجدەرانەوە دەکات. ساڵی (١٩٧٨) دەچێتە شاخ و لە هەرێمی (٥)ی قەرەداغ دەبێـت بـە پێشـمەرگە. سـاڵی (١٩٨٢) لـە گونـدی سێوسـێنان پێکـەوە لـە کۆنفرانسی ناوچەیی کۆمەڵە بەشدار بووین. خێزانەکەیان چەندین جار لە لایـەن حکومـەتی بەعسـەوە زینـدانی کـراو، جارێکیـان بـەعس چـووبوون بـۆ گوندی قاشتی بیانگرن، دایکی نەخۆش دەبێت لەسەر جێگە کەوتووە، ناچار سەربازەکان بە باوەش دەیخەنە ئیڤاکەوە.

لە (١٩٨١/٤/١٧) لەو سەرکەوتنەی شەڕی ئالان وحاسڵدا کە پێشمەرگەی لایەنەکان دژی هێزەکانی حکومەتی بەعس کردیان و ئامر لیوایەکیشی تێدا کوژرا، حەمە قاشتی ڕۆڵێکی هێجگار کاریگەریی بینی، بەڵام بە داخەوە ئەو کەسانەی مێـژووی شـەڕەکەیان تۆمـار کـردووە باسـی ئـەو ڕۆڵـە کاریگـەرەی کاکـە حەمـەیان نـەکردووە، کـە ئەمـەش غـەدرێکی گەورەیـە لـە ئازایـەتی ئـەو پیاوە.



**راوەستاوەکان لەلای راستەوە: نەناسراو، نەناسراو، ساڵح کوێخا عەزیز**

**دانیشتوو: مام دەروێش (١٩٨٠)**



**سەردار ناوتاقی**




**حسەین حامید ژاڵەناوی**

## تەقەکردن لە کۆپتەر

ڕۆژێك لەسەر شاخ لە پشت گوندی (کۆشك)ەوە بووین، کاتێکمان زانی کۆپتەر هات و زۆر بە نزمی بەسەرماندا دەسوڕانەوە، وەك هەستیان کردبێت پێشمەرگە لەو ناوەدایە سەرباز و جاشێکی زۆریان لەسەر لووتکەی شاخەکان دابەزاند. پاش ماوەیەك کە هیچیان بەدی نەکرد زۆر نزم بوونەوە دەیانویست سەربازەکان هەڵگرنەوە. منیش لەو کاتەدا تەقەم لێکردن و کۆپتەرەکان بەخێرایی بەرزبوونەوە و بە شەستتیر دەوروبەرەکەیان دابێژا، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر لە بەرزییەوە تەقەیان دەکرد مەترسییان بۆ ئێمە نەبوو. لەو کاتەدا مام ڕۆستەم بە تووڕەییەوە هاواری کرد بۆ تەقەدەکەن. لە حەشارگەکانماندا ماینەوە تا کات درەنگی کرد. پاش ئەوەی نەیانتوانی شوێنەکانمان دەستنیشان بکەن کۆپتەرەکان نزم بوونەوە و سەربازەکانیان هەڵگرت و گەڕانەوە. ئێمەش زۆر بێزار بووبووین لە خۆحەشاردان، کە تاریك داهات هەموومان لەناو دێدا یەکمان گرتەوە. مام ڕۆستەم گوتی مام دەروێش بۆ تەقەت کرد؟ شێخ جەعفەر گوتی مام دەروێش تەقەی لە فڕۆکەی مێك کردووە کۆپتەر چیە! بوو بە پێکەنین، ئیتر مام ڕۆستەم هیچی دیکەی نەگوت. شێخ جەعفەر مەبەستی شۆڕشی ئەیلوول بوو کە لە شەڕی سەرتیزدا پێکەوە بووین.

مام ڕۆستەم فەرماندەی کەرت بوو، پیاوێکی زۆر ئازا و قارەمان و قسە خۆشیش بوو. لەو سەردەمەدا پابەندبوون بە فەرمان و ڕێنماییی زۆر بەهێز بوو، هەموو پێشمەرگەو فەرماندەکانیش لە خەمی یەکتردا بوون، دیاربوو مام ڕۆستەمیش لە خەمی گیانی پێشمەرگەکانەوە پێی ناخۆش بوو کە من تەقەم لە کۆپتەرەکە کردبوو.

## هاتنی مەلا بەختیار و مستەفا چاوڕەش

نزیکەی دوو مانگێك تێپەڕیبوو لە هاتنم بۆ شاخ. پێیان ڕاگەیاندین کە بڵاوە نەکەین. هەستمان کرد ئامادەکارییە بۆ هاتنی لێپرسراوێك، کاتێکمان زانی لە بەلەکجاڕ کاك مستەفا و دەستەکەی پەیدابوون، دیاربوو فەرماندەکانمان لەوە ئاگادار کرابوونەوە. پاش چەند ڕۆژێکی کەم مەلا بەختیاریش پەیدابوو. زانیمان هاتنی ئەمانە سەردانێکی ئاسایی نیە. مەلا بەختیار لە گوندی بەڵخەی قەرەداخ لەسەر کانی و ئاوێك کۆبونەوەیەکی فراوانی پێکردین و وێنەیەکی یادگاریشی لە تەکماندا گرت. کۆبوونەوەکە بە بەرفراوانی گیرا، چونکە بە گشتی هەموو پێشمەرگە و فەرماندەکانی هەرێمی پێنج ئامادە بوون. مەلا بەختیار لە کۆبوونەوەکەدا کاك مستەفا چاو ڕەشی وەك فەرماندەی هەرێمەکە پێ ناساندین و باسی هەلومەرجی شۆڕش و ئەرکە ستراتیژیەکانی ئەو سەردەمەی بۆ ڕوون کردینەوە. لە کۆبوونەوەکەدا پرسیارم کرد ئایا ئێمە بەو هێزە کەمە لە ئاست هێزە زۆرو زەوەندە پڕ چەکەکەی حکومەتی عێراقدا دەتوانین چی بکەین! ساڵی (١٩٧٥) بەو هەموو هێزەی شۆڕشی ئەیلولەوە نەمانتوانی هیچ بکەین، چونکە بە موئامەرەی وڵاتە زلهێزەکان و ئیقلیمییەکان هەرەسیان پێهێنایین. ئایا ئێستا شۆڕش ئەو کەموکوڕییەکانی ئەو ئەزموونە تاڵەی لەبەرچاو گرتووە؟ لە وەڵامدا مەلا بەختیار گوتی مام دەروێش ئێمە لە ژمارەدا کەمین بەڵام ئیرادەمان هەیە و بەرگری لە مافێك دەکەین کە مافی ڕەوای خۆمانەو دڵنیابە بەو هێزە کەمەوە وا لە حکومەتی عێراق دەکەین دان بە مافە ڕەواکانی گەلەکەماندا بنێت. سیاسەتی ئەمجارەی شۆڕش زۆر جیاوازە لە شۆڕشی ئەیلول. بە یاوەری مەلا

بەختیار جەولەیەکمان بە دێهاتەکانی قەرەداخدا کرد و کۆبوونەوەی لەگەڵ خەڵکی دەڤەرەکە کرد و کاک مستەفا چاوڕەشی وەك فەرماندەی هەرێمەکە بە ڕێکخستنەکان و خەڵکی ناوچەکە ناساند. پێی ڕاگەیاندن کە بەفەرمانی سەرکردایەتی لە جێگەی شەهید سیروان تاڵەبانی کاك مستەفا کراوەتە فەرماندەی هەرێمی پێنجی قەرەداخ. پاش ماوەیەك مەلا بەختیار هەندێك پێشمەرگەی لەگەڵ خۆیدا بردو گەڕایەوە بۆ سەرکردایەتی.

لێرەدا حەز دەکەم ئەوە بڵێم بۆ سێیەم جار و لە سێ شۆڕشی جیاواز و لە سێ قۆناغی یەك بەدوای یەکدا من و کاك مستەفا بە یەکتری شادبووینەوە. قسەکەیم هاتەوە یاد کە لە زۆزك پێی گوتم دەروێش ئاگاداری خۆت ببە زۆرمان لە بەردەمدا ماوە با بمێنێیت بۆ شۆڕشەکانی دیکە.

هاتنی کاك مستەفا گڕوتینێکی چاکی بە پێشمەرگەکانی هەرێمەکە دا. یەکەم کار هەرێمەکەی لە ڕووی سەرژمێری و پەیوەندییان بە ڕێکخستنەکانی نێو شارەوە ڕێکخست و شوێن و کارەکانی کەرت و مەفرەزەکانی دیاری کرد و هەر یەکەیانی بۆ شوێنی دیاریکراوی خۆی ڕەوانەکرد.

کاك مستەفا ئەزمونێکی زۆری لە پێشمەرگایەتی و کاری ڕێکخستندا هەبوو. من بۆ خۆم لە دوو شۆڕشی پێشوتردا وەك فەرماندە گەواهی ئەوەی بۆ ئەدەم کە بەشدارییەکی کارای هەبووە. جارێکی دیکەش کە جاری سێیەمە هەر زوو بووە جێگەی متمانەی یەکێتی و پێشمەرگە. کاك مستەفا بە جۆرێك هەرێمی پێنجی لە ڕووی چەندایەتیی و چۆنایەتییەوە ڕێکخستەوە کە هەرێمە ببێتە یەکێك لە هەرێمە هەرە کارا و چالاکەکانی کوردستان. وەك چۆن بە زوویی لەلای پێشمەرگە بووە جێی متمانە بە هەمان شێوە بەزوویی جێگەی خۆی لە دڵی خەڵکی ناوچەکەشدا کردەوە و بووە جێگەی ئومێدی

هەرێمەکە. کاك مستەفا جگە لە بوێری و شارەزایی کاری پێشمەرگایەتی و دڵسۆزی بۆ مافی ڕەوای نەتەوەکەی، فەرماندەیەکی بەوەفا بوو، هەم وەك فەرماندە هەم وەك هاوڕێ، تا ئێستاش سەردانم دەکات و لە باری تەندروستیم دەپرسێت.

من و کاك مستەفا لەبەر ئەوەی پێشتر یەکتریمان دەناسی متمانەی زۆری پێم هەبوو، بۆیە منی کردە فەرماندەی دەستەکەی خۆی، لەو کاتەدا تەمەنم (٤١) ساڵ دەبوو، من و حاجی عبدوڵڵا هۆرێنی و عەلە ڕەش و مامە عەزە و ساڵح گۆڕنەسپی، لە پێشمەرگە بە تەمەنەکانی هەرێمی قەرەداغ بووین، تاڵە سپیەکانی سیمامان تەنگیان بە تاڵە ڕەشەکان هەڵچنیبوو. پێشمەرگە لاوەکان پێیان خۆشبوو ئێمەی بەتەمەن لە نێویاندابین دەیانزانی بە ئەزموونی چەکداریمان لە شۆڕشەکانی پێشووتردا هاوکاریان دەبین. چونکە یەکێکی وەك من جگە لە شەڕی تونەیلی دەربەندیخان ئەمە سێیەم شۆڕشم بوو بەشداری تێدا بکەم.

گەر ئاوڕێك لە ژیانی پێشمەرگایەتی بدەینەوە دەبینین کە چەند ژیانێکی سەخت و دژوار بوو بۆ ئێمەی ئێشمەرگە. هەموو کەس توانای خۆ ڕاگرتنی نەبوو. دەبوو بە ڕۆژ لە شاخ و دۆڵ و شوێنە نەدیووەکاندا بماینایەتەوە و خواردنی ئەو ڕۆژەمان لەگەڵ خۆمان ببردایە تا ئێوارە دادەهات و تاریکی دەکرد ئینجا دەگەڕاینەوە نێو گوند. زۆر بە وریایەوە نانمان دەخوارد و لەدوای پشویەکی کورت شوێنێکی دیکەمان دیاری دەکرد بۆ خەو، هەمیشە بە شەو جەولەمان دەکرد و کادیرە سیاسییەکانیش کۆبوونەوەیان بە خەڵك دەکرد و لەبارەی دروستبوونەوەی شۆڕشی نوێ بەڕابەریایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان وتاریان بۆ خەڵکی دەدا.

سەرەتای درووستبوونەوەی شۆڕش هەرچەند خەڵك بێ هیوا بوون لە

هەڵگیرسانەوەی بەڵام بە خێرایی هیواو ئومێدی بەهەموو لایەکدا بڵاو بوویەوە و بە خۆشییەکی زۆرەوە پێشوازی لێکرا. دوژمنیش بە هەموو شێوەیەك هەوڵی دەدا درووستبوونەوەی شۆڕش و پێشمەرگە لە لانکەدا زیندەبەچاڵ بکات، چونکە ئەو لەو باوەڕەدا بوو لەدوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلوول جارێکی دیکە شۆڕش درووست نابێتەوە.

دوای ئەوەی ئەحمەد حەسەن بەکر لە سەرۆك کۆماری لادرا و سەدام حسەین چووە جێگەی هەوڵی قایمکردنی پایەکانی حزبی بەعسی زۆر زیاتر دەدا. ڕۆژانە کۆپتەر ئیشی گەڕانبوو بە دوای پێشمەرگەدا لە هەرکوێ سوسەی بکردایە پێشمەرگەیەك هەیە سوپا و جاشیان بە کۆپتەر دادەبەزاند و پەلاماریان دەدان. بۆ لەباربردنی شۆڕش ئامادەی هەموو جۆرە خەرجییەکی شەڕ بوو، بەتایبەتی دوای ساڵی (١٩٨٤) بەشێوەیەکی زۆر بەرفراوانتر لە پێشوو تەماحی پارە و پوولێکی زۆری خستبووە بەردەم خەڵکانی سەرۆك خێڵ و عەشیرەتەکان و ئەوانیش جاشێکی زۆرو زەوەندیان ناونووس کردبوو کە بەهەر شێوەیەك بتوانن زیان بە هێزی پێشمەرگە بگەیەنن. سیخووڕەکانیان دەنارده نێو پێشمەرگە تا زانیارییان پێبدەن، ئەگەر هەلیشیان بۆ ڕێکەوت زەبری کوشندەیان لێبدەن و بگەڕێنەوە و هەمیشە پێشەنگی سووپایان دەکرد. ئەم سیخوڕانە جۆرە گومانێکیان لای سەرکردایەتی شۆڕش دروست کرد کە هەموو کەس بە ئاسانی نەیدەتوانی پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەو شۆڕەکەیەوە بکات بۆیە شۆڕش بڕیاری دا هەرکەس پەیوەندی بە ڕیزەکانی شۆڕشەوە بکات ئەگەر نامەی ڕێکخستنی پێنەبووایە وەیا کەسێکی باوەڕپێکراو کەفیلی نەکردایە ڕێو شوێنی پێویستی بۆ دەگیرایەبەر و ماوەیەك دەخرایە ژێر چاودێرییەوە، یا داوای لێدەکرا لەنێو شاردا چالاکییەك ئەنجام بدات بۆ ئەوەی متمانە پەیدابکات و چەکی بدرێتێ.

## پێشمەرگە بەتەمەنەکانی هەرێمی ( ٥ )ی قەرەداخ



عەلی عەبدولقادر ناسراو بە عەلە رەش
ساڵی ١٩٢٩ لە گوندی ( کوێرەك ) لەدایك بووە
لە ٢٠٠٩/١٢/٢٣ کۆچی دوایی کردووە



عەزیز مەحمود حسەین ( مامە عەزە )
ساڵی ١٩٢٥ لە گوندی ( هۆرێن ) لەدایك بووە
لە ٢٠١٧/١/٢٦ کۆچی دوایی کردووە



ساڵح عەلی فارس ناسراو بە دەروێش ساڵح
ساڵی ١٩٣٨ لە گوندی ( سیارە ) لەدایك بووە.



حاجی عەبدوڵڵای هۆرێن
ساڵی ١٩٢٧ لەدایك بووە



ساڵح رۆستەم ناسراو بە ( ساڵح گۆڕسپی )
ساڵی ١٩٢٧ لەدایك بووە

## یەکێتی نیشتمانی کوردستان و متمانەی جەماوەر

یەکێتی بە شێوەیەك ڕەگوڕیشەی لە نێو جەماوەردا داکوتابوو ببووە جێگەی متمانە و ئومێدی زۆربەی خەڵکی کوردستان. جگە لەوەی لەشاخ هێزێکی تۆکمەی هەبوو لەنێو شاریشدا خاوەنی جەماوەرێکی زۆر بوو، بە تایبەت لە پارێزگای سلێمانی و قەزا و ناحیە و گوندەکانی دەوروبەری هەرکات بیویستایە و پێویستی بکردایە بە ڕێپێوان و خۆپیشاندان و شێوازەکانی تری خەباتی شارستانی شەقامی دەجوڵاند. ڕۆژ بە ڕۆژ ناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەستی پێشمەرگە فراوانتر دەبوو، لاوان نەدەچوونە خزمەتی سەربازی پەیوەندییان بە هێزی پێشمەرگەوە دەکرد یا ڕوویان لە دێهاتەکانی ژێر دەستی پێشمەرگە دەکرد بۆ ئەوەی بێ ترس لە ناوچە ئازادکراوەکاندا بژین.

ئەم بەرفراوان بوونەی ناوچە ئازاد کراوەکان و کۆبوونەوەی خەڵکێکی زۆر لەم شوێنانە، یەکێتی ڕووبەڕووی بەرپرسیارێتی دەکردەوە لەو کێشانەی کە لە ناوچانەدا ڕوویان دەدا. لەم بارەیەوە باسی بەشێك لەو ڕووکارە شارستانییەی یەکێتی نیشتمانی دەکەم کە لە ڕووی کارگێڕییەوە کاری لەسەر دەکرد.

لێرەدا باسی ناوچەی قەرەداغ و شارەزوور و بەشێك لە گەرمیان دەکەم بە پێیەی زۆربەی کاتەکانی پێشمەرگایەتیم لە ناوچانەدا بووە. لە قەرەداغ ئیش و کارەکان زۆر بە باشی بەڕێوە دەچوو لەبەر ئەوەی هەم خەڵکەکەی کەم کێشە بوو، هەم یەکێتیش فەرمانڕەوای تاك لایەنە بوو جگە لە بوونی حیزبی شیوعی هیچ لایەنێکی تری تێدا نەبوو، حیزبی شیوعیش دەستیان وەرنەئەدایە کارەکانی یەکێتییەوە. هەر لە چوونی یەکەم مەفرەزەی شۆڕشی

نوێ بۆ شاخ یەکێتی نیشتمانی سەرباری خەباتی سیاسیی و پێشمەرگایەتی هەوڵی دەدا جگە لە چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتییەکانی ناوچەکە دەیویست لەڕووی کارگێڕیشەوە کاروباری ناوچەکە ڕێك بخات، بۆ ئەم مەبەستە هەمیشە کۆبوونەوە بە خەڵکەکەی دەکردو کێشەکانی بۆ یەکلایی دەکردنەوە و زۆر گرنگی بەم کارانەی لای خوارەوە دەدا و بە کردەوە ئیشی بۆ دەکردن:

**١ - پاکوخاوێنی**

شۆڕش زۆر گرنگی بە پاك و خاوێنی و پاك ڕاگرتنی سەرچاوەکانی ئاوی ئەو دێهاتانەی دەدا کە سەرچاوەی ئاویان هەبوایە، داوای لە دانیشتوانەکەی دەکرا کە پارە کۆ بکەنەوە و بیکەن بە حەوز و بە بۆری ئاوەکە بۆ ناوەندی گوندەکە ڕابکێشن و هەریەکە بە سۆندە ئاو بۆ ماڵی خۆی ڕا بکێشێت، هەر ماڵێك سەرئاو (تەوالێت)ی تایبەت بەخۆیان دروست بکەن و سەرچاوە ئاوییەکانی وەك کانییەکان لە هەموو پیسی و پاشەڕۆیەك بپارێزن و پاشماوەی ئاژەڵەکانیشیان لە دووری گوندەکانەوە فڕێ بدەن و پاشان بیانسووتێنن. گەر ئاژەڵێك مردار بوویەوە بیخەنە ژێر خاك یا بیسوتێنن، چونکە دەبێتە مایەی چەندین نەخۆشی خراپ بۆ دانیشتوانی ناوچەکە.

**٢ - بواری ژینگە:**

یەك لە بوارانەی زۆر گرنگی پێ دەدرا بواری ژینگە بوو. لەم ڕووەوە بڕینی داری تەڕ و ئەو دارە گەورەو جوانانەی کە سروشتێکی جوانیان بەخشیبوویە ناوچەکە قەدەغە کرابوو، لە کاتی زاو و زێی باڵندە کێوییەکانی وەك کەو و سوێسکە و کەڵەکێوی هەموو پەلەوەرەکانی دیکە و سەرچاوە ئاوییەکانی وەك ماسی بە هەموو شێوەیەك ڕاو قەدەغە کرابوو. ڕاوی

بەکۆمەڵکوژی لەرێی تەقینەوە قەدەغە بوو، لەسەر سەرپێچی چەندین جار لێپرسینەوە لە ئەنجامدەرانی کراوە. گەر ئاژەڵێك مردار بوایەتەوە دەبوو بخرێتە ژێر خاك یا بسوتێنرایە بۆ ئەوەی ژینگەی ناوچەکە ژەهراوی نەبێتە مەڵبەندی چەندین نەخۆشی خراپ.

### ٣ – کێشەی زەوی و زار:

دابەشکردنی زەوی و جیاکردنەوەی نێوان دوو زەوی، کێشەیەکی سەرەکی شۆرش و دێهاتییەکان بوو، بە تایبەتی ئەو زەویانەی کە یاسای چاکسازی عێراق دابەشی کردبوونەوە و سەر لە نوێ ئاڵۆزی تێکەوتبوویەوە و دەبوو شۆرش بە پێی یاسا یان شاهیتحاڵ یان پیاوماقوڵی گوندەکان کێشەکانی چارەسەر بکردایە. لە شارەزوور لەبەرئەوەی زەویان زۆر بوو کێشەی زەوی و زاریشیان زۆر بوو. لە سەردەمی عەبدولکریم قاسم و لە سەرەتای حەفتاکانەوە حکومەت زەوی و زاری بەسەر جوتیارەکاندا دابەش کردبوو، زۆرێکیش لە زەویەکانی ئەو ناوچەیە دەریاچەی دەربەندیخان دایپۆشیبوو، لە هاوین و پایزدا ئاوی دەریاچەکە کەمی دەکرد و زەویەکی بە پیت لە شوێنی جێدەما و دەبووە هۆی گۆرانکاری لە سنوری خاوەنداریێتییەکەی، هەرچەند ئەم زەوییانە لە کاتی خۆیدا قەرەبوویان وەرگرتبوو، بەڵام سەر لە نوێ خۆیان دەکردەوە بە خاوەنی. ئەم رووداوانە کێشەیەکی زۆری لەنێو جوتیارەکانی هەمان گوند یا جوتیارەکانی دوو گوندا دروست دەکرد. حکومەتی عێراق و لایەنەکانی سەر گۆرەپانی کوردستان دەستیان وەرنەدایە کێشەکە و فرە کوێخاییەك رووی دەدا زۆرجار ئەوەی دەسەڵاتی زیاتری هەبوایە بەرژەوەندییەکان بەلای ئەودا یەکلا دەبووە. جاری وا هەبووە شەری لایەنەکانی لێ کەوتووەتەوە چونکە هەر یەکەیان سەر بە لایەنێکی سیاسی

بـووە، پیاوەکـانی بەعسـیش ئەوەنـدەی بۆیـان بکرایـە ئـاگری ناکۆکیـەکانیان خۆش دەکـرد. لـە ناوچەی قـەرەداغ ئـەم کێشانە زۆر کـەم بـوون، چونکە یـەك فەرمانڕەوا و یەك دادوەر و یەك یاسا کێشەکانی چارەسەر دەکرد.

### ٤ – کێشەی کۆمەڵایەتی:

زۆرتـرین کێشە کـە ڕووبـەڕوومان دەبوویـەوە کێشـەی کۆمەڵایـەتی بـوو، وەك شـەرکردن و ژن بـە شـودان جیابوونـەوە هاوسـەرەکان. شـەڕکردنی نێـوان خێزانـەکان یـان گوندنشـینەکان لەسـەر دار و ئـاو و لـەوەڕگای مـەڕومالات دروسـت دەبـوو، کـە لایـەکیان زاڵـم و لایـەکیان زوڵـم لێکـراو بـوو. هـەردوولای شـەڕەکەرمان بـانگ دەکـرد و بـە ئاشـتی ڕێکمـان دەخسـتنەوە و مـافی بەشـخوراومان دەگێڕایـەوە بـۆ خاوەنەکـەی، ئەگـەر پێویسـتی بکردایـە تاوانبارمان بە گرتن یان بە غرامەکردن سزا دەدا بە تایبەت ئەو کاتانەی کە بارەگـای هەمیشـەیمان هـەبوو، یـا بەڵێننامـەمان لـێ وەردەگـرتن کـە جارێکی دیکە دووبارەی نەکەنەوە.

ژن بە ژن و شیربایی وەرگرتن و گەورە بە بچوك لەو کێشانە بـوون زۆر ڕووبـەڕووی شـۆڕش دەبوویـەوە. جـاری هـەبووە کچێك بـە منـداڵی لەسـەر بێشکە مارە کراوە و کە گەورە بووە ئامادە نەبووە هاوسـەرگیری لەگەڵ ئەو کـوڕەدا بکـات، کـە بـۆی مـارەبڕاوە. ئەمـە دەبـووە هـۆی شـەڕ و تـۆرانی ژن و لێکترازانی شیرازەی خێزانـەکان. لـەم کاتانـەدا شۆڕش چارەسـەری دەکـرد و لە هەموو چارەسەرەکانیشدا ڕێز لە بنەماکانی ئیسلام دەگیرا و ڕاوێژ بەو زانا و مـەلا ئاینیانـە دەکـرا کـە ئاسـتی زانیارییـان بـەرز بـوو. لـەم ڕووەوە شـۆڕش هاوسەرگیریی گەورە بە بچوکی قەدەغە کـرد و پرۆسـەی ژن بـە ژن زۆر کـەمی کرد.

له دوای هەشتاكان شۆڕش پەرەی سەند و ناوچەی ڕزگار كراو فراوانتر بوو. بۆ یەكلاكردنەوەی كێشەكان ڕووبەڕووی پیاوی یاسایی و بە ئەزموون دەكرایەوە، چ بە یاسای عێراقی بێت یان ئەو یاسایانەی شۆڕش دایناوبوو كە تایبەت بوو بە هەلومەرجەی ئەو كاتە.

پێشمەرگە لە خۆشی و ناخۆشی خەڵكدا هاوبەش بوون. لەو ناوچانەی كە لەژێر دەسەڵاتی شۆڕشدا بوون كاتێك هاوڵاتییەك كۆچی دوایی دەكرد پێشمەرگەكان بەشداریی مەراسیمی سەر قەبرانیان دەكرد جاری واش هەبوو كادیرێك بەچاكی زانیوە لەو قەرەباڵخییەدا وتارێكی بە نرخ بدات كە جێی ڕەزامەندی ئامادەبووان بووە. پێشمەرگە چۆن بەشداریی ناخۆشییەكانی خەڵك دەبوون. بەهەمان شێوە بەشدار دەبووین لە خۆشیەكانیشیاندا كاتێك هاوڵاتیەك ئاهەنگی ژن گواستنەوەی دەكرد ڕۆژێك پێش ئاهەنگەكە ئاگاداری ئەو بارەگایانەی دەكرد كە نزیك بوون لە ئاهەنگەكە و بانگهێشت دەكران بۆ زەماوەندەكە. هەمیشە پێشمەرگە بانگ دەكرا بۆ قوربانی سەربڕین و مەولونامە و ئاهەنگی منداڵ ناونان و زۆرجار خاوەن منداڵ داوای لە كادیرەكان دەكرد ناوی منداڵەكانیان بنێن، كادیرەكانیش ئەگەر كوڕ بوایە ناوی شەهیدەكانیان لێ دەنان وەك (ئارام و سیروان و گۆران و چیا) ئەگەر كچ بوایە ناوی (ئاوات و كوردستان و كوردە و گەرمیان و كوێستان و زۆزك و ئاسۆسیان) لێ دەنان. لە ناوەڕاستی هەشتاكاندا ماڵی كەمالی مام ڕەوف لە گوندی مچەكوێر كوڕێكیان تازە بووبوو، كاك كەمال داوای لێكردم ناوێكیان بۆ بدۆزمەوە، منیش لە كاتەدا ناوی (ڕەنجدەر)م بۆ هەڵبژاردن و ئەوانیش زۆر بە دڵیان بوو.

## دارایی پێشمەرگە

لە سەرەتادا باری دارایی شۆڕش زۆر خراپ بوو، پارەی پێشمەرگە لەلایەن کەس و کاریانەوە دابین دەکرا. ئەو پارە کەمەی کە دەستی شۆڕش دەکەوت بەشێکی زۆری لە بازاڕی ڕەشدا چەك و تەقەمەنی پێ دەکڕدرا. خواردنی پێشمەرگە لەلایەن گوندنشینانەوە بوو، بە هەمان شێوە خەوتنیش یا لە ماڵە گوندنشینەکان یا لە مزگەوتەکانی نێو دێیەکاندا دەبوو، جل و بەرگ و پێڵاویش یا لەڕێی کەسوکار یا لەلایەن ڕێکخستنەکانی شارەوە دابین دەکرا. هەر کەسێ مووچەخۆر بوایە و دەستی پێشمەرگەی پێبگەشتایە مانگانەی لێ وەردەگیرا.

لە دوای شەڕی عێراق – ئێران پیشمەرگە زیاتر دەسەڵاتی پەیداکرد و بارەگامان دانا، ئەو کەسانەی دەوڵەمەند بوون کە کارگە یان کارێکی باشیان هەبوو پارەیان لێ وەردەگیرا زۆر جاریش لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانی نێو شارەوە داوای هاوکاری لە خەڵکانێکی دیکە دەکرا گەر بزانرایە لە توانیدایە. بۆ ئەم مەبەستە لە هەموو تیپەکاندا لێپرسراوی دارایی دانرابوو کە سەرپەرشتی مەسرەف و داهاتی پێشمەرگەی دەکرد. لەسەرەتای شۆڕشدا پێشمەرگەی سەڵت مانگی (٥) دینار هاوکاری وەردەگرت، خێزانداریش (١٠) دینار. لە دوای ساڵی (١٩٨٥) دارایی شۆڕش باشتر بوو، خێزاندار (٥٠) دیناری وەردەگرت جاری واش هەبوو باری دارایی باش نەبوو کەمترمان وەردەگرت.

دەرمان و چارەسەری نەخۆشی و بریندداری پێشمەرگە لەڕێی ڕێکخستنەکانی نێو شار یا خەڵکانی کارمەندی بواری تەندروستی یا پزیشکە دڵسۆزەکانەوە دابین دەکراو دەگەیەنرایە بارەگاکانی پێشمەرگە. بەو داراییە کەمەی شۆڕش خەستەخانەیەکی بچووك دروستکرابوو بۆ نەشتەرگەری

چارەسەرکردنی پێشمەرگە، گەر برینداری پێشمەرگە لە کوردستان چارەسەر نەکرایە دەبرایە دەرەوەی کوردستان بەهۆی ئەوەی شۆڕش دۆستایەتی و جۆرێك لە پەیوەندی بە وڵاتانی ناوچەکەوە هەبوو، بە تایبەت ئەو وڵاتانەی دوژمنایەتیان لەگەڵ رژێمی بەعس هەبوو وەك دەوڵەتی سوریا یا دەوڵەتی ئێران کە لەگەڵ عێراقدا لە جەنگدا بوو.

### ناوزەنگ

کاك مستەفا بۆ کۆبوونەوەی سەرکردایەتی لە ناوزەنگ بانگهێشتکرابوو، دوای خۆئامادەکردن بە هێزێکەوە بە ڕێکەوت منیش یاوەری بووم. چەند ڕۆژێك لەوێ ماینەوە کە کۆبوونەوەکە کۆتایی هات گەڕاینەوە و هەندێك چەك و تەقەمەنیمان لەگەڵ خۆماندا هێنا. لەبەر ئەوەی بە خاکی ئێراندا دەهاتینەوە ڕێگایەکی دور و نارەحەتمان بڕی، لەو شوێنانەی ئاو دەهاتە ڕێمان بە زەحمەت چەکەکانمان دەپەڕاندەوە. لە شوێنێك بە سیم پەڕینەوە کە مەترسییەکەی هیچی لە مەترسی شەڕ کەمتر نەبوو. کە هاتینەوە بە دیوی عێراقدا کەشوهەواکەی زۆر ساردبوو لە گاپێلۆنیش تووشی کەمینێکی سوپای عێراق هاتین و بە زەحمەت رزگارمان بوو.

### دیداری مام جەلال

لە ناوزەنگ بەڕێز مام جەلال کۆبوونەوەیەکی فراوانی پێکردین کە هەمووان بەشداربوون، لەو کاتەدا ماوەیەك بوو بزووتنەوەی سۆشالیست لە یەکێتی جیابووبوویەوە و لە نزیك بارەگاکانی یەکێتی بارەگایان دانابوو. مام جەلال باسی وەزعی یەکێتی نیشتیمانی و کێشەکانی بەردەم بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردی کرد و باسی ئەوەی کرد کە بزووتنەوەی

سۆشیالیست بەشێکیان لە یەکێتی جیابووەنەتەوە و زۆر هەوڵمان دا کارەکە بەوە نەگات بەڵام دواتر ئەوان بڕیاری خۆیان دا و لە یەکێتی جیاببنەوە کە ئێمە خۆشحاڵ نەبووین کارەکە بەو شێوەیە بشکێتەوە. دوای قسەکانی زۆرێك لە پێشمەرگە و فەرماندەکان پرسیار و پێشنیاریان کرد. یەك لەوانە کاك محەمەدی حاجی مەحموود بوو، قۆڵی هەڵکرد و گوتی مام جەلال، ڕەسووڵ مامەند بە هەموو هێزەکەیەوە پەنجا کەسی لەگەڵدایە، من (١٥٠) پێشمەرگەم لەتەکدایەو ڕێگەم بدە بچم چەکیان بکەم. مام جەلال گوتی ناقیلەکەی شارەزوور لێیان گەڕێ با جیا ببنەوە، پاشە ڕۆژ پێویستمان پێیان دەبێت. منیش هەستام گوتم کاکە حەمە دەتەوێ شەڕی مەلایی و جەلالی نوێ بکەیتەوە! مام جەلال گۆچانەکەی بەرز کردەوە بیدا بەسەرمدا کاك نەوشیروان نەیهێشت. گوتی: مام جەلال ئێمە بە پشتیوانی ئەم جۆرە پیاوانەدا شۆڕشمان دروستکردووە. مام جەلالیش گوتی کەوایە قاوەیەکی بۆ بهێنن. کە قاوەکەیان هێنا لەبەر ئەوەی یەکەم جارم بوو قاوە بخۆمەوە زۆر تاڵ بوو بەلامەوە. دوای خواردنەوەی قاوەکە بە ناچاری، مام جەلال گوتی مادەم وایە کابرایەکی باڵی چەپی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست لێرەیە لەگەڵ خۆت و چەند پێشمەرگەیەك ببە بۆ سەردەشت، نامەیەکیشت بۆ دەنووسم ڕادەستی موحسین عەلی ئەکبەری بکە، بە مەفرەزەیەکەوە کە کاك زۆراب بەردەکەڕی و محەمەد کەریم سیارەیی ناسراو بە (حەمە فاتە)ی تێدابوو بەرەو سەردەشت بەڕێکەوتین. وەرزەکە ناوەڕاستی زستان بوو، ڕێگە زۆر سەخت و نارەحەتی بوو بەهۆی ئەوەی بەفرێکی زۆر باریبوو، پلەی گەرما بۆ ژێر سفر دابەزیبوو. هەرچۆنێك بوو گەشتینە ئەوێ و بەسەلامەتی کابرا و نامەکەم ڕادەستی کاك موحسین کرد.

## هاتنەدەرەوەی جەمالە سور و هاوڕێکانی

پایزی ساڵی (١٩٧٩) مەفرەزەکەمان لە نزیکی زەڕایەن لە گوندی (کانی توو) بوین. سەردار ناوتاقی فەرماندەی مەفرەزەکە بوو، منیش جێگری بووم. عوسمان سۆڵەیی و عومەری خەلیفە عەلی و حسەینی حامید و ڕەوفی یاسەمان لەگەڵدا بوو. شێخ جەعفەر فەرماندەی کەرت بوو، مامۆستا جەلالی شێخ تۆفیق ڕابەر سیاسی بوو. ماوەیەك بوو دوو كوڕ هاتبوون بۆ پێشمەرگایەتی بە ناوەکانی عەباس حەمە ئەمین و مەجید سۆفی ساڵح کە خەڵکی گوندی (چناره) بوون. حەیوانێکمان کڕیبوو بە (١٠) دینار، سەرم بڕی. پاشان بەشبەشم کرد بەسەر پێشمەرگەکاندا. بە داری تەڕی بەڕوو شیشمان دروست کردبوو. خەریکی گۆشت ببرژاندن بووین حەرەسەکە بانگی کرد چەند چەکدارێك بەرەو ڕوومان دێن. ئێمەش ئەوەندەی دەمانزانی هیچ پێشمەرگەیەك لەو نزیکانەدا نیە بۆیە گومانی ئەوەمان کرد مەفرەزەی جاش بن و ئیخباری کرابین. بەخێرایی بەو ناوەدا دابەش بووین. پاش کەمێك نزیك بوونەوە، دەنگمان دان. بینیمان یەکێکیان بەکری کوێخا قادری ئاوەکەڵەیە. کە هاتنە پێشەوە سەیرمان کرد (٣) کەسی لەتەکدایە پۆلیس بوون و هاتبوون ببنە پێشمەرگە بە ناوەکانی: جمال مەحمود معروف ناسراو بە (جەمالە سور)، عمر ناوێك خەڵکی (گەلاڵە) بوو، ئەحمەد باریکەیی. بڕیار وابووە والی باریکەییشیان لەگەڵدا بێت، بەڵام ئەو ڕۆژە بۆی ڕێنەکەوتبوو ڕۆژی دواتر هات.

جەمالە سور لە عەربەت دەوامی دەکرد. ساڵی (١٩٧٧) لە ڕێگەی شەهید ئەحمەد حارسەوە پەیوەندی بە شەهید سیروانەوە کردبوو. کاتێك سیروان تاڵەبانی شەهید دەبێت ئەوانیش جموجوڵیان زیاتر دەبێت و ئیش بۆ شۆڕش دەکەن و گومانیان دەکەوێتە سەر. لەبەر ئەوەی جەمالە سور کاری بەریدی

دەکرد، پەیوەندی لەگەڵ چەند پۆلیسێکی ناوچەکە هەبوو. کاتێك گەشتنە لای ئێمە (٣) کلاشینکۆف و بڕێکی زۆر مەخزەن و فیشەکیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، گوتیان ژمارەیەك تفەنگی تر و فیشەك و مەخزەنی دیکەیشمان هێناوە و لە گوندی خەرجانە لە شوێنێکی ئەمیندا شاردومانەتەوە. ئۆتۆمبێلەکەی بنکەی پۆلیسیشیان هێنابوو بۆ ئەوەی بە ئاسانی لە سەیتەرەی قەرەگۆڵەوە دەربچن ئۆتۆمبێلەکەیان لە خەرجانە جێهێڵابوو، دواتر حکومەت بردبوویەوە. ئەمانیش لە خەرجانەوە چووبوونە ئاوە کەڵە و لەوێوە بەکری کوێخا قادر هێنانی بۆلای ئێمە. لەو کاتەدا ئەو تفەنگانەی ئەوان هێنایان گەورەترین سەرمایە بوو بۆ شۆڕش. جەماڵە سور پێشمەرگەیەکی ئازا و قارەمان و زۆریش بە وەفایە.



جەمال مەحمود مەعروف (جەماڵە سوور) – مام دەروێش

٢٠١٨

## ڕاونانی دز و جەردە

لە کۆتایی ساڵی (١٩٧٩) ماوەیەکی زۆربوو سەردانی ماڵ و منداڵم نەکردبوو، مۆڵەتم وەرگرت و بە تەنها ڕۆشتمەوە بۆ سیارە. چەند کەسێکی کەم لە گوندەکەمان دەیانزانی هاتوومەتەوە. لەبەر ئەوەی دێکەمان زۆر نزیك بوو لە جادەی سەرەکی و مۆڵگە سەربازییەکانەوە، دەبوایە زۆر بە وریاییەوە سەردانەکەم بکردایە و ئاگام لەخۆم بێت. درەنگانێکی شەو کۆمەڵێك چەکدار هاتبوون بەناوی یارمەتی بۆ پێشمەرگە پارە لە خەڵك وەربگرن، چووبوونە ماڵێکەوە و داوای (١٠٠) دیناریان لێکردبوون. خاوەن ماڵ پارەی شك نەبردبوو ژنەکەی ناردبوو لە ماڵێکی دراوسێی سەد دینارەکەی بۆ بهێنێت، هەڕەشەیان کردبوو و میلی تفەنگیان لێ هێنابوویەوە و گوتبوویان ئەگەر پارەکە نەهێنێ دەتکوژین. کە ژنەکە ڕۆشتبوو پارەکەیان بۆ بهێنێ، لەو کاتەشدا خەلیل مەحمود پیرۆز کە تەنزیمی خۆمان بوو دەیزانی من هاتوومەتە ناو گوند، بەپەلە هات گوتی مام دەروێش کۆمەڵێك چەکدار هاتوون و بە ناوی پێشمەرگەوە داوای پارە دەکەن. بە پەلە خۆم بەست و چوومە بەرامبەریان و پێمگوتن، ئەگەر پێشمەرگەن وەرنە پێشەوە ئەگەر جاشیشن وا هاتم، سەلەیك فیشەکم تەقاند و گوتبوویان بەخوا ئەوە دەنگی دەروێشساڵحە ئێستا دەمانکوژێ. ئەو سەد دینارەی ژنەکە بۆی هێنابوون فریا نەکەوتبوون وەریگرن، ڕایان کردبوو. جار و بار لە دێهاتەکانی دیکە هەوڵی دزییکردنیان دابوو بەڵام نەیاندەوێرا بێنەوە سیارە.

## ڕۆژێکی تەم و مژ لە دارەڕەش

ساڵی (١٩٨٠) ڕۆژێکی زۆر سارد و دنیا تەم و مژاوی بوو، ئاستی بینین لە (٢٠)م زیاتر نەدەبوو. ئەم کەش و هەوایەمان بە هەل زانی و بڕیاماندا بۆسەیەك لە دارە ڕەشی قەرەداغ دابنێین. من فەرماندەی مەفرەزە بووم و عەبدوڵڵا دسکەرەیی جێگر بوو. ئەو کاتە هەر پیاوێکی حکومەت لە قەرەداغەوە بۆ سلێمانی وە یا بە پێچەوانەوە هاتووچۆی بکردایە دەبوو لەگەڵ کاروانی سەربازی هاتوچۆی بکردایە. ئێمەش هەواڵمان بۆ هات کە ڕۆژانە پیاوەکانی حکومەت هاتووچۆ دەکەن لەبەر ئەوەی هەموو بەرزایی و گردۆڵکەکان ڕەبایەی سەربازیان تێدابوو دەرفەت نەدەبوو دەستیان لێ بوەشێنین. بۆیە ئەو ڕۆژەمان بە هەل زانی و بۆسەیەکمان دانا. نزیکەی (٨) پێشمەرگە دەبووین، حەمە قاشتی و جەمالە سوریشمان لەگەڵدابوو. عەبدوڵڵا دسکەرەیی و پێشمەرگەیەکی ترمان لەسەر گردێك دانا کە ئاگای لە ئێمە بێت. پاش ماوەیەکی کەم جیب قیادەیەك و شۆفلێتێك و دوو ئیڤای سەربازی هاتن. لەبەر ئەوەی دنیا تەمومژ بوو بە تەواوی هاتنە بەردەممان. منیش پاڵتۆیەکی شۆڕم لەبەردابوو، مزەلیەکەم لە ژێریدا شاردبوویەوە و میلم هێنابووەوە. لە دوورەوە ئیڤاکە منی بینی وایزانی عەشایەرم. هۆڕینی بۆ لێدام کە نەیەمە سەرجادەکە و لێم بدا. دەستبەجێ لێی هاتینە دەست و ئەوەندە بە کتوپڕی و دەستوبرد لێمان دان سەیەرەکان دەیانکێشا بە یەکتریدا. لە ماوەی (٥) خولەکدا هەر چوار سەیارەکەمان تێك شکاند، ئەوان فریا نەکەوتن دەست بکەنەوە بۆیە کوژراو و برینداریان هەبوو، تا ڕەبایەکانی سەر شاخ هاتنە دەست بە سەلامەتی کشاینەوە، بەڵام ڕەبایەکان ئەوەندە نزیك بوون دەرفەت نەبوو دەسکەوتەکان کۆ بکەینەوە.



عەبدوڵڵا رەباتی - رەوفی یاسە - عەبدوڵڵا دسکەرەیی

## شەڕی عێراق - ئێران

لە (١٩٨٠/٩/٢٢) شەڕی عێراق — ئێران دەستی پێکرد. سوپای عێراق لەچەند قۆڵێکەوە پێشڕەویان کرد و چوونە نێوخاکی ئێرانەوە و چەندین شار و شارۆچکەیان داگیرکرد. ئەگەرچی ئەو شەڕە ماڵ ویرانیەکی گەورەی بۆ گەلانی عێراق هێنا، بەڵام لەو کاتەدا دەروویەکی خێر بوو لە جوڵانەوەی ڕزگاریی خوازی کورد کرایەوە لە باشور و ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا. لەبەر ئەوەی تا دەستپێکردنی شەڕ سوپای عێراق بە هەموو توانایەکیەوە ڕووبەڕوی پێشمەرگە دەبووەوە و چەندین مەفرەزەی جاشی دروست کردبوو ڕاوە پێشمەرگەی پێدەکردن، هەرچەندە جاشەکان لە سەرەتاکانی شەڕی عێراق — ئێرندا هەر ئیشیان ئەوەبوو ڕووبەڕووی پێشمەرگە ببنەوە و شەڕی ئێرانی پێ

نەدەکردن ، کە شەڕ دروست بوو ئازادیەکی فراوان بۆ گەڕانی پێشمەرگە هاتە ئاراوە و چالاکی پێشمەرگە بەرفراوانتر بوو، بەڵام بە داخەوە لە دوای ساڵی (١٩٨٦) بە دواوە کوردستانیش بووە مەیدانی شەڕی عێراق — ئێران و سوپای ئێران هاتە نێو خاکی کوردستان و بوویە هۆی وێرانکردنی پانتاییەکی زۆری ناوچە کوردییەکان و پەلکێشکردنی ئێمەش بۆ هاوکاریکردنیان، من بۆ خۆم زۆر دڵگران دەبووم کاتێک ئەمبینی بە هاوکاری سوپای ئێران شوێنێکمان داگیر دەکرد، ئەو مەرامەی ئێمە هەمانبوو لە کۆتایی شەڕدا دەبوو بە بڵقی سەرئاو، لەبەر ئەوەی ئێمە مەبەستێکمان هەبوو و سوپای ئێرانیش مەبەستێکی دیکەی هەبوو دواجار مەبەستەکەی ئەو هاتەدی. من بۆ خۆم لە شۆڕشی ئەیلولیشدا هاوکاری سوپای ئێران و دراوسێکانم پێ خۆش نەبوو.

## گوندی دسکەرە و لالە ئەنوەر

لەگەڵ مەفرەزەیەکدا بۆ نان خواردن و پشودان چووینە گوندی دسکەرە، لەو کاتانەدا تەنها بە شەو دەچووینە نێو دێهاتەکان. بۆ نان خواردنی ئێوارە چووینە ماڵی لالە سەرحەد، ئەو کاتە هێشتا لالە ئەنوەر نەهاتبووە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی. تاقم و شەیالەی پێشمەرگەکان زۆر کۆن و دڕاو بوون و تاقمی مەخزەن بە کەمی دەستدەکەوت چونکە لەنێو شارەکاندا دەستدەکەوت و هەموو کەس نەیدەوێرا بیکڕێت، چونکە هەرکەس بیکڕیایە و بە دەستیەوە بگیرایە توشی کێشەیەك دەبوو. لالە ئەنوەر کە زانی تاقمی مەخزەنی پێشمەرگەکان کۆن و دڕاو بوون خەڵکی ناردبوو بۆ سلێمانی، بە نهێنی (٦) تاقمیان کڕیبوو، بۆی ناردین بۆ قەرەداغ و لە ئاوە کەڵە بەدەستمان گەیشت. لەو کاتەدا بۆ ئێمەی پێشمەرگە دیاریکی بە نرخ بوو.

## کەمینێك لە میرەدێ

من و دکتۆر چیا و حەمە سعید حاجی غەریب، حەمە قاشتی، حەمە تیماری، نەجم محەمەد عەزیز ناسراو بە (کوێخا)، جەمالی خەلیفە ئەوڕەحمان زەڕایەنی، جەزا عەلی فەتاح کۆرەیی، عەبدوڵڵا بەکر مەسۆیی، جەماله سوور، عەبدوڵڵا دسکەرەیی، فەرهادە بچکۆل کۆشانی، قادر محەمەد ئەمین زێڕنجۆیی و چەند پێشمەرگەیەکی دیکە بڕیارماندا چالاکیەك بکەین.

حەمە قاشتی و حەمە تیماریمان ناردە سەر جادەکە تا حکومەت پێیان بزانێت و هێزشمان بۆ بهێنێت. ئێمەش خۆمانی بۆ ئامادە بکەین، کە زەبرێکی گەورەیان لێ بدەین. لەسەر جادەی سەرەکی دەربەندیخان سلەیمانی لە نزیك گوندی میرەدێ بۆسەیەکمان دانا. حەمە قاشتی و حەمە تیماریی چوونە سەر جادەی سەرەکی لەو کاتەدا پیکابێکی فەرمانگەی کشتوکاڵ بەشی بەیتەری (فێتەرنەری) کەوتە بۆسەکەوە کە شۆفێرێکی کورد و فەرمانبەرێکی تێدابوو بەناوی (وریا هاواری) بەرەو بەغدا دەچوون. سەیارەکە و هەردوو سەرنشینەکەیمان هێنا، لە ڕێگا حەمە قاشتی لێیدەخوڕی.

ئێمە (وریا هاواری)مان نەدەناسی لە پەناوە گوتی بمبەنە لای کاك موستەفا چاوڕەش، لەوێ بۆمان دەرکەوت کە کاك وریا هاواری ئەندامێکی چالاکی کۆمەڵەیە. لەبەر چاوی شۆفێرەکە قسەمان پێدەگوت بۆ ئەوەی درك نەکا کە وریا ئەندامی کۆمەڵەیە و نەبادا دواتر تووشی کێشەیەکی بکات، لەبەر خاتری وریا شۆفێرەکەشمان بەردا. ئەو چالاکیەمان بۆیە کرد لەبەر ئەوەی دوژمن بێت بە هانای ئۆتۆمبێلەکەوە و زەبری کوشندەی لێ بوەشێنین، بەڵام کارەکە بە خواستی ئێمە نەشکایەوە و حکومەت سەربازی نەنارد.

لە ئۆتۆمبێلەکەدا دوو فەردە گوێزی هاوڵاتییەکی دەربەندیخانی تێدابوو بە هاوڵاتییەکی ناوچەکەدا گوێزەکەمان ناردەوە بۆ خاوەنەکەی.

یەك لەو پێشمەرگانەی کە بەشداری ئەم چالاکییە بوو (حەمە تیماری) بوو، کە بە ڕاستی پێشمەرگەیەکی قارەمان بوو، بە داخەوە لە (١٩٨٦/١٢/٣) لە چیای برزود لە بالۆسە شەهید بوو. لە ئەسڵدا ناوی (محەمەد سەعید ئەحمد) بوو. ئێستا کاك تەهای برای پلەی عەمیدە لە پۆلیسی بەرگری و فریاکەوتن.



حەمەسەعید حاجی غەریب سێتەلانی　　　دکتۆر چیا　　　مام دەروێش



نەجیم محەمەد عەزیز (کوێخا)



محەمەد رەشید (حەمە قاشتی)

## شەڕێك بە یاوەری كاك ئازاد هەورامی و مامە ڕیشە

ڕۆژ بە ڕۆژ چالاكی پێشمەرگە لە هەڵكشاندا بوو بە تایبەتی لە هەرێمی پێنجی قەرەداخ. دەبوو چالاكییەكەنیشمان بە كەمترین كات و زۆرترین زیان لە دوژمن و كەمترین زیانیش بۆ خۆمان بوایە و دەبوو هەمیشە سەلامەتی گیانی پێشمەرگە بنەمای چالاكییەكانمان بوایە.

ڕۆژێك لەگەڵ حەمە قاشتی و حەمە تیماری و نەجم محەمەد و ڕەوفی یاسە چووین بۆ گوندی فەقێ جنەی نزیك دەربەندیخان. ئوتومبێلێكی لاندكرۆزەری حكومی ڕۆژانە دەهات بۆ كارگەی بەردهاڕین (كسارە)ەكە و ئێوارە دەگەڕایەوە بۆ دەربەندیخان. ئەو ڕۆژە لە گەڕانەوەیدا دەستمان بەسەریدا گرت و هێنامانەوە بۆ گوندی باوەخۆشێن. كە چووینە لای كاك مستەفا، مامە ریشە و هێزەكەی هاتبوون بۆ سەردانیكردنی كاك مستەفا. زانیشمان كە (ئازاد هەورامی) ئەندامی سەركردایەتیش هاتووەتە ناوچەكە. شایانی باسە پێشتر مامە ریشە ناوبانگی چالاكییەكانی ئێمەی بیستبوویەوە و وەك خۆی گوتی گەر ڕێك بكەوێ خۆشحاڵ دەبم چالاكییەكی هاوبەش ئەنجام بدەین. شۆفێری ئوتومبێلەكە عەرەبێكی میسری بوو، هەندێ قسەی بۆ كرا، پاشان ئازاد كرا.

بۆ شەوەكەی چووینە گوندی ئیمام قادر. بەیانیەكەی سەربازەكانی بەعس هێرشیان بۆ ناوچەكە كرد، بەڵام جگە لە هێزێكی زۆری خۆمان مامە ریشەو پێشمەرگەكانی ئەویش هەر لە ناوچەكەدا مابوونەوە، هەروەها مام ڕۆستەم و شێخ جەعفەریش لەوێ بوون. شەڕ دەستی پێكرد و هێزەكەی بەعس بە پشتیوانی كۆپتەر تا دنیا تاریكی كرد شەڕ بەردەوام بوو، سەرەنجام هێرشەكەیان شكستی هێناو كوژراو و برینداریكی زۆریان دا، بەڵام ئەوەی مایەی خۆشحاڵی بوو هێزی پێشمەرگە بێ زیان بوو.

ئەوەی جێی باسە بە هەمان شێوە کاک ئازاد هەورامی لە شەڕەکەدا شانبەشانی ئێمە بەشداری شەڕەکەی کرد. کاک ئازاد جگە لەوەی پێشمەرگە بوو هونەرمەندیش بوو. کەسایەتییەکی زۆر رۆشنبیر و هێمن و هەست ناسك بیرتیژ بوو. نێوانی من و کاك ئازاد زۆر خۆش بوو زۆری رێزی دەگرتم و هەرکات یەکترمان ببینیایە ماوەیەکی زۆر پێکەوە دەبووین. بەداخەوە لە (١٩٨٨/٨/٣١) لە دوا قۆناغی ئەنفالی بەدناودا لە قەندیل شەهید کرا.

## سیاسەتی لەداوخستن

ماوەیەك بوو بەعس لە رێگەی پیاوەکانییەوە سیاسەتێکی پەیڕەو دەکرد و سیخووڕەکانی ڕادەسپارد، کە پەیوەندی بە فەرماندە و کادیرە سیاسییەکانەوە بکەن بە بیانووی ئەوەی دەیانەوێ هاوکاری شۆڕش و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بکەن، دەزگا هەواڵگرییەکانی بەعسیش کار ئاسانییەکی باشیان بۆ دەکردن چەندین جار چاوپێکەوتنیان دەکرد و پەیمانی گەورەیان دەدا وەك تەسلیم کردنی بارەگا و سەربازگە و کەسانی ناسراوی بەعس تا هەلێکیان بۆ دەڕەخساو زەبرێکی کوشەندەیان لە پێشمەرگە دەدا، بێ ئەوەی زیان بەر خۆیان بکەوێت، نموونەی دکتۆر چیا کە کادیرێکی سیاسیی و کورێکی کارامە و ڕۆشنبیر و دکتۆر، بە پلانێکی لەم شێوەیە لە زەڕایەن شەهیدکرا.

## پووچەڵکردنەوەی پلانێك

لە قەرەداخ بووم نامەیەکم لە ئامر مەفرەزەیەکی جاشەکانەوە بۆ هات داوای کردبوو لە نزیکەوە بمبینێت، بە مەبەستی ئەوەی دەیەوێت هاوکاریمان بکات و ئەگەر پێویستی کرد چالاکییەکی گەورەش بکات و بێتە دەرەوە.

منیش لەگەڵ کاك مستەفا و کادیرە سیاسییەکان ڕاوێژم کرد و وامان بە باش زانی بیبینم، نامەیەکم بۆ نارد و ڕەزامەندیم دەربڕی کە بەم نزیکانە شوێنێك دیاری دەکەم و یەکتری دەبینین. لە کاتی دیاریکراودا کات و شوێنەکەیت بۆ دەستنیشان دەکەم و ئاگادارت دەکەمەوە. پاش ماوەیەك خۆم و مەفرەزەیەك خۆمان ئامادەکرد و بەڕێ کەوتین. کاك مستەفا ڕێنمایی کردم کە زۆر بە وریاییەوە بەرخوورد بکەم. شەوێك چووینە گوندی سیارە و ماینەوە، بەیانیەکەی بە برادەرێکدا هەواڵم بۆ نارد بۆ دەربەندیخان، کە بۆ یەکتر بینینن بێت بۆ سیارە.

پێشمەرگەکانم لە خوار ئاواییەوە دابەش کرد، کە ئامادەبن بۆ هەر شتێکی نەخوازراو. خۆیشم لە بەرزاییەکی دووری دێکەوە لەناو بەرد و داردا بە دووربین سەیری ڕەبایە و سەر جادەکەم دەکرد. لە ناکاو قەمەرەیەکی سپی لە دەربەندیخانەوە هات و بەرەو سیارە لایدا. "لە دوایدا بۆیان گێڕامەوە کە قەمەرەکە لای ڕەبایەکە لایداوە و لەگەڵ سەربازەکاندا هەندێ وتوێـژیان کردووە". قەمەرەکە لە گوندەکە لەلای یەکەم ماڵدا وەستا، دوو نەفەری چەکدار و سایەقێکی تێدابوو. دوو چەکدارەکە لای قەمەرەکەدا مانەوە و سایەقەکە بە تەنها بەناو دێدا هات بۆ خوار ئاوایی. بەهێی خێزانم چوو بە دەمیەوە و هێنای بۆلای من. بەهیە کە زانی دەمانچەی پێیە پێی گوتبوو ئەبێ دەمانچەکەت لای من دابنێیت، ئەویش بەلایەوە ئاسایی بوو و دەمانچەکەی

لای بەهیە دانابوو. کە نزیك بوویەوە ئەو کەسەبوو کە بەڵێن بوو ببینم. چووم بە دەمییەوە و بەخێرهاتنم کرد، دیاربوو درکی کردبوو کە ئامەدەکاریم کردووە بۆ هەر کارێکی نەخوازراو. گوتی مام دەروێش دەڵێی متمانەت پێم نیە؟ دەمانچەکەشم لای دادە بەهیەی خێزانت داناوە. زۆر قسەمان کرد و نەگەشتینە هیچ دەرەنجامێك، دیاربوو بەعس بەزۆر ناردبووی. داواکاری ئەوەبوو لە ڕێگەی منەوە کادیر و فەرماندەی باڵاتر ببینێت و هەماهەنگی بکەن بۆ کاری پێویست.

بۆ ئەوەی لە چاوەڕوانیدا بیهێڵمەوە ئەوەکا بگەڕێتەوە و خەبەرمان لێبدات و جەیش و جاش بێتە سەرمان گوتم پێشنیارەکەت تاوتوێ دەکەین و تۆش کاری خراپ نەکەیت و لەچەك و تەقەمەنیشدا هاوکاریمان بکە. دەمانچەکەم دایەوە و خودا حافیزمان لەیەکتری کرد. ئامادەکاری ئەوەم کرد نەوەك هێزی سەربازیمان بهێنێتە سەر. یەکسەر پێشنیارم بۆ پێشمەرگەکانم کرد کە گوندەکە جێبهێڵین و لەو چەم و دۆڵانەدا خۆمان حەشار بدەین.

چەند کاژێرێکی کەم چاوەڕێی بووین و هیچ جموجوڵێکی گومان لێکراومان بەدی نەکرد ئیتر لەو چەمانەدا نانێکی سەرپێییمان خوارد کە لە سیارەوە لەگەڵ خۆماندا هێنابوومان. لە ڕاستیدا ئەم کەسە پیاوێکی خراپ نەبوو، جارێکیش هەندێ تەقەمەنی بۆ ناردین.

لەگەڵ حەمە قاشتی و حەمە تیماریی و عوسمان سۆڵەیی و مەفرەزەکەدا بڕیارماندا کاژێر دووی پاش نیوەڕۆ لە نێوان گوندی سیارە و بیرکێدا بۆسەیەك لەسەر جادەی سەرەکی دەربەندیخان — زەڕایەن دابنێین. لە کاتی دیاریکراودا بۆسەیەکی مەحکەممان دانا. ئۆتۆمبێل دەهات و ڕامان دەگرت، کادیرێکمان لەگەڵ بوو ناوی جوتیار بوو، قسەی بۆ سەرنشینەکان دەکرد و باسی شۆڕشی نوێی بۆ دەکردن. لە ناکاو قەمەرەیەك هات و ئێمەی بینی هەولی دا بگەڕێتەوە. تەقەمان لێکرد و تایەکانی تەقی و نەیتوانی

بڕوات. کە چووینە پێشەوە پیاوێکی عەرەبی چوار شانەی تێدابوو هەرخۆی بوو. قاتێکی زەیتوونی مرەقەتی لەبەردابوو، کە هێمای بەعسیەکی گەورەی پێوە دیاربوو. یەکسەر بە دوو پێشمەرگەم گوت لە کەمینەکە دووری بخەنەوە. خوارەوەمان چەم و بێشەیەك بوو، نزیکەی پەنجا مەترێك لە ئێمە دوورکەوتنەوە و ئیڤایەك زۆر بەخێرای هات و بەهەمووومان تەقەمان لێکرد، بەڵام هەر نەوەستا و خۆی دەرباز کرد. لەدوایدا هەواڵمان پێگەیشت کە کوژرا و برینداریان هەبووە و یەکێکیان ئەفسەر بووە. بەپەلە لە شوێنی کەمینەکە دوورکەوتینەوە، بۆمان دەرکەوت ئەوەی گرتوومانە بەعسییەکی زۆر گەورەیە و دەمانچەیەکی چواردە خۆری پێیە و لە زەڕایەن و دەربەندیخان پلەی لێپرسراوێتی بەرزی هەیە. بە برادەرانم گوت ئێستا حکومەت ئارامی لێ هەڵدەگیرێ و بە هەموو هێزێکییەوە کێومالی ناوچەکە دەکات، چونکە لە ڕابردوودا لە وەها کارێك ئەزموونمان وەرگرتبوو.

لەنزیك ڕەبایەکەی لای سیارە ئەشکەوتێکی بچوکی تێدابوو دەمەکەی تاڕادەیەك داخراو بوو. ناوچەکە داریەڕووی زۆر چڕ و بەردی گەورە گەورەی تێدابوو کە زۆر نزیك بوو لە ڕەبایەکەوە. لە نێو ئەشکەوتەکەدا خۆمان حەشاردا، حکومەت هەر زوو خۆی کۆکردەوە و کەمینی لەسەر جادەی سەرەکی دەربەندیخان – زەڕایەن دانا و بە هەموو هێزێکییەوە هەموو ناوچەکەی پشکنی و عەقڵیان نەیبڕیبوو ئێمە لەو نزیکانەدا مابینەوە. دوای گەڕانەوەی هێزەکانی حکومەت و بێئومێد بوونیان، ئێمەش بەسەلامەتی و بێ ترس ناوچەکەمان جێهێشت. عوسمان سۆڵەیم نارد لە سیارە خواردنی بۆ هێناین و بەرەو قەرەداخ ڕۆشتین.

لە گوندی سێوسێنان لەگەڵ حەمە قاشتی و مەفرەزەکەدا مامۆستا بەعسییەکە کە لێپرسراوی منەزەمە بوو، ڕادەستی کاك مستەفامان کرد و پێشنیارم کرد هەوڵ بدەن لەگەڵ ئەو گیراوانەی سەر بە ڕێکخستنەکانن و لە

زیندانەکانی بەعسدان ئاڵوگۆڕیان پێ بکەن، دیاربوو بەعس بە کارێکی وەها ڕەزامەند نەدەبوو.

چالاکیەکە دەنگدانەوەیـەکی گـەورەی لـە ناوچـەکەدا بەدەسـت هێنـا، چونکە. هێشتا برینی دکتۆر چیا خوێنی لێدەتکا و زامەکەی ساڕێژ نەبووبوو، بۆیە بەو چالاکیە دڵی خەڵکمان تا ڕادەیەك خۆشکرد و ئارامی گەڕایەوە بۆ خاوانـەدە و هاوسـەنگەرانی دکتـۆر چیا. کـاك مسـتەفاش لـە بیرەوەرییەکانیدا باسی ئەم چالاکییەکەی کردووە.

بـەعس وەك پیشـەی هەمیشـەیی هـەر چالاکییەکی پێشمەرگە هەبوایـە و زەبری بەر بکەوتایە دەکەوتە وێزەی خەڵکی بێتاوان و ئەشکەنجەدانی خێزان و کـەس و کـاری پێشـمەرگە و ڕاپێچـی زینـدانی دەکـردن. مـاڵ و منـداڵی مـن یـەکێك بـوون لـەو خێزانانـەی بـەر ئـەو جـۆرە شاڵاوانە کـەوتن و لـە زینـدان بێبـەش نـەبوو لـەوەها مەکرەمەیـەکی بـەعس. بـە هـەمان شـێوە براکانیشـم بێبـەش نـەبوون لـە گـرتن و عەزیەتدان. مـاڵی دوو بـرام لـە دەربەنـدیخان بـوو مـاڵی حـاجی حەسـەن و محەمـەدی بـرام، هەرچـالاکییەك بکرایـە و مـن و حەمەقاشـتی تێدابوایـە، یەکسـەر خێزانـەکانمان دەگـیران. هـەر شـەڕێك لـە ناوچـەکەدا بووایـە حـاجی حەسـەنی بـرام خـۆی دەگەیانـدە ئێمـە، بـۆ ئـەوەی بزانێ سەلامەتین یا نا. هەندێ جاریش هەواڵی زیانی شەڕەکانی بەعسی بۆ دەهێناین.

جگە لە ماڵ و خێزانەکەم برا و برازاکانیشم زۆر عەزێتیان دەبینی و لە ئیش و کـار و خوێنـدن بێبـەش دەکـران، حسـەینی بـرام ماڵیـان لـە وڵوبـە بـوو، شەو خەوی بە منەوە بینیبوو کە هەموو گیانم هەر خوێن بـووە. لە وڵوبەوە بـە پـێ هـات بـۆ قـەرەداغ بـۆ ئـەوەی هـەواڵم بزانـێ، عێزەتـی بـرام و فـاتمی خوشکیشـم عـەزێت و مەینـەتی و دەردیسـەری زۆریـان بەسـەردا هـات، بـە

تایبەتی کاتێک منداڵەکانم لە سلێمانی گیرابوون، هەتا بەربوون فاتمی خوشکم بە دەمیانەوە بوو سەردانی دەکردن و پێداویستیەکانی بۆ دابین دەکردن.

یەك ڕۆژ دوای ڕووداوەکە سووپا چوونە سیارە بۆ گرتنی خێزانەکەم. پێم باشە گیران و تەواوی بەسەرهاتەکە لە زمانی عەلی کوڕمەوە ببیستن و دایکیشی یارمەتی بدات، هەرچەندە تەمەنی منداڵیش بووە، بەڵام لە زەینیدا وا تۆمار بووە هەرگیز لە بیری ناچێتەوە.



مام دەروێش – عوسمان سۆڵەیی

## گیران و کونجی زیندان

عەلی مام دەروێش

بەپێی زانستی سایکۆلۆجی بیرو یادەوەرییەکانی منداڵی زۆر تیژە بەتایبەت بۆ ڕووداوە ناخۆشەکان. بەهۆی ئەوەی باوکم پێشمەرگە بووە دوو جار سزای زیندانیکردنمان بەسەردا جێبەجێ کراوە و لە زیندانە ترسناکەکانی ڕژێمی بەعسدا ژیانمان بەڕێ کردووە.

### جاری یەکەم:

ماڵمان لە سیارە بوو، مامە ئەسعەدم ماڵی لە دەربەندیخان بوو، نەشتەرگەرییەکی قوورسی بۆ کرابوو. هەواڵی بۆ ناردین کە زەحمەت نەکێشین ئێمە بچین بۆلای، گوتبووی کە تۆزێك باش بووم خۆم سەردانیان دەکەم. پاش نیوەڕۆیەك مامم پەیدابوو هێشتا ئازاری نەشتەرگەرییەکەی بە تەواوی سارێژ نەبووبوو، ئاگری سۆز پاڵی پێوەنابوو هاتبوو بۆ لامان و ئەو شەوە لامان مایەوە. لەگەڵ مەلابانگاندا بە سەرباز دەوری ماڵمان گیرا. کە هاتنە ژوورەوە بە مامەمیان گوت تۆ چی ئەم ماڵەی؟ ئەویش لە ترسدا نەیوێرا بڵێ مامەیانم، گوتی هیچیان نیم. ئیستیخباراتێك داوای ناسنامەکەی لێ کرد، کە زانی برای باوکمە بە شەلاق کەوتە لێدانی و مامەم کەوتە چاڵێکەوە و تەقەڵی نەشتەرگەرییەکەی پچڕا و ئیتر هەڵنەسایەوە و دوای ماوەیەکی کەم کۆچی دوای کرد.

لەو کاتەدا محەمەد کەریم پیرەویس پێشمەرگەبوو، میمکە فاتەی

دایکیان هێنا و من و دایکم و گوڵاڵە و هەردی و ئەڵوەنیان سواری ئیڤایەك کرد و بردینیان بۆ دەربەندیخان و لەسەربازگەیەك زیندانیان کردین. تازە شەڕی عێراق - ئێران دەستی پێکردبوو، کاتی هاتنی فڕۆکەی ئێران زەنگی ئاگادارکردنەوە (انزار) لێدەدرا و سەربازەکان لە سەنگەرە تایبەتەکاندا خۆیان حەشار ئەدا.

کاتێ ئێمە گیراین میمکە مینا ئەحمەد، خێزانی مامە نادر بەبێ ئەوەی ناوی لە لیستەکەدا هەبووبێت لەگەڵ ئێمەدا هات، هێندە پێی ناخۆشبوو ئێمە گیران گوتی منیش لەگەڵ ئێوەدا دێم، بەڵام ئەو دوای چەند ڕۆژێك بەربوو.

لەوێ وەزعمان زۆر خراپ بوو. مەحمود ئەحمەد سیارەیی ناسراو بە مەحمودی سەویل ڕەش هات بۆ لامان و بینینی بار و دۆخمان باش نیە و برسی و چڵکنین، مۆڵەتی لە ئەفسەرەکە خواست و بردینی بۆ ماڵی خۆیان و لەوێ خۆمان شۆرد و جل و بەرگمان گۆڕی و خزمەتێکی چاکیان کردین. بۆ بەیانییەکەی بردیینیەوە بۆ زیندانەکە. تا دوو مانگ لە زیندانی دەربەندیخانماینەوە دوایی ئازادیان کردین. مجید حەمەخان میرەدێیی لە کاتی زیندانیکردنەکەماندا زۆر یارمەتی دەداین و خواردن و خواردنەوە و پێداویستی دیکەی بۆ دەناردین بۆ زیندان.

خێزان و منداڵەکانی مام دەروێش، کە زیندانی کراون



عەلی مام دەروێش　　بەهیە کاکەبرا　　گوڵاڵە مام دەروێش



هەردی مام دەروێش



ئەڵوەن مام دەروێش

وێنەی ئەو کەسانەی لەگەڵ خانەوادەی مام دەروێش لە زیندان بوون



حەسەن عەلی فارس



محەمەد عەلی فارس



رەشید عەزیز (باوکی حەمە قاشتی)



محەمەد حەمەساڵح ئەوڵا گوڵانی



بەهادین حاجی غەریب
برای شەهید سەعید



ئەکرەم ساڵح کوێخا عەزیز

**جاری دووەم:**

لە شەوێکی ئەنگووستە چاودا باوکم و چەند پێشمەرگە خۆیان کرد بە ماڵدا و لەنێو دێدا مانەوە. دیاربوو بۆ کارێك هاتبوون، چونکە بەیانییەکەی بە خێرایی هەندێك خواردن و پێداویستییان برد و دیارنەمان، دەمەو عەسر گوێمان لە تەقەی ڕەبایەکانی سەر جادەکە بوو، نەماندەزانی چیە و چی ڕوو دەدات، بەڵام دایکم ڕەنگی تێکچووبوو و زۆر خەمی بوو، هەر دەستی بەرز دەکردەوە و بەکوڵ نزای دەکرد و دەپاڕایەوە و هیچ قسەیەکی بۆ ئێمە نەدەکرد، دیاربوو خەمی ئەوەی هەبوو ئەو تەقانە پەیوەندی بە باوکم و هەڤاڵەکانیەوە هەبێت.

کە شەو داهات ئێمەی منداڵ نووستین و دایکم هەتا بەیانی خەو نەچووە چاوی، بەیانی زووبوو هێشتا تەواو دونیا ڕووناك نەبووبووەوە دایکم چا و خواردنی خستبووە سەر ئاگر، لە ناکاو بەپەلە هات و گوتی هەستن دەوری دێ بە جەیش و جاش گیراوە. خۆمان کۆکردەوە و دایکم دەستی گرتین و چووین بۆ ماڵی مەلا عەبدولقادر. لەوێ لە گەورەکانیاندا خۆمان حەشاردا. سەرباز ڕژانە ناو دێ، دیاربوو چاوساغیان لەگەڵدا بوو، چونکە یەکسەر چوونە ماڵ ئێمە و پرسیاریان کردبوو دراوسێکانمان گوتبوویان لەماڵ نین و نازانین لە کوێن. ئەفسەرەکە چووبووە ژوورەوە و دەستی دابوو لە قۆری و کترییەکە گەرم بووبوو گوتبووی لەناو دێدان. پاش پشکنین هاتن لە ماڵی عەبدولقادر ئێمەیان دۆزییەوە. گوڵاڵەی خوشکم لە ئێمە گەورەتربوو بە قژ ڕایاندەکێشا و دەیانگوت باوکت لە کوێیە پیشانمان بدە بەرت دەدەین. بە بڵندگۆی بچووك بانگەوازیان کرد هەرچی خەڵکەکەیە لە ماڵەکانیان بێتەدەرەوە و لای قوتابخانەکە کۆببنەوە، چونکە پشکنینی نێو ماڵەکان دەکەین ئەگەر هەر کەسێ بمێنێتەوە و بیگرین گوللە بارانی دەکەین.

خەڵکی سیارە مارانگەستەی ساڵی (١٩٦٣)ی زەعیم سدیق بووبوون بۆیە هەموویان ماڵەکانیان چۆڵکرد و لای قوتابخانەکە کۆبوونەوە. سەربازەکان ماڵەکان گەڕان و لە ماڵی حاجی مەحموود ڕەحمان، کە مامەی باوکمە وێنەیەکی مەلا مستەفای بارزانییان دۆزییەوە و هێنایان بۆ ئەفسەرەکە. ئەفسەرەکە بە خەڵکەکەی گوت تفی لێبکەن. پیاوێك محەمەد ئەحمەدی ناوبوو، کە خەڵکی قەرەچەم بوو خێزانەکەی خەڵکی سیارە بوو، بە ماڵەوە هاتبووە سیارە عەرەبییەکی چاکی دەزانی و پیاوێکی وریا و قسەزان بوو. وێنەکەیان بردە بەردەمی کاك محەمەد قەرەچەمی، کە تفی لێ بکات گوتی تفی لێ ناکەم. ئەفسەرەکە تووڕە بوو، فەرمانی دا گوللەبارانی بکەن. ئەفسەرێکی گەورەتر هات گوتی بۆ تفی لێ ناکەیت؟ لە وەڵامدا گوتی ئەو پیاوە ماوەیەك سەرۆکی کورد بووە و ئێستا مردووە، ئەگەر من تف لە سەرۆکی کورد بکەم دڵنیابە سبەینێش تف لە سەرۆکی تۆش دەکەم. ئەفسەرەکە فەرمانی کرد، هەردوو دەستی کاکە حەمەیان بەست و چەند هەنگاوێك لە خەڵکەکەیان دوور خستەوە. خەڵکەکە خەمیان بوو گوللەبارانی بکەن، بەڵام لەبەر ئەوەی عەرەبییەکی چاکی دەزانی و پیاوێکی بە سەلیقە و عاقڵ بوو بەریاندا و وازیان لێهێنا. پاشان هەموو خەڵکی ئاواییان بەردا تەنها من و دایکم و گوڵاڵە و هەردی و ئەڵوەنیان سواری زیلە سەربازییەکە کرد و بەرەو دەربەندیخانیان بردین.

لە قاشتی وەستان و مامە ڕەشید و میمکە خاڵێ کە باوك و دایکی حەمە قاشتی بوون و پێش ئێمە گرتبوونیان لەگەڵ ئێمەدا سواریان کردن و بەرەو سەربازگەی دەربەندیخانیان بردین. لەوێ بینیمان خانەوادە و کەسوکاری پێشمەرگە زۆر گیرابوون، لەوانەی دەمانناسین حاجی شێخ تۆفیق و دادە حەپسەی خێزانی و ساڵحی کوڕی، خێزانی ئازادی عەلە ڕەش، بەهادینی برای حەمە سەعی حاجی غەریب، بەهیە محەمەد خێزانی ساڵحی کوێخا عەزیز و دوو کوڕی بە ناوەکانی ئەکرەم و نەریمان، تەلیعە حسەین دایکی محەمەد

ئەحمەد ناسراو بە (شاهۆ) و خوشکێکی نازەنین ئەحمەد مەحمود ناسراو بە نازەنین (بی، کەی، سی) و رەحیل حەسەن حەمەئەمین خێزانی جوامێر لەگەڵ خێزانی پێشمەرگە شیوعیەکان محەمەد حەمەساڵح ئەولا گولانی و دایکی سەلمە مەحمود ئەلاوەیس و زۆری دیکەش کە ئێستا ناوەکانیانم بیر نەماوە یا نەمدەناسین.

پاش دوو سێ رۆژ مامە رەشیدی باوکی کاك حەمە قاشتییان جیاکردەوە و گوتیان برۆ بۆ لای کورەکەت، پێیان بڵێ ئەو مامۆستایەی لای بیرکێ گیراوە بەری بدەن، ئێمەش ئێوە بەر دەدەین. پاش دوو رۆژ مامە رەشید هاتەوە و خۆی نەخۆش خستبوو، لای ئەمنەکان گوتبووی پێشمەرگە عەزێتیان داوم. کاتێك مامە رەشید گەشتبووە قەرەداخ کار لە کار ترازابوو، بۆیە وای کردبوو لەبەر ئەوەی زیاتر ئازاری نەدەن. لای ئەوان نەیوێرابوو بڵێ مامۆستاکە نەماوە و کوشتوویانە.

مانگێك لە دەربەندیخان ماینەوە و بردینیان بۆ سلەیمانی بۆ زیندانێکی زۆر گەورە، کە بە لێشاو خێزانی پێشمەرگە گیرابوون و خرابوونە ئەو زیندانە. لەوێ بینیمان مامە محەمەدم و مامە حەسەنیشم گیرابوون و لەوێ زیندانی بوون. دادە گەردەی هاوژینی کاك محەمەدی حاجی مەحموود لەگەڵ منداڵەکانی لەوێ بوون لە زیندان منداڵێکی بوو. خێزانی بەکری حاجی سەفەریش لەوێ بوو. ئەلوەنی خوشکم نەخۆش کەوت، باری تەندروستی زۆر خراپ بوو، دایکم کردی بە هاوار و گریان نەیدەزانی چی بکات وەك شێت بە دەوری ئەلوەنی خوشکمدا دەسوڕایەوە و سەرو پرچی خۆی دەرنی. هەرچۆنێك بوو هەوڵماندا و دکتۆریان هێنایە سەری. دکتۆر پێشنیاری کرد، تەندروستی زۆر خراپە و پێویستە لە نەخۆشخانە بخەوێنرێت و لەژێر چاودێریدا بێت. بە دەستبەسەری بردیان بۆ نەخۆشخانە و هەفتەیەك مایەوە. لەو ماوەیەدا چواردە بوتڵ ئاویان تێکردبوو. پاش ئەوەی باری تەندروستی سەقامگیر بووبوو گەڕاندییانەوە بۆ زیندان.

ڕۆژ و مانگمان تێپەڕاند. لەو ماوەیدا میمکە فاتم کە خوشکی باوکم بوو، سەردانی دەکردین و هەر جلێکمان چڵکن بوایە دەیبرد لە ماڵی خۆیان بۆی دەشۆردین و بە پاکی بۆی دەهێنایەنەوە. بە هەمان شێوە خوشکەکانی دایکیشم سەردانیان دەکردین و هەر پێویستییەکمان هەبوایە بۆی دەهێنایین. کاك فایەق لەگەڵ پورە مەلیعەی هاوژینی کە خوشکی دایکم بوو، هەروەها خاڵۆ عەبدوڵڵام و خێزانەکەیشی سەردانیان دەکردین. ئەحمەد مجید شاسوار، کە باوکی دلاوەری ئەحمەد مەجید بوو هاوکاری دەکردین و بەتانی و پێداویستی دیکەی بۆ دەهێنایین، ڕێکخستنەکانی نێو شاریش بە نهێنی و لەڕێی چەند کەسێکەوە هاوکارییان بۆ دەناردین. لە ماوەی زیندانیکردنماندا خەڵکیان ناردبوویە لای باوکم و پێیان گوتبوو ئەگەر چەك دابنێیت منداڵەکانی بەردەدەین. باوکیشم لە وەڵامدا گوتبووی هەر هەموویان لەژێر زنجیری دەبابە بپلیشێننەوە چەك دانانێم، منداڵی من لە منداڵی ئەو هەموو پێشمەرگەیە زیاتر نییە. بەمجۆرە (١٨) مانگ لە زیندان ماینەوە، کە بەربووین جەمالی کاك شێخ محەمەدی زەلە ڕەش بە سەیارەیەك هات بەشوێنماندا و بردینی بۆ ماڵی خۆیان. لە زەلەڕەش باوکم چاوەڕێی دەکردین، لەوێوە بەرەو گوندی کانی هەنجیر ڕۆیشتین و چووینە ماڵی محەمەد حارس مارف، برای شەهید ئەحمەد حارس، کە خێزانەکەی ناوی حەبێ فەتاح بوو. بەڕاستی خزمەتێکی زۆر باشیان کردین، لەبەر ئەوەی بارانێکی زۆر دەباری بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لە ماڵیان ماینەوە. ئەو کاتە باوکم لەگەڵ کاك حەمە قاشتی لە گوندی کانی هەنجیر بارەگایان دانابوو. لەوێ کاك ستار ساڵح کونەقەلی پێشمەرگە بوو، (١٠٠) فلسی ئەو کاتەی دامێ کە بۆ من دیارییەکی زۆر بەنرخ بوو. پێویستە ئەوە بڵێم ماڵی کاك محەمەد حارس تەنها بۆ ئێمە باش نەبوون بەڵکو خزمەتی زۆری پێشمەرگەیان دەکرد. بەداخەوە ئەو پیاوە جوامێرە بەر شاڵاوی ڕەشی ئەنفال کەوت. لەوێوە تەدارەکی ماڵیان بۆ ئامادە

کردین، کە هەمووماڵەکە بە پشتی گوێدرێژێك گوازرایەوە بۆ سۆڵە. لە سۆڵە حاجی حسەین خانویەکی داینێ و ئەو شتومەکەی پێمان بوو خستمانە ناو ماڵی ڕووت و ڕەجاڵ، هەموومان نەخۆش و سەرگەردان، بەڵام کاتێك باوکم دەبینی ئەوەندە ورەی بەرز و ئەوەندە باوەڕی بە قەزییەکەی هەبوو وەك ئەوەی هەموو جیهان ئەو خاوەنی بێت، منیش ئارامیم بۆ دەهات و هەموو دەردیسەرییەکانی زیندانی لەبیر ئەبردمەوە.

بۆ جاری چوارەم لە سۆڵە ئاراممان گرت و ماڵە شێخەکان زۆر هاوکارییان کردین. لەوانە کاك شێخ محەمەدی شێخ ئەحمەدی شێخ ڕەزا و براکانی و ماڵی کاك شێخ باهیر و مامۆستا عومەری کوڕی، پاشتریش هەمیشە باوکم باسی چاکە و پیاوەتی ئەمانەی دەکرد بە هەمان شێوە لەوانەی زۆر هاوکاریان کردین شێخ سەفائەدین بوو، کە باخ و باخچەیەکی داینێ کە باخی هەنار و هەنجیری بوو، ئێمەش زەوییە بێ درەختەکانمان دەکرد بە تەماتە و بامێ و سەوزە بەو شتانە بەشێکی بژێوییەکانمان پێ ڕاییی دەکرد و لەبەر ئەوەی زۆر لە زیندان مابووینەوە کە بەربووبووین خزمان و دۆستانێکی زۆریش سەردانیان دەکردین و لەگەڵ خۆیاندا هاوکارییان بۆ دەهێنایین.



محەمەد حارس کانی هەنجیری | شێخ محەمەد شێخ ئەحمەد سۆڵەیی | محەمەد ئەحمەد قەرەچەمی

## خێزان و ماڵی پێشمەرگە

یەکێك لەو کێشانەی ڕووبەڕووی پێشمەرگە دەبوویەوە خێزانەکانیان بوو، دەبوایە هەم خەمی بژێوییان بخۆن و هەم جێگە و ڕێگەیان بۆ تەرخان بکەن، چونکە ئەگەر حکومەت دەستی بە خێزان و کەس و کاری پێشمەرگە بگەشتایە وەك ماڵ و منداڵەکەی من دەیگرتن و تووشی ناڕەحەتی دەکردن، ناچار دەبوایە بهاتنایەتە ناوچە ڕزگارکراوەکان، ئەمەش بۆخۆی بارگرانییەك بوو بۆ پێشمەرگە. لەو کاتەدا چوار منداڵم هەبوو گوزەرانی خێزانێکی شەش کەسی هەروا ئاسان نەبوو کە منداڵە گەورەکەم تەمەنی (١٠) ساڵ بوو.

لە سۆڵە، تازە منداڵەکانم لە زیندان بەربووبوون، هەرچۆنێك بوو ماڵێکمان پێکەوەنا. دەبوایە سەرەڕای ئەرکی پێشمەرگایەتی خەمی بژێوی ماڵ و منداڵم بخواردایە، خەمی قووڕەبان و زیندە و مەردەی خانوو و بانگێڕان و گوێسەوانە و پاسار و کلاوڕۆژنە چاککردن و گۆڕینی دەسەك و گورییەی شکاو و دروستکردنی جێگە بۆ ڕەشە وڵاخەکان و دابینکردنی ئالیك بۆیان و کێڵانی باخچە و هەڵدێرانی دێراو و ناشتنی بامێ و تەماتە، کە دەبوایە هەموویانم جێبەجێ بکردایە. هەرچەند خێزانەکەم زۆر ئازابوو بەشێکی ئیشەکانی ڕادەپەڕاند، بەڵام دەبوایە هاوکار و ڕێنوێنی بوومایە و زۆرێك لە ئیشەکان بە ئەو نەدەکرا و دەبوو خۆم بیکەم، بەڵام ئەوەی زۆر بۆ من کێشەبوو داری سووتاندن بوو، چونکە پێداویستییەکی ڕۆژانەبوو هەم بۆ نانکردن و چێشتلێنان هەم لە زستاندا بۆ خۆ گەرمکردنەوە، سۆبای داریش دارێکی زۆری دەویست، ناچار ئەو کاتانەی دەرفەتم هەبووایە دەهاتمەوە و منداڵەکانم دەبرد بۆ شاخی سۆڵە دارم دەکرد و بە کۆڵ و شان دەمانهێنایەوە بۆ ماڵ، بەڵام خەڵکی ئاوایی چونکە گوێدرێژیان هەبوو داریان پێدەهێنا بۆ

ئەوان کارەکە ئاسانتربوو. بەڵام ئەو کاتەی منداڵەکانم لە سیارە گیران و زیندانی کران، چەند سەرە ڕەشە وڵاخێکمان هەبوو خەڵکی گوندەکە و ئازادی مامە عەزەم ماڵیان ئاوا بێت بردبوونیان بۆ قلیجەو لەوێ بەخێویان کردبوون. لە دوایدا ناردم ڕەشە وڵاخەکانیان بۆ هێناین بۆ سۆڵە کە لەو کاتەدا بۆ ئێمە داهاتێکی باشی هەبوو.

بەم شێوەیە سەرلەنوێ جارێکی دیکە ماڵم پێکەوەنا و تا ڕادەیەك بێخەم بوو لەوەی خانەوادەکەم لە مەترسی گیران و ئەشکەنجەدا بن. عەلی و گوڵاڵە هەرچەند لە قوتابخانە دواکەوتبوون، بەڵام دەستییان کردەوە بە خوێندن. مامۆستا عومەری شێخ باهیر مامۆستایەکی زۆر چاکبوو بۆیان و دەیزانی منداڵی منن زۆر چاودێری دەکردن.

### سەربازی ڕاکردوو

جەنگی عێراق - ئێران ڕۆژ بە ڕۆژ گەرمتر دەبوو. بەعس بە هەموو هێزێکییەوە بەو شەڕەوە خەریك بوویوو هەرچی گەنج هەبوو کرابوونە سەرباز و ئەوەی شموولی سەربازی نەدەکرد و توانای هەبوو بەزۆر دەکران بە جەیشی شەعبی و جۆرەها مەفرەزەی جاشیشی دروستکردبوو بۆ ڕاوی پێشمەرگە، بەڵام لە کوردستان بەهۆی بوونی پێشمەرگەو ناوچەی ئازادکراو بواری بۆ گەنجان ڕەخساندبوو نەچنە بەرەکانی جەنگ و خۆیانی لێ بدزنەوە. ئەو سەربازانەی دەنێردرا بۆ بەرەکانی شەڕ هەم لە ترسا و هەم نەیاندەویست خزمەت بە بەعس بکەن ڕایان دەکرد و دەهاتنە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە، هەندێکیان دەبوونە پێشمەرگە و هەندێکیشیان لە ماڵە خزم و ناسراوەکانیان دەمانەوە، بەڵام ئێمە کێشەی چەکمان هەبوو.

دەستکەوتنی چەك یان ئەبوایە لە شەڕدا بمانگرتایە یان لە بازاڕی ڕەشدا بمانکڕیایە. ڕۆژ بە ڕۆژیش ناوچەی ڕزگارکراو فراوان دەبوو وای لێهاتبوو حکومەت تەنها دەیتوانی جادە سەرەکییەکان و شارەکان بپارێزێت.

## شەڕی ئەحمەد برندە

لە گوندی زەلەڕەش بووم پیاوێك هات گوتی مام دەروێش کوڕێك گیراوە دەڵێ خزمی مام دەروێشم. کە چووم بۆ لای پێشمەرگەکان بینیم فایەقی عەلی پیروەیسە، کە لەلایەن مام ڕۆستەمەوە گیراوەو داوای دوو تفەنگی لێکردووە بیکرێت. منیش بە مام ڕۆستەمم گوت ئەو کوڕە لە ڕێکخستن دایە نیازی وایە تفەنگێك بکرێت و لای خۆم ببێت بە پێشمەرگە. مام ڕۆستەم گوتی هەرچەندە باوەڕم نیە ئەم کوڕە بۆ پێشمەرگایەتی هاتبێت، بەڵام لە ئاست تۆدا هیچم پێ ناکرێت، لەبەر خاتری تۆ با وابێت. پاشتر پرسیارم کرد لەوانەی کە مامەڵە بە چەکەوە دەکەن گوتیان مەحمووی مینا لە ئەحمەد برندە کلاشینکۆفێکی هەیە دەیفرۆشێت. لەگەڵ فایەق دوو بە دوو چووین بۆ ئەحمەد برندە و تفەنگمان کڕی و شەو لەوێ ماینەوە. ئەو ڕۆژەی ئێمە چووینە ناودێ ڕێکەوتی بەرواری (١٩٨٢/٢/٢٨) بوو، مەفرەزەیەك لە پێشمەرگەکانی یەکێتی لە تیپی شارەزوور لە بەیانییەکی سارد و تەم و مژاویدا لەسەر ڕێگەی سەرەکی دەربەندیخان سلەیمانی، نزیك گوندی چنارە لە نیشایەك و جێب قیادەیەکی سەربازییان دابوو، ئەوەندە بە دەستوبرد لێیاندابوو ڕەبایەکانی سەر شاخەکەی بەرامبەریان فریانەکەوتبوون دەست بکەنەوە و بێ زیان گەڕابوونەوە ئەحمەد برندە. ئەو ڕۆژە کەش و هەوا زۆر سارد و باراناوی بوو، پێشمەرگەکانیش شەکەت و ماند بوون پێشبینی ئەوەیان نەکرد بوو حکومەت هێرشیان بۆ بهێنێت.

سەر لە بەیانی (١٩٨٢/٣/١) پێش کاتی نوێژی بەیانی هەستام، حاجی شێخ سەعید چووبوو بانگی بەیانی بدات، بینیبووی سەرباز و جاش بەشاخەکەوەن و خەریکن دەوری دێ دەگرن. بە خێرایی هات گوتی دەروێش ساڵح دەوری دێ گیراوە نازانم حەرەستان هەیە ئاگاداری ئەوە بێت؟ گوتم لەوە ناچێ دیارە حەرەسیان دەرنەکردووە. بینیم کۆمەڵە سەربازێك لە تەنیشت دێکەوە دەهاتن و نیازییان هەبوو دەوری دێ بە تەواوەتی بگرن، منیش ریزێك فیشەکم پێوەنان و سەربازەکان گەڕانەوە و خەڵکی ئاوایی و پێشمەرگەم بە ئاگا هێنا، پێشمەرگەکان بەپەلە هاتن و شاخەکەی بەرامبەرمان لێگرتن. شەڕ دەستی پێکرد هەتا دوای نیوەڕۆ شەڕ بەردەوام بوو. لەو شەڕەدا فیشەکێك بەر شانم کەوت و بریندار بووم و بە جامانەکەم بەستم. شەڕەکە تا دەهات گەرمتر دەبوو پێشمەرگەی تر لە ناوچەکەدا بوون و هەواڵەکیان پێگەشتبوو و هاتن بە هانامانەوە. لەو پێشمەرگانەی لەوێ بوون، ئەوانەی یەکێتی بە فەرماندەیی حامیدی حاجی غالی و شەوکەتی حاجی موشیر بوو، ئەوانەی حیزبی شیوعیش بە فەرماندەیی فەتاح گلاڵی بوو هاتن بە هانامانەوە و جەیش و جاش تێکشکا و کشایەوە.

سەرەنجامی شەڕەکە بە داخەوە فەرماندەی مەفرەزەکە کە ناوی شێخ عەلی بوو و خەڵکی تەڕاتەوەن بوو شەهید بوو. کاتێك شەهید دەبێت دەکەوێتە نێو ئاوێکەوە کە خەدیجەی مامۆستا شێخ محەممەد لەگەڵ چەند سەربازێکی هەڵاتوودا لە ئاوەکە دەریدەهێننەوە. هەروەها دوو سەربازی ڕاکردوو کە خەڵکی گوندەکە بوون بە ناوەکانی کەریم ئەحمەد دیوانە و ناجی حسەین فەتاح، ئەمانیش شەهید دەبن. دوو برایشیان لەلایەن سەربازەکانەوە دەستگیر دەکرێن. پێشمەرگەکانی شارەزوور دکتۆریان لەگەڵ بوو برینەکەمیان دووریەوە و چارەسەری پێویستییان بۆ کردم. هەر ئەو ڕۆژە

جاشەکان دەوری گوندی عازەبانیان گرتبوو، بەڵام هیچ سەربازێکی فیراریان نەگرتبوو. هەندێك لە جاشەکان ئەگەر ئەفسەر و سەربازیان لەگەڵدا نەبوایە سەربازی فیراریان نەدەگرت.

## چەك فڕاندن

چەك هێنان بۆ ناو هێزی پێشمەرگە بووە دیاردە بەتایبەتی ئەوانەی ئەندامی ڕێکخستن بوون، ئەگەر سەرباز بوایە و ئەرکەکەی لە کوردستان بووایە، کە دەرفەتی بۆ هەڵدەکەوت چەکەکەی لەگەڵ خۆی دەهێنا و ئەرکێکی گەورەی لەسەر شانی شۆڕش کەم دەکردەوە، چونکە دەستکەوتنی چەك ئەستەم بوو، جاری وا هەبووە پێشمەرگەیەکەك بۆ ئەوەی چەکێکی دەستبکەوێت بۆ شۆڕش گیانی خۆی بەخت دەکرد. ئەوەی بەلامانەوە گرنگ بوو چەکی (BKC) بوو، چونکە زۆر کەم بوو لە بازاڕی قاچاخیشدا زۆر گران بوو، لەو ناوچەیەی ئێمەدا یەکەم کەس بیکەیسی هێنا مەلا عوسمان چیمەنی و عوسمان ساڵح پیرووەیس سیارەیی بوو، بەدوای ئەواندا حەسەن دوکانی (BKC)یەکی هێنا. ساڵی (١٩٨٣) سێیەم کەس کە (BKC) و کلاشینکۆفێك و دووربینێکی هێنا فاتیح محەمەد فرج بوو کە بە فاتیحە سور ناسرابوو خەڵکی خێڵی یاقوو بوو. حکومەت ئەوەندە بەلایەوە گران بوو لە دادگاییەکی سەربازیدا بە غیابی حوکمی ئیعدامی بەسەردا سەپاندبوو.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم باسی ڕووداوی چۆنیەتی هێنانی (BKC)یەکەی مەلا عوسمان و عوسمان سیارەیی بکەم. عوسمان ساڵح پیرووەیس خەڵکی سیارە بوو، پەیوەندی هەبوو پێمانەوە لەسەر شاخی چنارە سەرباز بوو. ڕۆژێك هاتە لام و پێی ڕاگەیاندم کە سەربازێك هەیە ناوی عوسمانە خەڵکی چیمەنی کەرکووکە و حەز دەکات پەیوەندی بکات. بە عوسمان سیارەیدا

هەواڵم بۆ نارد ئەگەر بکرێت مەفرەزەیەك بچین ڕەبایەکەمان تەسلیم بکات، بەڵام ڕێك نەکەوت، چونکە شوێنەکەیان زۆر سەخت بوو، کە لە شەستەکانەوە پۆلیس و لە حەفتاکانیشەوە سەربازی تێدابوو. هەڵکەوتەی شوێنەکەی وابوو ڕێگە نەبوو پەلامار بدرێت بەتەل و ئەڵغام دەوری گیرابوو. ڕێکەوتین لەسەر ئەوەی هەوڵ بدەن (BKC)یەکە بهێنن، چونکە لەو کاتەدا زۆر پێویستییمان پێی بوو. لەشەوێکی تاریکدا فرسەتیان هێنابوو (BKC)یەکە بە هەموو شریت و فیشەکەکانی و دەمانچەیەکی تەنویر و هەندێك ڕومانەیان هێنابوو، بۆ ئەو کاتە دەستکەوتێکی گەورە بوو، کە لە کوردستاندا و لە شۆڕشی نوێدا وێنەی کەم بوو.

جێگەی خۆیەتی لەسەر مەلا عوسمان بووەستم و باسێکی بکەم. مەلا عوسمان پیاوێکی ئازا و خوێندەوارێکی زۆر ڕۆشنبیر بوو بەتایبەتی لە بواری ئاینی، دەرچووی کۆلێژی شەریعە بوو لە نەجەف، عەرەبیزانێکی بەتوانا بوو شارەزاییەکی زۆری مەزهەبی شیعەی هەبوو لە ململانێی شیعە و سوننە زۆر بە ئاگابوو بەڕاستی پیاوێکی ڕۆشنبیر بوو و ئاکار جوان بوو، لە هەڵسوکەوتیش زۆر نەرم و نیان بوو. لەنێو خەڵك و پێشمەرگەشدا بە مەلا عوسمان بانگ دەکرا، پێشمەرگەیەك یان هاوڵاتییەکی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە گیانی دەسپارد تەڵقینی دەکرد و وتاری ئاینی لەسەر دەخوێندەوە، لە زۆر کۆمەڵ و دانیشتنی نێو خۆماندا ڕوونکردنەوەی بەسوودی بۆ دەداین، دایك و برا و خزمەکانی کە دەهاتن بۆلای خێزانێکی موتەدەین بوون و خواردنی خۆش و شیرینی نایابیان بۆ دەهێنا و ئەویش هەموو کات بەشی هاورێکانیشی دەدا بەتایبەتی بەشی منداڵەکانی من، هەرکات خانەوادەی مەلا عوسمان بهاتنایە ئەو ڕۆژە جەژنمان بوو بەتایبەتی ئەوماڵەی کە لێی دەمانەوە، بەزۆری دەچوونە مچەکوێر (کانی حەیران)، ماڵی مامە ڕەوف ماڵێکی زۆر باشبوون بۆ مەلا عوسمان، دایکی مەلا عوسمان زۆر ژنێکی سەلار بێدەنگ بوو بە مەلا عوسمانی گوتبوو ڕۆڵە وریای خۆتبە ئازاری کەس نەدەی

هەتا ئەگەر بە ڕێگەیشدا ڕۆیشتی ئاگاداری بەرپێی خۆت بە نەوەك پێ بنێیت بە مێروولەیەکدا و بیکوژی، برادەرەکانی گوتبوویان پورێ مێرولەی چی ئەو لە شەردا بە چەك فیشەك بە پیاویشەوە دەنێت. دایکیشی گوتبووی ناشێ عوسمان ئیشی وا بکەی؟!!. هەموو کات پێشمەرگە و خەڵکی ناوچەکە مەلا عوسمانیان دەبینی ئەم قسەیان دەگێڕایەوە.



فاتح محەمەد فەرەج (فاتیحە سوور) - مام دەروێش



عوسمان ساڵح پیرەویس

## شەڕی ئاوەکەڵە و ڕووداوێکی خەمناک

ئەو کەسانەی لە کۆتایی حەفتاکاندا لە ڕێگەی منەوە لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە ئیشیان دەکرد یەك بەدوای یەکدا و لە کاتە جیاوازەکاندا دەبوون بە پێشمەرگە یەك لەو کەسانە کەریم ڕەسوڵ ڕەحمان بوو، کە تاقانە بوو و باوك و دایکیشی نەمابوو، باوکی کەریم ئامۆزام بوو. کەریم پێشمەرگەیەکی ئازاو گورج و گۆڵ بوو، تەمەنی لە هەڕەتی لاوێتیدا بوو و دەیویست خێزان پێکەوە بنێت، داوای کچێکمان بۆ کرد خەڵکی گوندی شەممە بوو. ماڵی باوکی کچەکە گفتییان دا کچەکەی بدەنێ، ئێمەش بڕیارماندا لە ماوەیەکی کەمدا بچین بەسەر وەختی مارە بڕینەکەیەوە. کەریم لای نەنکی لە سیارە پارەی دانابوو، گوتی دەچم دەیهێنم، لەگەڵ مەلا عوسمان چیمەنی پێکەوە چوون بۆ سیارە.

لێرەدا باسی ڕۆژێکی پێشتر دەگێڕمەوە کە مەفرەزەیەکی تیپی پەنجا و پێنجی قەرەداخ لە عەریەت ڕەبایەکیان گرتبوو، کە یازدە جەیشی شەعبی تێدابوو هەر هەموویان بە دیل گرتبوون و یازدە چەکیشیان لەگەڵ هەموو تەقەمەنییەکانی ناو ڕەبایەکەیان هێنابوو. دیاربوو ئەندامی ڕێکخستن لەنێو ڕەبایەکەدا هەبووە و هاوکاری پێشمەرگەی کردووە، حکومەت هەواڵی پێگەشتبوو کە دیلەکان لە ئاوەکەڵەن بە هێزێکی زۆرەوە هێرشیان هێنا. لە (١٩٨٢/٢/٩) من لە کۆرە بووم و کەریم و مەلا عوسمان هاتنەوە و پرسیاری خزمانی سیارە و سەفەرەکەم لێکردن. لەو کاتەدا حەرەسەکە بانگی کرد کاروانێکی سەربازی لە دسکەرەوە بەرەو ئاوەکەڵە دێت. ئێمەش خۆمان کۆکردەوە و چووین بۆ ئاوەکەڵە. لەوێ شەڕێکی سەخت ڕوویدا، لە کاتی شەڕەکەدا حەماسەتم زۆر بەرز بووبوویەوە و کردبووم بە هەراو بەرەو

پێشەوە دەچووم. لەو شەڕەی ئاوەکەڵەدا ئەوەندە چووبوومە پێشەوە لالە ئەنوەری خەلیفە یونس گوتی مام دەروێش خەریك بوو تەقەت لێ بکەین وامان زانی جاشی دوایی بۆمان دەرکەوت کە تۆ بووی.

لەو شەڕەدا نورەدینی سەید قادری باخچە و سەعیدی حاجی غەریب و شێخ محەمەد ئەمین عازەبانی و ئەنوەری خەلیفە یونس و جەماله سوور و شێخ حەسیبی خەڵکی شێوی قازی و عەبدوڵڵا دسکەرەیی و چەندین پێشمەرگەی دیکە بەشدار بوون بە داخەوە ناوەکانیانم لە یاد نیە، بە گشتی لەو شەڕەدا هەموو پێشمەرگەکان ڕۆڵێکی قارەمانانەیان هەبوو بە تایبەتی (BKC)یەکە کە بە مەلا عوسمان بوو ڕۆڵێکی زۆر گرنگی بینی کە کۆپتەرەکان نەیانەدەوێرا بەپێی پێویست نزم ببنەوە. بەداخەوە لەو نەبەردییەدا (کەریم ڕەسوڵ) شەهید بوو. کە دامانابوو لە کاتی ژن مارەبڕینەکەیدا ئاهەنگێکی خنجیلانەی بۆ بکەین و مەلا عوسمان چیمەنی وتاری بەیەك گەشتنییان ڕابگەنێت، بەڵام بەداخەوە خەیاڵ لە کوێ و قەدەری خودا لە کوێ،


کەریم ڕەسوڵ محەمەد

بە پێچەوانەی ئارەزووی ئێمەوە لەبری وتاری ڕاگەیاندنی هاوسەرگیرییەکەی کەریم لە دێی سۆڵە لە سەرقەبران مەلا عوسمان وتاری ماڵئاوایی و تەڵقینی سەر تەرمەکەی خوێند کە بۆ من و هەموو پێشمەرگە ڕۆژێك بوو لە زاکیرەماندا نەخشی داکوتا کە بۆ هەتاهەتایە بیرنەچێتەوە.

لە سۆڵە پرسەم بۆ دانا و خەڵکێکی زۆر و پێشمەرگە هاوخەمم بوون، بەتایبەت جەبار غەریب زۆر ناڕەحەت بوو بۆ شەهید بوونی کەریم.

کەریم جگە لە خۆی ڕەسوڵی باوکی و ڕەمەزانی مامی لە ساڵی (١٩٦٣) بە گوللەی سەربازانی زەعیم سدیق شەهید بوون و گیانیان بەخشییە میللەت و نیشتمانەکەیان. هەر لەو شەڕەی ئاوەکەڵەدا ژنێک بە ناوی خانم ساڵح لەگەڵ منداڵەکەی، کە خەڵکی گوندی کۆرەی سەروو بوون بەتەقەی کۆپتەر شەهید بوون.

## گیرانی ئیسماعیل خان

لە سۆڵە لە ماڵی خۆمان بووم، عەلە ڕەش هات و گوتی دەروێش سمایل خان گیراوە و لە تەکیە زیندانە گوتویەتی با دەروێش ساڵح سەرێکم لێ بدات. یەکسەر خۆم کۆکردەوە و قەسابێك هەبوو لە سۆڵە مانگایەکم پێ فرۆشت بە (٢٠٠) دینار و (١٠٠) دینارم خستە باخەڵم و لەگەڵ عەبدوڵڵای حاجی مەحمود بیرکێیی کە پێشمەرگە بوو لەگەڵما بەرەو تەکیە بەڕێکەوتین. هەر لە ڕێوە چووم بۆ سجنەکە ساڵحە گڕە پاسەوانی دەکرد گوتی: مام دەروێش دەبێت لە پەنجەرەوە قسەی لەگەڵ بکەیت، بە فەرمانی کاك حامید و کاك سامان دەرگا ناکەینەوە، ئێستاش خزمەکانی هاتن و ئەوانیش هەر لە پەنجەرەوە قسەیان لەگەڵ کرد. زۆرم لەبەر گران بوو گوتم دەرگاکە دەکەیتەوە یا دەرگاکە بشکێنم. دەرگایان کردەوە و سمایل خانم هێنایە دەرەوە و پێکەوە چووین بۆ سەر کانی و ئاوێك نوێژمان کرد و پشوویەکمان دا. لەو کاتەدا کوێخا فەریق و خزمەکانی پەیدا بوون، کە پێشتر هاتبوون لە

پەنجەرەوە بینیبوویان، کە بەم شێوە ئێمەی بینی زۆری پێ خۆش بوو. کوێخا فەریق پیاوێکی دیاری سەرقەڵایە و کوردۆی کوڕی ئێستا ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای سلێمانیە لەسەر لیستی یەکێتی. لەو کاتەدا کە لەسەر کانی و ئاوەکە دانیشتبووین (١٠٠) دینارەکەم کردە باخەڵی سمایل خان قبوڵی نەکرد و گوتی حەقە ئێمە یارمەتی تۆ بدەین. سمایل خان باسی هۆکاری گیرانەکەی بۆ کردم کە چۆن لەسەر قەڵا گیراوە و بێتاوانە.

شێخ ئەحمەدی تەکیە هاتە لامان و بانگهێشتی ئێوارەی کردین. بە ڕێگەوە بووین بۆ ماڵی شێخ ئەحمەد، کاک حامید سمایل خانی بینیبوو بە ساڵحە گژەی گوتبوو بۆ سمایل خان لە دەرەوەیە! ساڵح گوتبوی دەروێش ساڵح لەگەڵ خۆی بردویەتی. کاک حامید و کاک سامان ماڵیان ئاوا بێت قسەیان نەکردبوو، چونکە زۆر ڕێزی منیان دەگرت.

شەو لە ماڵی شێخ ئەحمەد بوین و ماڵی ئاوابێت زۆر خزمەتی کردین. بەیانییەکەی چووینە لای کاک سامان و کاک حامید، گوتم سمایل خان بۆ گیراوە؟ گوتیان لەسەر داوای مام جەلالە و داوای دەکات. گوتم باشە با بەری بدەین و خۆی بڕوات. گوتیان کێ ئەڵێت خۆی ئەڕوات بۆ سەرکردایەتی. لە وەڵامدا گوتم من کەفیلی دەکەم. ڕازی بوون و سمایل خان بەردرا پاشان لەگەڵ محەمەدی برام چووبوون بۆ سەرکردایەتی بۆ لای بەڕێز مام جەلال و لەوێ مام جەلالیان بینیبوو کێشەکە کۆتایی پێهاتبوو و مام جەلالیش زۆر ڕێزی لێ گرتبوون.

سمایل خان کوڕی عەزیز خانی برایم خانی دەلۆیە، سەرۆک و برا گەورەی عەشرەتی دەلۆیە لە (٢٥/٣/ ٢٠١٦) کۆچی دوای کردووە و ئێستا دکتۆر حسەینی کوڕی لە جێگەیەتی و پیاوێکی ڕێز لێگیراوە و یەکێکە لە کەسایەتیە دیارەکانی ناوچەی گەرمیان و پیاوێکی ڕۆشنبیرە.

## شەڕی براکوژی

بەداخەوە بۆ جارێکی دیکە شەڕی لایەنەکان دەستی پێکردەوە لێرە و لەوێ شەڕ گەرم بوو، لایەنەکانی سەر گۆڕەپان زۆربەی توانای خۆیان بەو شەڕەوە سەرف کرد. چەندین فەرماندە و پێشمەرگەی قارەمان کە بەعس بە هەموو هێزێکیەوە هەوڵی دەدا لەناوییان بەرێت نەیتوانی و شکستی هێنا، بەڵام لە شەڕی ناوخۆدا گیانیان لەدەستدا.

سنووری تیپەکەی ئێمە تیپی پەنجاو پێنجی قەرەداخ بوو جگە لە حیزبی شیوعی هیچ لایەنێکی دیکەی تێدانەبوو، یەکێتی حاکم و فەرمان ڕەوای ناوچەکە بوو. قەرەداخ بە قەڵای کۆمەڵە ناسراو بوو، لەبەر ئەوە یەك دوو شەڕی بچوك نەبێت هیچ پێکدادانێکی ئەوتۆ ڕووی نەدا کە شایانی باس بێت. مەلا بەختیار و بەهادین نوری ڕۆڵێکی ئاشتیخوازانەیان بینی لەوەی شەڕ ڕووی نەدا. بە فەرمانی مەلا بەختیار ڕێگە درا هەموو پێشمەرگەکانی حیزبی شیوعی، کە لەقەرەداخ کۆبووبوونەوە بەسەلامەتی و بەبێ شەڕ پاشەکشە بکەن بۆ شارەزوور و سوورێن.

ڕۆژێك هەرخۆم بەتەنها لە سۆڵەوە تراکتۆرێکم برد بۆ دوکان بۆ ئەوەی کێلی قەبر و لم و چیمەنتۆ بکڕم و قەبری شەهید کەریمی پێ هەڵبەستم، لە دوکان کەوتمە ناو هێزێکی حیزبی شیوعییەوە هەموو پێشمەرگەی قەرەداخ و گەرمیان بوون، من چاوەڕێی هیچ ڕووداوێکی نەخوازراو نەبووم، لەناکاو لە هەر چوار لاوە میلی تفەنگیان لێ ڕاکێشام، بڕیارمدا چەکیان نەدەمێ و فرسەت بهێنم و دەستیان لێ بکەمەوە و شەڕ بکەم تا دەکوژرێم، بەڵام ڕایەکەم گۆڕی، چونکە بیرم کردەوە من لەناو تراکتۆرەکەدام و ئەوانیش هەموویان لە بن بەرد و سەنگەردا خۆیان دامەزراندووە و شوێنی ئەوان زۆر

قایمە. لەلایەکی دیکەشەوە زۆرم بەلاوە ناخۆشبوو دوای ئەو هەموو خەباتە لە بەرامبەر سەنگەری دوژمن لە سەنگەری براکوژیدا خوێنم بڕژێ یا من خوێنی برایەکی پێشمەرگەی برژم، بە باشم زانی چەکەکەیان بدەمێ و خۆشم بەدیلی بکەومە لایان، دیاربوو حەزیان دەکرد من لایان بمێنمەوە، چونکە بە مانەوەی من لایان تا ڕادەیەك ئەوانیش پارێزراو دەبن، داواکارییان ئەوەبوو هەندێ چەکیان گیرابوو لای یەکێتی بییاندرێتەوە. ئەوەبوو دوای ڕێکەوتنەکەیان لەگەڵ مەلا بەختیار کێشەکە تا ڕادەیەك کۆتای پێهات.

لە دوای ماوەیەك لە سۆڵە بووم عەبدوڵڵای حاجی مەحمودی بیرکێی و پێشمەرگەیکی دیکەم لەگەڵ بوو، تۆفیق فتحولڵا فەرماندەیەکی حیزبی شیوعی بوو لەگەڵ چوار پێشمەرگە چووبوونە ماڵی ئێمە، چونکە ترسی ئەوەیان هەبووبوو بچنە ماڵێکی دیکە و من تۆڵەیان لێ بکەمەوە، بۆیە چووبوونە ماڵی خۆمان و منداڵەکانیان کردبووە قەڵغانی خۆیان. لە کاتی نان خواردندا لەپاڵ خۆیاندا دایاننابوون، گومانی ئەوەیان کردبوو لە ماڵەوەم. دوای نان خواردن لە ماڵ دەرچوون و بەرەو گوندێکی دیکە کەوتنە ڕێ، سەد مەترێك لە ماڵی ئێمە دووركەوتنەوە چەند فیشەکێکی گرڕدارم بە سەریانا تەقاند، بۆ ئەوەی بزانن ئەوە پەیامێك بوو بۆیان کە ئەمتوانی تۆڵەیان لێ بکەمەوە بەڵام نەمکرد.

لەو کاتەدا شیوعیەکان هاتبوونە سۆڵە ئەندامانی خۆمان هەواڵیان بردبوو بۆ پێشمەرگەکانی یەکێتی و ئەوانیش خەمی منیان بوو بە پەلە بە تراکتۆر هاتبوون بە هانامانەوە، کە ئەوان گەیشتن شیوعیەکان ڕۆشتبوون و داوام لێکردن کە دوایان نەکەون. لە دوایدا هەندێ لە برادەرەکانی خۆمان سەرزەنشتیان کردم کە بۆچی ئەو دەرفەتەم لە کیس داوە و تەقەم لێ نەکردوون یا چەکم نەکردوون و تۆڵەی خۆمیان لێ بکەمەوە، بەڵام

ئەوەندەی پێم کرابێت دژی شەڕی برا کوژی بووم، باوەڕم بە شەڕێ نەبووە کە ئەو ئامانجەی خەباتمان بۆ کردووە لە گۆڕی بنێین. هەرچەندە من زۆر دژی ئەوە بووم لەگەڵ حیزبی شیوعی بەشەڕ بێین، بەڵام جاری وا هەیە قەدەری شەڕ لە ئیرادەی تۆدا نیە. لەگەڵ حیزبی شیوعی کەشێکی تا ڕادەیەك نائارام لە نێوانماندا هەبوو، بەڵام لە هەردوو لاوە هەوڵ هەبوو حیزبی شیوعی بەو شەڕەوە تێنەگلێ، بەڵام دواجار حیزبی شیوعی چووە ناو بەرەی جوود و هاوپەیمانی لەگەڵ کردن و ئەمەش ڕەوشەکەی بەرەو نا ئارامی برد.

ڕۆژێك سەردار ناوتاقی لەگەڵ هێزەکەی هاتنە سۆڵە، گوتی مام دەروێش جەولەیەك دەکەین تۆش لەگەل مەفرەزەکەتدا لەگەڵماندا وەرە. منیش لەگەڵیاندا بە ڕێکەوتم. کەرتەکەی شینە گەرمیانی لە مەڵبەندەوە گەڕابوونەوە و بەرەو گەرمیان دەڕۆیشتن، یەکمان گرت و لەو گوندانەی قەرەداغ جەولەمان دەکرد. هێزێکی حیزبی شیوعی بە فەرماندەی مام ئەسکەندەر چەند ڕۆژێك بوو هاتبوونە قۆپی قەرەداغ.

لە (١٩٨٣/٥/٢) مەفرەزەیەکیان بە فەرمانەدەیی ڕەوفی حاجی ناسراو بە جەوهەر لە گوندی مەسۆیی قەرەداغ بە یەك گەیشتین و بوو بە شەڕ. ئێمە زۆر و ئەوان کەم لە شیوعیەکان دوو پێشمەرگە شەهید بوون و ئەوانی دیکەیشیان یان بریندان بوون یان بە پەلە پڕوزێ ڕزگاریان بوو لەوانە جەوهەری فەرماندەیان بوو کە بە برینداری ڕزگاری بوو. دوو پێشمەرگەی دیکەیشیان بە برینداری گیران، کە یەکێکیان کامەرانی عەلە ڕەش بوو هەردوو قاچی بریندار بووبوو و نەیتوانیبوو خۆی ڕزگار بکات. کە پێشمەرگەکانی یەکێتی گەڕابوون بە دوای بریندار و کوژراوەکانی حیزبی شیوعی بەلای کامەراندا ڕۆشتبوون نەیانبینیبوو، بۆ ئێوارەکەی خەڵك و تراکتۆرمان نارد بۆ ئەوەی تەرمی دوو شەهیدەکە بهێنن، هاوڵاتیەك کامەرانی بینیبوو بە برینداری خوێنی زۆری لەبەر ڕۆشتبوو، بەڵام ئامادە

نەبووبوو لەگەڵیاندا بێت، هاوڵاتییەکە هات بۆ لامان و گوتی پێشمەرگەیەکی شیوعی بە ناوی کامەرانی عەلەڕەش برینداره و تفەنگەکەی ئامادەکردووه و رومانەی لای خۆی داناوه و ئاماده نیه خۆی تەسلیم بکات. پێشمەرگەکان هەموویان پێیان ناخۆش بوو گوتیان مام دەروێش تۆ برۆ و مەفرەزەیەك لەگەڵ خۆت ببه و چارەسەری ئەو کێشەیه بکە، چونکه لەوانەیه به گوێی تۆ بکات.

ڕۆیشتین و دۆزیمانەوه، هەتا من چومه لای پێشمەرگەکان خەریك بوو کارەساتێك بقەومێنن. کامەران ئاماده نەبوو چەکەکەیان بداتێ، هەڕەشەم کرد هەر کەسێ تەقەی لێ بکات دەیکوژم. ئەوه کامەرانی عەلە ڕەشه و خوشکەزامه. سوێندم بۆ کامەران خوارد و پەیمانم پێدا کەس لە گوڵێ کاڵتری پێ نەڵێت. بە گوێی کردم و تابوتێکمان هێنا و خستمانه ناوی و بە گوێدرێژێك بردمان بۆ گوندی ئاوه سپی بۆلای پێشمەرگەکانی ئاوەسپی، لە ڕێگە هەر لە دەمی خۆی نەدەکەوت و قسەی پێ دەگوتین و گلەیی لە سەردار ناوتاقی دەکرد، کە دوو هەفته بەر لە ڕوداوەکە لە بناری سورێن بینیویەتی و خواردنی داوه بە پێشمەرگەکانی. سەردار ناوتاقیش سوێندی بۆ خوارد ئاگاداری ئەوه نەبووه شەڕ لەگەڵ حیزبی شیوعی بکەن. بۆ خۆم باوەڕم بە قسەکانی سەردار هەبوو، چونکه لە نزیکەوه سەدارم دەناسی و هاوڕێیەکی زۆر نزیکم بوو، کەسێکی بە وەفا و بە ئەمەك بوو یەکێکیش بوو لە پێشمەرگە سەرەتاییەکانی شۆڕشی نوێ.

لە شەڕی ناوخۆدا جاری وا هەبوو پێشمەرگەی لایەنێك لە مەڵبەندێکی تر زیانی پێ دەگەشت لە مەڵبەندێکی تر تۆڵەی دەکرایەوه. دیاربوو لەو کاتەدا حیزبی شیوعی بە تەواوی چووبووه بەرەی جوودەوه کە دژ بە یەکێتی ڕێخرابوو. بۆ مێژوو دەڵێم کامەران لەلایەن فەرماندەکانی یەکێتیەوه زۆر ڕێزی لێگیرا و پێیان گوت تۆ دیل نیت و بۆ هەرکوێ پێت خۆشه دەتنێرین،

لەگەڵ بریندارێکی تری هاوڕێی خۆی بردمان بۆ گوندی عەلییاوا لە ماڵێك بە خواستی خۆیان دانران. دکتۆر هۆشمەند دکتۆری یەکێتی بوو لەگەڵ هاوڕێیەکی لە گوندی چرچەقەڵاوە دەهات تەداوی دەکردن. پاش ماوەیەك حیزبی دیموکراتی ئێران بە عەلە ڕەشیان گوتبوو بە نهێنی کامەرانی کوڕت دەبەین بۆ بەغداد و نەشتەرگەری بۆ دەکەین. عەلە ڕەش فەرماندەی کەرتی یەکێتی بوو، گوتبووی مەیبەن چونکە دەمی ناوەستێ و قسە دەکات و کەشف دەبێت، ئەوکات کامەران و ئێوەش تووشی کێشە دەبن[1].

پاش ماوەیەك کامەران تەندروستی تا ڕادەیەك باش دەبێت بە نهێنی دەیبەن بۆ سورێن و چارەسەری تەواوی بۆ دەکەن و چاك دەبێتەوە. پێویستە بگوترێت کامەران لەگەڵ باوکی و ئازادی برای لەگەڵ دەستپێکردنەوەی شۆڕشی نوێ بە ڕابەرایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان خۆیان دەگەیەننە شاخ و دەبن بە پێشمەرگەی یەکێتی. پاش چەند مانگێك لە پێشمەرگایەتی کامەران لە سەرکردایەتی بریندار دەبێت، ئازادی برایشی لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا شەهید دەبێت. پاش چەند مانگێکی کەم لە شەڕەکەی مەسۆیی دکتۆر هۆشمەند و هاوڕێکەی لە چرچەقەڵاوە بۆ بارەگاکەیان دەچن لە شاخی زەردە مەفرەزەیەکی حیزبی شیوعی بۆسەیەکیان بۆ دادەنێن و هەردووکیان شەهید دەکەن[2]. ڕەوفی حاجیش (جەوهەر) لە دوای ئەنفالەکە بە نهێنی لە ماڵێك لە ئۆردوگای ئەسر دەبێت و شەوی (١٩٨٩/٩/٩) دەزگا سیخوڕەکانی بەعس پێی دەزانن و دەوری ماڵەکە دەگرن و جەوهەر بە دەمانچەیەك بەرگری دەکات و بە سەختی بریندار دەبێت و پاشان لە لایەن هێزەکانی بەعسەوە دەسگیر دەکرێت و پاش ساڵێك لەسێدارە دەدرێت.

---

(١) سەرچاوە. کامەرانی عەلە ڕەش

(٢) هەمان سەرچاوە.

ئەو پێشمەرگانەی لە شەڕی ناوخۆدا شەهید بوون یا بریندار کران هەموویان پێشمەرگەی ئازا و خوێندەوار و کوڕی تەنگانەی ڕۆژە سەختەکانی خەبات بوون، کە چەکیان دژی ڕژێمی دیکتاتۆری هەڵگرتبوو، بەڵام بە داخەوە بوونە قوربانیی پاوان خوازی و ململانێی حیزبایەتی.



کامەران عەلە ڕەش          مام دەروێش

## یەکێتی و هێزی کاریگەری سەرگۆڕەپان

ڕۆژ بە ڕۆژ هێزی پێشمەرگەی یەکێتی لە ڕووی ڕێکخستن و سەربازی و بنکەی جەماوەرییەوە لە گەشەسەندندا بوو، لەڕووی سەربازییەوە هێزێکی دەستبەکاری گورزوەشێن بوو، ڕۆژانە چەندین چالاکی سەرکەوتووانەی ئەنجام دەدا، خۆی مەیدانی شەڕ و کاتی شەڕەکەی دیاری دەکرد، حکومەت تەنها شار و ڕێگە سەرەکییەکانی بۆ دەپارێزرا، بەڵام بەداخەوە کورد

شـێرپەنجەی خۆخـۆری کـە لـەدێر زەمانـەوە بـۆی ماوەتـەوە توانـای شۆڕشەکەمانی بێهێز دەکرد. ئەگەر ئەو توانایەی لە شەڕی ناوخۆدا سەرفمان کـرد بـە دوژمنەکانمانـەوە خـەریك بووینایـە دەسـتکەوتی زۆر گـەورەمان بەدەستدەهێنا، گەرچی ناکۆکییەکان وەها باسیان لێوەدەکرا کەلەسەر شێوازی فەرمان ڕەوایی و زیاتر خزمەت کردنە بە میللەت، بەڵام لە بناغەدا لەسەر پاوانخوازی و بەرژەوەندی حیزبدا بوو. لەو کاتەدا یەکێتی ئەوەندە بەهێزبوو ئەگەر بێت و بەرەی کوردستانی پێکبهێنرایە و بەیەك دەنگ گفتۆگۆی لەگەڵ بەعسدا بکردایە ڕێڕەوەی گفتوگۆ بە ئاقارێکی دیکەدا دەڕۆشت و پێدەچوو ئامانجی گەورەی بەدەست بهێنایە.

## ڕزگارکردنی پێشمەرگەیەك

لە (١٩٨٢/١٢/١٨) پێشمەرگەیەکی یەکێتی بە ناوی جەلال نەجمەدین، کە خەڵکی هەڵەبجە بوو لە سەروی خۆیەوە نێردرابوو کە ڕاسپاردەیەکی بۆ حەمە قاشتی پێبوو. هاتبووە گوندی سیارە و چووبووە ماڵی ساڵحی مامە نادر، لەو کاتەدا حسەین و عەلی برای ساڵح سەربازی فیرار بوون. جەلال لە ماڵی ساڵح دەمێنێتـەوە و خزمـەتێکی باشـی دەکـەن. دوای نـانخواردنی نێـوارە سـاڵح بـە پێشمەرگەکە دەڵێت ئاوایی فیراری زۆری تێدایە، کە شەوان لەو کەژ و کێوە دەخەون و بە ڕۆژ دەگەڕێنەوە، یاتاخت بۆ ئەبەم بۆ دەرەوەی ئاوایی و بە ڕۆژ خۆم دەیهێنمـەوە. جەلال ڕازی نابێت و دەڵێت زۆر مانـدووم و چەن ڕۆژە بـە ڕێگەوەم کەس لە خەڵکی ئاوایی نازانێت لێرەم. ساڵح زۆر هەوڵ دەدات بەڵام بێسـود دەبێـت. بەیانییەکـەی زوو هەڵدەسـتن سـەیر دەکـەن دەوری دێ بـە سەرباز گیراوە. میمکە مینای دایکی ساڵح، جەلال خەبەر دەکاتەوە و هەواڵی پێـدەدات کـە دەوری دێ گـیراوە. سـاڵح و دایـکی خۆیـان تێکنـادەن و لـە

گەورەکاندا جێگەیەك بۆ جەلال و عەلی کوڕیان چاك دەکەن و هەرچی وایەری کارەبا هەیە لە گەوڕەکانیاندا لێی دەکەنەوە. سەربازەکان هەموو دنیەکە دەپشکنن و دەچنە ماڵی میمکە مینا. ئەفسەرەکە بە ساڵح دەڵێت گڵۆپی گەوڕەکان هەڵبکات، ساڵحیش دەڵێت کارەبامان بۆ گەوڕەکان نەبردووە. سەربازەکان خەریکن بچنە ژوورەوە میمکە مینا بڕیار دەدات دوو مەڕیان بۆ بکاتە مەولوی پێغەمبەر (د.خ) کە ئەم پێشمەرگە و عەلی کوڕی پارێزراو بێت. میمکە مینا بە سەربازەکان دەڵێت "دیارە کوردیشیان لەگەڵدا بووە" دەرگای گەوڕەکە مەکەنەوە، چونکە بەرخی تێدایە ئەگەر تێکەڵی مەڕەکان ببن بۆمان جیانابنەوە. لەو کاتەدا پێشمەرگەکەش گوێی لە دەنگی سەربازەکان دەبێت بڕیار دەدات ئەگەر بێنە ژوورەوە تەقەیان لێ بکات. بە ئازایەتی میمکە مینا و ساڵح و نەشڵەژانیان سەربازەکان ناچنە ژوورەوە و پێشمەرگەکە و عەلی ڕزگاریان دەبێت، بەڵام حسەینی کوڕیان لەلایەن سەربازەکانی ڕژێمەوە دەگیرێ و لەگەڵ خۆیان دەیبەن. پێویستە ئەوە بڵێم ئەم خانەوادەیە بە تایبەت میکە مینا زۆر خزمەتی پێشمەرگەیان دەکرد.



مام دەروێش　　　　　　　　　　ساڵح نادر ئەحمەد

## سیارە و میواندۆستی

خەڵکی سیارە زۆر میواندۆست و بە خوڵك بوون، کاتێك میوانێکیان دەبوو حەزیان دەکرد هەرچی خواردنی باش هەیە بیخەنە سەر سفرەی میوانەکە.

لە سەرەتای هەشتاکاندا لە دەربەندیخان میوانخانە (فندق) نەبوو، حاجی عەلی هەورامی ئوتێل (هەورامان)ی دانا، لەبەر بێ بازاڕی دایخست. لەو کاتانەدا ئۆتۆمبێلی شەخسی کەم بوو، خەڵکیی لە ڕێگەی گەراجەوە بە نەفەر هاتووچۆیان لەنێوان شارەکاندا دەکرد. بە شەو هاتووچۆی ئۆتۆمبێلی مەدەنی قەدەغە بوو، زۆرجاریش بەهۆی شەڕی پێشمەرگەو بەعس لە دوای عەسرەوە هاتووچۆ قەدەغە دەکرا. هەندێ جار وا ڕێدەکەوت خەڵکیی درەنگ دەکەوتن و ناچار لە نێو شاردا دەمانەوە و جۆش دادەمان و لە بازاردا خواردنیان دەست دەکەوت، بەڵام جێگەی مانەوەیان دەستنەدەکەوت، ناچار دەچوونە مزگەوتەکان.


عەلی پیروەیس

عەلی پیروەیس خەڵکی سیارە بوو ماڵی لە دەربەندیخان بوو، سەرەڕای ئەوەی هاوژینەکەشی هەردوو چاوی لە دەستدابوو، زۆربەی کات بە مزگەوتەکاندا دەگەڕا، گەر کەسێك بێلانەو بانە بوایە دەیبردنەوە بۆ ماڵی خۆیان. ئەگەر میوانەکانی زۆر بوونایە

جێیان نەبوایەتەوە ناچار منداڵکانی خۆی دەنارد بۆ ماڵە خزمەکانی و خۆی هەرچی لە دەست بهاتایە بۆی دەکردن و بەیانیەکەی لە بازار نان و ماستی بۆ دەکڕین و بە ڕێی دەکردن. بەداخەوە لە ساڵی (١٩٨٧) ئەم پیاوە سەخییە بەهۆی تۆپبارانی ئێران بۆ سەر دەربەندیخان لەگەڵ عەلی ڕەسوڵ و ماڵ و منالی مەحمودی پیروەیس و چەند کەسێکی دیکە شەهید بوون.

لەبارەی خوڵک و میواندۆستییەوە هەندێ جار ڕووداوی خۆش ڕووی دەدا. جارێکیان کاک سەید کەریمی عازەبان ڕێی دەکەوێتە گوندێکی قەرەداغ، بۆ نانخواردن و پشوودان لە ماڵێک لا ئەدات و دوای نانخواردن چای بۆ دەهێنن و یەك پیاڵە چا دەخواتەوە و دەڵێت بەزیاد بێت ئیتر ناخۆم. خاوەن ماڵ ئیتر چای بۆ ناهێنن. سەید کریم پەشیمان دەبێتەوە و دەڵێت حەزم لە چایە، ڕاستییەکەی وامزانی وەك و خەڵکی گوندی سیارە دەکەن بۆیە گوتم ناخۆم، چونکە لە گوندی سیارە کە گوتت ئیتر ناخۆم دوای ئەوە (٣) چای دیکەت هەر بە زۆر دەرخوارد دەدەن.

خەڵکی سیارە لە ئیش و کاردا زۆر ئازا بوون و هەرکاتێك دێهاتەکانی دراوسێیان پێویستیان بە هاوکاریەك هەبووایە بەخێرایی بە دەمیانەوە دەچوون. لە ساڵی (١٩٧٨) کە دێهاتەکانی سەر سنور بۆ ئۆردوگاکان ڕاگوێزران، کۆمەڵێك ماڵ بە خۆیان و مەڕ و ماڵاتەکەیانەوە هاتنە گوندی سیارە و زۆر بە گەرمی پێشوازیان لێکرا و خانوبەرەیان بۆ دابینکرا تا ئەو کاتەی پێویستی کرد بە خواستی خۆیان مانەوە.

ئەو ماڵانەی کە هاتن ئەمانە بوون:

- حاجی عەبدوڵڵا شەریف هۆرێنی
- سۆفی ساڵح قادر کونە قەلی (باوکی ستار)

- حەمەی حاجی ئایش (کوێرەکی)
- عەبدوڵڵا ڕەش داری ئیمانی
- حاجی تۆفیق مارف شمشێر کوڵی
- حاجی ڕەشید حاجی تۆفیق شمشێر کوڵی
- وەلید ئەحمەد شمشێر کوڵی.
- سۆفی عەلی حەمەساڵح کوێرەکی

تایبەتمەندیەکی دیکەی خەڵکەکە ئەوە بوو لە ئیشکردندا بە دەستوبرد و لە بەدەندا بەهێز بوون. تۆفیق زۆراب و حاجی محەمەد عەلی و ساڵح مامە نادر لە پیاوە بەهێزەکان بوون. جارێکیان وا ڕێکەوتبوو ساڵحی مامە نادر لەسەر خەرمان بە تەنها بووە و هەشت تەنەکە نیسکی کردووەتە هۆڕێکەوە، زۆر چاوەڕوانی کردبوو کەس نەهاتبوو لەگەڵیا بار بکات، هەرخۆی بە تەنها هەشت تەنەکە نیسکەکەی خستبووە سەر پشتی گوێدرێژەکە.

حاجی حەمە مراد دەستی شیعری هەبوو. لە شیعری هەجووکردندا حازر بە دەستبوو، هەرکات پێویستی بە هەجووکردن بووە شیعرێکی بۆ هاتووە. هەندێك لەو شیعرانەی بەسەر زاری خەڵکەوە ماون و بە داخەوە کەسێك یا دەزگایەك نەبووە کۆی بکاتەوە و لە فەوتان بیپارێزێ، دیارە خەڵکی ناوچەکەش لەبەر ئەوەی شیعرەکانی بەسەر ئەواندا گوتووە بۆیە کەس خۆی لە قەرەی کۆکردنەوەی نەداوە. حاجی حەمە مراد لە ساڵی (١٩٧٨) کۆچی دوایی کردووە.

سیارە پیاوی دەنگخۆشی تێدا بووە. کاکە برا بە دەنگە خۆشەکەی شیعری دەخوێندەوە، لەوانە شیعری "جوتیاری کزۆڵی". شێخ سەلامی عازەبانی لە کاتی خوێندنەوەدا لاواندنەوەیەکی خۆشی بۆ دەکرد و بە پێی

پێویستی ڕووداوەکان بەرز و نزمی بە دەنگی دەکرد. بە هەمان شێوە داستانەکانی شیرین و فەرهاد و ڕۆستەم و زۆرابی بۆ دەخوێندینەوە و لە کاتی خوێندنەوەدا چێژێکی یەکجار خۆشی بە چۆنیەتی خوێندنەوەکەی دەدا کە مەجلیسەکەی سەرسام دەکرد. بەشێکی بۆ دەخوێندینەوە و ماندوو دەبوو دەیگوت بەشەکەی دیکەی بۆ سبەی شەو ئیتر ئێمەش بە شەوق و زەوقەوە بە چاوەڕوانیەکی زۆرەوە چاوەروانی شەوی داهاتوومان دەکرد تا بزانین پاڵەوانی ناو چیرۆکەکە چی بەسەر دێت. هەروەها کاکە برا لە کڵاوێن کردندا شارەزاییەکی زۆری هەبوو زۆربەی کات لە یارییەکاندا براوە بوو.

##ساڵی (١٩٨٤)، گفتوگۆی یەکێتی نیشتیمانی و حکومەتی بەعس

نامەوێ باسی ڕەوشی گفتوگۆ بکەم چۆن کراوە و بۆچی کراوە و لەسەر چ بنەمایەك کۆبوونەوە و سەردانی هەردوولا بۆ لای یەکتر چۆن و بە چ شێوەیەك بەڕێوە چووە، چونکە پلەی لێپرسراوێتیم لە ئاستێکی وەهادا نەبووە تا لە وردەکارییەکانی ئاگادار بووبم و بڵێم گفتوگۆ بۆ کرا یان بۆ تێکچوو، من پێشمەرگەیەکی ئاسایی بووم فەرمانی سەرەوەی خۆمم جێبەجێکردووە، بەڵام ئەوەندەی من پێشمەرگە بووم لە ناوەڕاستی شەستەکانەوە چەندین گفتوگۆ و دانووستان لەگەڵ فەرمانڕەوایانی بەغدا کراوە و هەموو کات و هەموو سەردەمێك شۆڕشی کورد دانوستانیان بە یەکێك لە پایەکانی خەبات داناوە و هیچ کات بۆ بەدیهێنانی مافەکانی، گفتوگۆی ئاشتییانەیان ڕەت نەکردووەتەوە.

## گوندی نەوتی کاک نەوشیروان

لە سەرەتای گفتوگۆدا بوو کاک نەوشیروان هاتە قەرەداخ و لە گوندی نەوتی کۆبوونەوەی پێکردین کە زۆربەی پێشمەرگە و فەرماندەکانی ئەو ناوچەیە ئامادەی کۆبوونەوەکە بوون. پێی ڕاگەیاندین بۆ گفتوگۆ کردن لەگەڵ ڕژێمی بەغدا نوێنەرمان بە هاوکاری دۆستەکانمان چوونەتە بەغداد و لەگەڵ سەرانی بەعسدا گفتوگۆیان دەست پێکردووە. حکومەتی بەغداد دەستی بۆ ئاشتی درێژکردووە و ئەگەر ئێمە ئامادەیی دەرنەبڕین لای دۆستەکانمان و وڵاتانی جیهان دەڵێن ئەوە کوردە ئاشتی ناوێت و حەزی لە شەڕە. وەك خۆتان دەزانن ئێمە وەك یەکێتی نیشتمانی کوردستان هەر لە سەرەتای درووستبوونمانەوە دانوستانمان بە بەشێکی گرنگی خەبات زانیوە. ئەگەر بە ئاشتی بە مافەکانی خۆمان بگەین ئەوا قازانجمان کردووە ئەگەر نەشگەشتین ئەوا شێوازێکەی دیکەی خەبات و تێکۆشان پەیڕەو دەکەین. شێوازی چۆنیتی کارکردنی بۆ دیاری کردین و ڕێنوینی کردین بۆ ئەرکەکانمان لە کاتی گفتوگۆکاندا.

پاش ئەوەی بەڕێزی قسەکانی تەواو کرد دەرگای پرسیار کرایەوە و پرسیار و پێشنیارێکی زۆر کران، یەکێك لەو کەسانەی قسەی کرد عەلە ڕەش بوو، کە نائومێدی خۆی لە بەئامانج گەشتنی گفتوگۆ دەربڕی و گوتی "ئەوەندەی من بەعس بناسم تەنها کات بەڕێدەکات و ئامادە نییە مافی کورد بسەلمێنێت". دوای ئەو پێشمەرگەیەکی دیکە پێشنیاری کرد ئەو کەسانەی کە پیاوی بەعس بوون و کەسوکاری پێشمەرگەیان کوشتووە یا بە گرتنیان داوە ڕاست وایە شۆڕش لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکات. کاک نەوشیروان تووڕە بوو گوتی هەر پێشمەرگەیەك ئیشی وا بکات بە توندی سزای دەدەم، چونکە ئێمە بە سیاسەتی تۆڵەسەندنەوە شۆڕش ناکەین. من بۆ خۆم ئەم وەڵامەی کاک نەوشیروانم زۆر پێناخۆشبوو، بۆ پرسیارکردن مۆڵەتم خواست و

فەرمووم لێکرا. گوتم کاک نەوشیروان من لەگەڵ بیر و بۆچوونەکانی عەلە ڕەش هاوڕام و هەرگیز بەعس بۆ کردنەوەی گرێکوێرەکان بەڕاستی دەستی ئاشتی درێژ ناکات، بەڵام ئەوە کاری جەنابتان و سەرکردە سیاسییەکانە و ئێوە چاکتری لێ دەزانن. بەڵام زۆرم پێناخۆشبوو بەو شێوەیە وەڵامی ئەو پێشمەرگەیەت بەو توندییە دایەوە، کە داواکەی مافێکی تایبەت نیە و لەوانەیە داوای زۆربەی پێشمەرگە بێت، چونکە خۆت ئاگاداری پیاوەکانی بەعس چیان بە پێشمەرگە و کەسوکاری پێشمەرگە کردووە. کاک نەوشیروان دەنگی نەکرد و هیچ وەڵامێکی نەدامەوە. قسە زۆرکرا و بیروڕای زۆر ئاڵوگۆڕ کرا و دواتر کۆبونەوەکە کۆتایی هات.

دوای کۆبونەوەکە کاک نەوشیروان بە کاک شاسواردا کە کادیرێکی ڕێکخستن بوو، بڕی دوسەد و پەنجا دیناری بۆ ناردبووم، وەرم نەگرت و پارەکەم بۆ ناردەوە. گوتم کاک شاسوار کاک نەوشیروان دەیەوێت یارمەتیم بدات یا بە پارە دەمم دابخات و قسە نەکەم. دوایی کاک نەوشیروان ناردی بە شوێنمدا و کە ڕۆیشتم بۆ لای گوتی مام دەروێش دەزانم لە وەڵامدانەوەکەی من بۆ ئەو پێشمەرگە زویربووی، بەڵام من سەرکردەیەکی دیاری یەکێتیم و وەفدمان لە بەغدایە و لەوانەیە لەنێو پێشمەرگەکاندا پیاو خراپ و سیخوڕی تێدابێت، گەر من بڵێم بڕۆن تۆڵە بکەنەوە، لەلایەک مانای وایە بڕوام بە دانووستان نییە لە لایەکی دیکەوە دەبێتە جۆرێك لە بێسەرو بەرەیی و هیچ مانایەك بۆ دانووستان نامێنێتەوە و دوای دەڵێن نەوشیروان لە کاتی گفتوگۆدا ڕێخۆشکەر بووە بۆ کاری گێرە شێوێنی. ئەو کەمە یارمەتییەش کە بۆم ناردووی پارەی خۆم نییە و پێتی ببەخشم بەڵکو مافێکی بچووکی خۆتە و هیچ منەتێکی تێدا نییە و بۆ پێداویستی منداڵەکانت سەرفی بکە و داوای لێبوردن دەکەم کە تا ئێستا نەمانتوانییوە هاوکاریت بکەین. هاوکارییەکەم وەرگرت و بە دڵێکی سافەوە خودا حافیزیم لێکرد.

لە دوایدا کاک شاسوارم بینییەوە گوتی کاک نەوشیروان گوتوویەتی مام دەروێش پێشمەرگەیەکی دڵسۆز و پاکە پێویستە دڵی رابگرین.

کاک شاسوار لە سەرەتای هەشتاکاندا لە ناوچەی قەرداخ بوو، زۆر جار کارو چالاکی رێکخستنمان پێکەوە کردووە، پیاوێکی خوێندەوار و خۆشەویست بوو، یەکێك بووە لە پێشمەرگە سەرەتاییەکانی شۆڕشی نوێ، لە کارەساتەکەی هەکاری لەلایەن پارتی دیموکراتی کوردستانەوە بە دیل گیرا، پاشانیش لە دروستبوونی ئاڵای شۆڕشدا بووە لایەنگری ئەوان، بەداخەوە ئەم خەباتگێڕە دێرینەی شۆڕشی نوێ لە گەرمیان شەهید کرا.

شایەنی باسە جارێکی دیکەیش عەلە ڕەش بە هاوەڵی ڕەوفی یاسە لە سەرکردایەتی گەڕایەوە و هاتەماڵمان بۆ سۆڵە گوتی کاک نەوشیروان زەرفێکی کەپسکراوی بۆ ناردویت، کە کردمانەوە (٧٠) دیناری تێدابوو. لەو کاتەدا (٧٠) دینار بۆ من زۆر بوو بەڵام ئەوەی زیاتر دڵخۆشی کردم ئەوەبوو کە کاک نەوشیروان لە سەرکردایەتیەوە منی بە بیردا هاتووە.



مام دەروێش    نەوشیروان مستەفا

ئەو ڕۆژە بزنێکی دابەستەمان هەبوو بۆم سەربڕین، هەرچەند عەلە ڕەش زۆر هەوڵیدا سەری نەبڕم گوتی ئەگەر پێویستیت بە بزنەکە نیە بیفرۆشە و بۆ خەرجی منداڵەکانت سەرفی بکە، بەڵام هەر سەرم بڕی. هەموو کات عەلەڕەش پێی دەیگوتم دەروێش تۆ هەرچیت هەیە دەیدەیت بە گۆشت بۆ میوان، کەمێك دەستی پێوە بگرە تۆ خێزانداریت و ئەرکت گرانە.

لەبەر ئەوەی باسەکەم باسی هاوکاریکردنی تێکەوت حەز دەکەم باسێکی ئەو کەسانەش بکەم کە لە کاتی پێشمەرگایەتیدا هاوکارییان کردوم چ بە ماددی بێت وەك پارە چ بە خواردن و کەل و پەل بێت، کە لە کاتی پێشمەرگایەتیدا ناردویانە بۆ ماڵ منداڵم. خەڵکی نێو شار و لادێکان بە ئەندازەیەك پێشمەرگە و یەکێتی نیشتیمانیان خۆش دەویست هەمیشە ڕێزیان لێ دەگرتین و دەوڵەمەندەکان زۆر هاوکاریی پێشمەرگەو خێزانەکانیان دەکردین.

ساڵی (١٩٨٦) بارەگاکەمان لە گوندی نەژوێنی بوو لە قەرەداغ. لە دەربەندیخانەوە ئەوەندە هاوکاری دەکراین لە خواردن و ئازوقە جاری وا هەبوو بەشی ماڵانیشمان لێ دەدا. خۆمان لە بارەگا خواردنمان دروست دەکرد و کەمتر ئەرکمان دەخستە سەر ماڵەکان. کاتێکیش خێزان و منداڵەکانم لە سلێمانی زیندان بوون ڕێکخستنەکانی یەکێتی و خزم و ناسیاو هاوکاری و پێداویستیان بۆ ناردبوون بۆ زیندان. زۆر بوون ئەو کەسانەی لە کاتی پیشمەرگایەتیدا هاوکارییان کردووین چ بە ماددی یا ئازوقەو کەلوپەلی وەك جلوبەرگ و پێڵاو و تاقم تفەنگ و شتی دیکە. لێرەدا بە پێویستی دەزانم سوپاسی یەکە بە یەکەی هەموو ئەو کەس و برادەر و خزمانە بکەم ڕێزو خۆشەویستی خۆمیان بۆ دەربڕم بەتایبەتی بۆ خەڵکی گوندی سیارە چ ئەوانەی لە گوندەکەدا بوون چ ئەوانەی لە دەربەندیخان یا شوێنەکانی

دیکەی کوردستاندا بوون، چونکە هەموویان بە دەممانەوە بوون و ناگرێ یەك بە یەك ناویان بهێنم، لە دڵەوە سوپاسگوزاریانم، کاتێکیش ساڵی (١٩٨٤) لە سیارە خانوم دروست کرد هەر هەموویان یارمەتییان دام و هاوکارییان کردم.

داوای لێبوردنیش لەوانە دەکەم ئەگەر ناوەکەیانم لەبیر نەمابێت، ئەوانەی ناوەکەیم نەهێناوە و لەبیرم کردووە دوو هێندە سوپاسگوزاری دەبم لەپای ئەوەی یارمەتی داوم و لێرەدا ناوەکەیم لەیاد کردووە. لەوانەی کە لە یادم مابێت: تالیمی حاجی حەمە مراد، مەحمود بەگی عەزیز بەگی میرەدێی، شێخ عەبدوڵڵای چنارەیی، تۆفیق عەزیز کەریم (حاجی تۆفیق بەییج) مەحمود کەریم سیارەیی، محەمەد حەمە ئەمین سیارەیی، سابیر ئەمین خەسرەو، مەولود ئەمین خەسرەو، شەهید بەختیار زەڕایەنی.


شەهید بەختیار

شەهید بەختیار ناوی تەواوی (بەختیار حەمە رەشید کەریم)ە، بە مامۆستا بەختیار ناسراوە. ساڵی (١٩٧٨) پەیوەندی کردووە بە رێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە، ساڵی (١٩٨٨) لەلایەن دەزگا سیخوڕییەکانی رژێمی بەعسەوە دەستگیر دەکرێت و دواتر لە کەرکوك لە سێدارە دەدرێت.

## گەڕانەوە بۆ سیارە

هەر لەگەڵ دەستپێکردنی گفتوگۆی نێوان یەکێتی نیشتیمانی و حکومەتی عێراق کەشێکی نارام هاتە ئاراوە و منیشماڵەکەم بۆ جاری پێنجەم لە سۆڵەوە گواستەوە بۆ سیارە و خانوی کۆنکرێتم دروست کرد و خۆشم لە جەولەو ئەرکی پێویستدا بووم. ئەو کاتانەشی کە شۆڕش ئیشی پێم نەبوو سەردانی خزم و کەس و ناسیاو هاوڕێیانم دەکرد یا لە ماڵەکەی خۆم لەتەك منالّەکانمدا دەمامەوە.

ئەو ماوەیەی کە یەکێتی لەگەڵ بەعسدا لە گفتوگۆدا بوو بەرەکانی شەڕی عێرق – ئێرانیش کەمترین هێرش و پەلامار تێدابوو. تا ڕادەیەك دۆخەکە هێمنی بە خۆیەوە بینی و ئەو پێشمەرگانەی کە پرۆسەی هاوسەرگیریان نەکردبوو هەلیان بۆ ڕەخساو زۆربەیان خێزانیان پێکەوەنا و ماڵێك و نوایەکیان بۆ خۆیان پێکەوەنا، بەڵام لەبەر ئەوەی پێشتر ئەزموونی گفتوگۆی شکستخواردوومان دیبوو پێشمەرگە پشتی لێ نەکردەوە و هەموو کات ئامادە بوون بۆ هەر ئەگەرێکی نەخوازراو، بەڵام بە داخەوە سەرەنجام قسەکەی عەلە ڕەش هاتە دی و هەر زوو مەرامە پیسەکانی بەعس دەرکەوت و ڕۆژ بە ڕۆژ کاریان بۆ مەرامە نا مرۆڤایەتیەکانیان دەکرد و هیوای گفتوگۆیان لە گۆڕ دەنا. شەش مانگ لە نێو خانوی کۆنکرێتدا نەماینەوە و هێشتا قەرزی وەستا و مەوادم بە تەواوی نەدابووەوە خانوەکەمان چۆڵ کرد و بۆ جارێکی دیکە لانەو بانەم لێ شێواو بەرەو شاخ بەڕێکەوتینەوە.

## کۆتایی گفتوگۆ و دەستپێکردنەوەی شەڕ

ساڵی (١٩٨٥) لە کاتێکدا جیهان سەرقاڵ بوو بە جەژنی سەری ساڵەوە و ئاهەنگیان دەگێڕا، زستانی سارد و رەهێڵەی باران مژدەی بەهارێکی رەنگینیان دەدا، بەڵام لە کوردستاندا تەپڵی شەڕ لێدرایەوە و جارێکی دیکە و بە شێوازێکی دڕندانەتر ئەو بەرداشەی کە بەعس خستبوویە کار ڕۆژانە بە دەیان جەستەی ڕۆڵەی ئەم وڵاتەی دەهاڕی. یەکێتی نیشتمانی کوردستانیش سەرەڕای دوا تەقەللای بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو کۆسپ و تەگەرانەی دەهاتنەی ڕێی گفتوگۆکان بەڵام لایەنی بەرامبەر بەدەم داواکەیەوە نەهات و ئاواتی کورد و گەلی عێراقی لە گۆڕنا و دوا جار لە (١٩٨٥/١/١٥) ئێزگەی گەلی کوردستان بەیاننامەی کۆتای گفتوگۆی ڕاگەیاند.

بۆ جاری شەشەم لە باوەخۆشێن خانوویەکی بچوکم پەیدا کرد و حسین ساڵح ڕەحیم لاندکرۆزەرێکی پێبوو ناردم ماڵ و منداڵەکانمی هێنا بۆ ئەوێ. کە چووبوو بە دوایاندا چەند ڕۆژێکیش لە ماڵی خۆیان خزمەتی کردبوون. دوایی چووینە خانووەکە، کە هی محەمەد عەلی کەریم بوو.

لە (٣٠/ ٥/ ١٩٨٥) کە ماڵمان لە باوەخۆشێن بوو بەیانیەکی زوو خەڵك بۆ سەر مەزراکانیان دەچوون (٣) فرۆکەی کۆپتەر و (٢) فرۆکەی پیلادۆز هاتنە ئاسمانی باوەخۆشێن. لەو کاتەدا (فاتمە) کە خوشکی خێزانەکەم بوو بە دێنی سەردانی کردبووین لە ماڵی ئێمە بوو، فرۆکەکان ناپاڵمێکیان خستە خوارەوە فاتم گوتی مام دەروێش تەیارەکە تایەکانی کەوتە خوارەوە، منیش گوتم خۆتان حەشاردەن ئەوە تایە نیە و ناپاڵمە و یەکسەر دەتەقێتەوە. فرۆکەکانی تر ناو گوندەکەیان قەسف کرد و لەو ساروخ بارانەدا ژنێك بە ناوی جەمیلە عادل فەرج (خێزانی حاجی مەحمود) و پیاوێك بە ناوی محەمەد عەلی کەریم شەهید بوون.

باوەخۆشێن زۆر قەرەباڵغ بوو، پڕبوو لە ماڵە پێشمەرگە و ماڵە سەربازی ڕاکردوو. ئێمە جێگەمان زۆر تەنگ بوو هەندێ ڕەشە وڵاخمان هەبوو لە سیارە ئەو خزمانە بۆیان بەخێو دەکردین، هەواڵم نارد بۆ حسەینی مامە نادر و جەمال مەحمود فەرەج وڵاخەکانیان بۆ هێنایین. لەوێ جێگە و ڕێگەمان کەم بوو جێگەی وڵاخەکان نەبوو بەخێویان بکەین، لەبەر بێ جێگەیی بارمان کرد بۆ گوندی مچەکوێر. بۆ جاری حەوتەم ڕیتە و پیتەمان پێچایەوە و لە گوندی مچەکوێر کەمالی مامە ڕەوف خانوویەکی چاکی داینێ و لەوێ گیرساینەوە.

لە گوندی مچە کوێر[1] یادەوەری زۆرم هەیە. لەبەر ئەوەی گوندەکە لە بناری شاخەکەدابوو، بووبووە ڕێگای پێشمەرگە بوو بۆ شارەزوور. ئەمەش بووبووە بارگرانییەك بۆ خەڵکی گوندەکە چونکە دەبوو بەردەوام خزمەتی پێشمەرگە بکەن. جارێکیان لەگەڵ حەمەسعیدی حاجی غەریب و سەردار ناوتاقی چووینە گوندەکە چونکە کێشەی ئاوی خواردنەوەیان هەبوو. سەرچاوەی ئاوەکەیان لە سەروی گوندەکەوە بە دۆڵێکدا دەهاتە خوارەوە و پیس دەبوو و خەڵکەکە ئاوی پیسیان بەکار دەهێنا. کاك حمە سدیق حسەین لالەبرا ئەنجومەنی گوندەکە بوو، قسەمان لەگەڵ کرد کە پارە لە ماڵەکان کۆ بکاتەوە و بۆ خۆیشم بە برێك پارە کۆمەکیم کردن و مەوادی پێویستی وەك بۆری و چیمەنتۆ بکرێت و سەرچاوەی ئاوەکە بکاتە حەوز و بە بۆری ئاوەکە ڕابکێشن بۆ ناوەڕاستی گوندەکە و حەوزێکی تر دروست بکەن و هەر ماڵێك سۆندەی خۆی ڕابکێشێت. کاك حەمە سدیق کارەکەی ڕاپەڕاند و ڕزگاریان بوو لە ئاوی پیس.

---

[1] مچە کوێر. ئێستا ناوەکەی گۆڕدراوە بۆ کانی حەیران

ساڵی (١٩٨٥) کە ماڵم چووە مچەکوێر بە گشتی دانیشتوانی گوندەکە زۆر هاوکارم بوون بە تایبەت ئەم برایانە؛ (ڕەوفی حسەینی لالەبرا و کوڕەکانی - کەمال و جەلال و ڕۆستەم، حاجی شەریف مەحمود موسا، عەبدوڵڵا حسەین لالەبرا، حەمەکەریم عەبدول).

کەمالی مامە ڕەوف ئەندامی کۆمەڵە بوو لە دوایشدا بوو بە پێشمەرگەی بەرگری. ڕۆستەمی برای ساڵی (١٩٨٨) شەهید بوو. مامە ڕەوف پیاوێکی زۆر میواندۆست بوو، کاتێك مەلا عوسمان چیمەنی کە (BKC)یەکەی هێنا بۆ ناو شۆڕش کە پێشتر باسم کردووە، مامە ڕەوف چوو بۆ کەرکوك دایك و خێزانەکەیانی هێنا بۆ مچەکوێر، گەر لەو کاتەدا لە کەرکوك بگیرایە ئیعدام دەکرا. پێویستە بگوترێت ساڵی (١٩٧٨) کاتێك سوپای عێراق کێوماڵی قەرەداغی کرد، میمکە ئاسکە خێزانی مامە ڕەوف مامۆستا ئەنوەر، کە پێشمەرگە و کادیری ڕێکخستن بوو لە ماڵی خۆیان شاردیەوە و لە گرتن و کوشتن ڕزگاری کرد. مامۆستا ئەنوەر کادیرێکی ناسراوی کۆمەڵە بوو لە هەرێمی پێنجی قەرەداغ.

کاك کەمال و جەلالی برای زەویان داینێ بەبێ ئەوەی هیچ کرێیەکمان لێ بسێنن، منیش بە هاوکاری منداڵەکانم دەمانکرد بە گەنم و نۆك و بەروبوومی هاوینە. بە ڕاستی ماڵێکی زۆر چاکبوون هەموو کات دەرگایان ئاواڵاو سفرەیان ڕاخراو بوو بۆ میوان و پێشمەرگە.

لە کۆتایی ساڵی (١٩٨٦) زۆربەی ماڵەکان لە باوەخۆشێن باریان کرد. حکومەت باوەخۆشێنی کرد بە ناوچەی قەدەغەکراو ئیتر ئەوانەی موچەخۆری دەوڵەت بوون باریان کرد بۆ ژێر دەسەڵاتی حکومەت، چونکە ئەگەر نەڕۆشتنایە حکومەت موچەکەی دەبڕین. بەمەش بەشێکی زۆری گوندەکە باوەخۆشێنیان چۆڵکرد ئیتر خانوی چۆڵ زۆر بوو. حاجی باقی

خانویـەکی کـۆنکرێتی چـاکی هـەبوو دای پێمـان و بـۆ جـاری هەشـتەم لـە مچەکوێرەوە گواسـتمەوە بـۆ باوەخۆشـێن، چونکە ئازوقـە و خواردەمـەنیمان ئاسـانتر دەسـتدەکەوت. ئیتـر منـیش خـۆم سـاز و ئامـادە کـرد بـۆ جەولەیـەکی دیکـەی خـەباتی چـەکداری، دەمزانـی ڕووبەڕووبوونـەوەکانی ئامجارەمـان زۆر سـەخت و دژوار دەبێـت، چونکە بـەعس هەرچی هێـزی مرۆیـی و دارایـی وڵات هەبوو خستبوویە خزمـەتی جەنگـەوە، منـیش مـاڵ و منداڵەکـەم دایە دەست قـەدەر و شـانم دایـەوە بـەر ئـەو شۆڕشـەی کـە هـەردەم ئامـادەبووم خـۆم و خێزانەکەمی لە پێناودا بەخت بکەم.



مام دەروێش　　　　　　کەمال رەوف لالەبرا

## دێوانە و دیوانیە

لەپاش ماوەیکی کەم لە دەستپێکردنەوەی شەڕ لە ڕۆژێکی بەهاری (١٩٨٥)، لە باوەخۆشێن لە نێو سەوزە گیایەکدا دانیشتبووین، چەند ڕۆژێکی کەمیش بوو خەلیلی برازام هاتبوو بۆ پێشمەرگایەتی، برنەوێکی خۆم هەبوو پێمدابوو. ڕۆژەکە ڕۆژێکی خۆش بوو چەند پێشمەرگەیەك دانیشتبووین، هاوڕێیەکی پێشمەرگەمان بە ناوی حەسەن ئاربیجی هەندێ میوانی هەبوو دەگەڕانەوە و ئەویش ڕەوانەی دەکردنەوە، تا دەرەوەی باوەخۆشێن لەگەڵیانا چوو. کاتێکمان زانی حەسەن بە ڕاکردن بەرەو دواوە گەڕایەوە و هاواری کرد فریاکەون هێزەکانی بەعس هات. حەسەن تفەنگی پێنەبوو، بەرەو ماڵ ڕایدەکرد تفەنگەکەی بهێنێت، ئێمەش بەپەلە خۆمان کۆ کردەوە و دامەزراین. کاتێکمان زانی ئیڤا و ناقیلە بەرەو ڕوومان هات. سەرمان لە ڕوداوەکە سوڕمابوو چونکە لە دێکانی پێشتر پێشمەرگەی تێدابووە ئیتر چۆن دەبێت ئەم هێزە بەسەر ئەواندا گەشتبنە لای ئێمە.

بە دەوروبەری دێدا بڵاوبووینەوە و دامەزراین. چاوەڕێمان کرد تا نزیك ببنەوە، کە نزیك بوونەوە لێیان هاتینە دەست و نەمانهێڵا بەرەو پێشەوە بێن، سوپاکەش هەندێ تەقەی کەمیان کرد و بە خێرایی گەڕانەوە. دوو... سێ پێشمەرگەش لە نێو گوندی چەمەرگەدا بوون کە سوپاکەیان بینیبوو دەگەڕێتەوە بەرەو دەربەندیخان تووشی سەرسوڕمان بوویوون و ئاربیجیەکیان پێوە نابوون. لەلایەن ئێمەوە هیچ زیانێکمان نەبوو، بەڵام بەپێی هەواڵەکان کە دواتر زانیمان هێزەکەی بەعس بریندباریان بووە و دوایی بۆمان دەرکەوت کاروانی سوپاکە بەهەڵە هاتبوون چونکە قتعەیەك لە نزیك فولکەی دەربەندیخان بە ئاراستەی کانی سارد لێی نوسرابوو دێوانە، کە

ئیشارەتێکبوو بەرەو گوندی دێوانە، بەڵام سوپاکە قتعەکەیان بە پارێزگای (دیوانیە) خوێندبووەوە، بەڵام سەیرەکە لەوەدابوو هەتا باوەخۆشێن تووشی هیچ هێزێکی پێشمەرگە نەهاتبوون.

## دانانانی ڕەبایەی سەربازی لە قوتەی شێخ سەلام

خەڵکێکی زۆر لە هەوادار و لایەنگرمان هەبوو لە ڕێکخستندا کاریان دەکرد، لە کاتی گفتوگۆدا زۆریان ئاشکرابوون و دەترسان بەر شاڵاوی گرتن و کوشتن ببنەوە، ناچار پەیوەندییان بە هێزی پێشمەرگەوە کرد. هەندێکیان هاتنە لام، لەو کاتەدا جێگری فەرماندەی کەرت بووم. داوام لە کاک حامیدی حاجی غالی کرد کە لەو کاتەدا سەرتیپی تیپی (٥٥)ی قەرەداغ بوو، چەکمان بداتێ بۆ ئەو پێشمەرگانەی کە تازە هاتبوون. لە وەڵامدا گوتی چەکمان نیە. منیش بڕیارمدا لەمەودوا هەر چەکێکمان دەستکەوت ڕادەستی تیپی نەکەم و خۆمان دابەشی بکەین.

یاڵێکی بەرز لە نێوان کانی سارد و چەمەرگە بە ڕوی شاخی بەرانانـدا هەیە، کە یاڵێکی بەرزە، قوتەی شێخ سەلامی پێدەڵێن و شوێنێکی ستراتیژی سەربازییە و حکومەت بە نیاز بوو بیکات بە ڕەبایەی سەربازی و دەوروبەرەکەی تەلبەند بکات و لوغم ڕێژی بکات.

پێش ئەوەی ڕەبایەکە تەواو بکەن کەرتەکەی عەلە ڕەش کە من جێگری بووم، لەو کاتەدا مامۆستا جەلال جێگری تیپی (٥٥)ی قەرەداغ بوو، کاک حامیدی حاجی غالییش سەرتیپ بوو. بڕیارماندا لەگەڵ مەفرەزەیەکی کەرتی چواری تیپی (٥١)ی گەرمیان کە برایم ئەحمەد (برایمە سوور) فەرماندەی کەرت بوو، کە عەلی شەهید محەمەد و عەبدوڵڵا کەریم (نیوە کوڕ) و چەند

پێشمەرگەیەکی تری لەگەڵدا بوو، بە فەرماندەیی مامۆستا جەلال بچینە سەر ڕەبایەکە. پەلاماری ڕەبایەکەمان داو لەپاش بەرگریەکی کەم دەستمان بەسەر ڕبایەکەدا گرت و (٥) سەرباز بە دیل گیرا، (٥) کلاشینکۆف و هاوەنێکی (٦٠) ملم و هەندێ تەقەمەنی و کەل و پەلی سەربازیمان دەستکەوت. خالیدی حاجی حەسەنی برام لە شەڕەکەدا بەشدار بوو پێش ئەو شەڕە تفەنگێکی کلاشینکۆفی بێکەڵکی بە (٩٠٠) دینار کڕیبوو بە پارەیکی کەمتر دامانەوە بە خاوەنەکەی و لەو کلاشینکۆفانەی دەستمان کەوتبوو کلاشینکۆفێکی بەرکەوت. ئەوەی لە یادم مابێت حەسەن ئاربیجی و جەزا محەمەد ناسراو بە جەزا ئاربیجی و عەبدولی حاجی عزیزی برای شەهید باقی، ئازادی عەلە ڕەش، شەهید تەنیا، سەعید حەسەن حەمەخان شمشێرکوڵی بەشدار بوون. ئەوەی شایەنی باسە مامۆستا جەلال زۆر جوامێرانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ سەربازە دیلەکان کرد، کاتێک سەربازەکان بینیان فەرماندەکەی ئێمە بەو شێوەیە لەگەڵیاندا هەڵسوکەوت دەکات زۆر دڵخۆش بوون.

## پێکانی کۆپتەرێک

ماوەیەک بوو مامەڕیشە شەهید بووبوو، بڕیارماندا لە تۆڵەی مامە ڕیشەدا چالاکیەک ئەنجام بدەین و زەبرێک لە دوژمن بوەشێنین. لەگەڵ کەرتی (٦)ی وارماوای تیپی (١٥)ی هەورامان، کە حەمە قاشتی فەرماندەی بوو لەگەڵ کەرتەکەی ڕەوفی یاسە و ئەو کەرتەی کە من فەرماندەی بووم، بڕیارماندا بچینە سەر ڕێگەی سەرەکی دەربەندیخان زەڕایەن لای گوندی بیرکێ، کە ڕۆژانە ناقیلەیێک لە هەشتی بەیانیەوە هەتا دووی دوای نیوەڕۆ لە نزیک جادەی قیر پاسەوانی جادەی دەکرد. بەرنامەمان دانا کە لێی بدەین و بیسوتێنین. ئەو ڕۆژە ناقیلەکە یەک کاتژمێر پێش مەوعیدەکەی خۆی

گەڕایەوە بۆ دەربەندیخان ئێمەش لە شوێنی وەستانی ناقیلەکەدا هەرسێ کەرتەکە دامەزراین و کۆمەڵێ پێشمەرگە چوونە سەر جادەکە و ئۆتۆمبێلیان ڕادەگرت، توانیان کۆمەڵێك جاش و سەرباز بە دیل بگرن. لەو کاتەدا جێب قیادەیەك و دوو پاسی سەربازی هات، لێماندان و پەکیانکەوت و تێکشکان. لە هەمان کاتدا ئیڤایەك هات و درایە بەر دەستڕێژ و نەوەستا، ئەحمەد ئاربیجی قازیفەیەکی پێوەنا و دای لە عارەبانەی ئیڤاکە، بەڵام هەرچۆنێك بوو خۆی دەرباز کرد. لەو کاتەدا کۆپتەرێك بێ ئاگابوو لەوەی شەڕ هەیە زۆر بە نزمی لە دەربەندیخانەوە بۆ سلێمانی دەفڕی، لە هەموو لایەکەوە دامانە بەر دەستڕێژی گوللە و دوکەڵێکی ڕەشی لێ دەرچوو، دیاربوو کۆپتەرەکە پێکرا، ئەوەندەم پێخۆش بوو بە دەنگی بەرز دەستم کرد بە (اللّٰه اکبر). سەربازی ڕەبایەکان گوێیان لێبوو زۆر بە خەستی ئاگربارانی جێگەکەیان کردم، لە دوایدا بیستمانەوە گوتبویان پاسداری ئێرانی لێیانداوین. کۆپتەرەکە لە زەڕایەنی کۆن بە ناچاری نیشبووە و حکومەت بە خێمە داپۆشیبوو و هێزێکی سەبازی کردبووە پاسەوان، تا چاکیانکردەوە.

شایەنی باسە لە کەرتەکەی حەمە قاشتی (عەلی حاجی ئەحمەدی قاشتی و عومەری ئاڵتون و فاتیح حەسەن فەقێ ئەحمەد و حەمە شۆڕش و ڕۆستەم عەلی ڕەسول و ستار ساڵح)، بەشدار بوون. لە کەرتەکەی ڕەوفی یاسە (ئەحمەد ئاربیجی و سدیقی عەلی تۆفیق و شەهید تەنیا و ئەحمەد حەمە سور سەلیم پیرکی و فەلاحی حاجی محەمەد کانی ساردی و عومەر فەقێ جنەیی) بەشدار بوون. لە کەرتەکەی بەندەش (سەعید عەبدولقادر و فتاح مەحمود ناسراو بە شۆڕش و سەید نامیق سۆڵاوایی و ڕەوفی مامەوڵا و خالیدی حاجی حەسەن و سەید محەمەد و ئازاد عەزیز و ئازاد حەمە ڕەشید عەبدوڵڵا و کەمالی حاجی قادر سیارەیی و عوسمان ساڵح پیروەیس و عەبدوڵڵای حاجی مەحمود بیرکێی بەشدار بوون.

بەیانیەکەی حاجی حەسەنی برام هات بۆلامان بۆ مچەکوێر بۆ هەواڵ زانینمان، کە گەڕایەوە بۆ دەربەندیخان حکومەت گرتبووی، هەواڵیشی پێداین کە کۆپتەرەکە لە زەڕایەن کەوتووە.

## شەڕی دەروونیی

بارەگایەکمان لە باوەخۆشێن هەبوو، کە مامۆستا جەلال سەرپەرشتی دەکرد. حکومەت چەندین فەوجی خەفیفە و مەفرەزە خاسەی لە دەربەندیخان کۆکردبووە، جۆرەها چەکی تازە و تۆپی دورهاوێژیان هێنابووە سەربازگەکەی دەربەندیخان و لوولەی تۆپەکانیان ئاڕاستەی قەرەداغ کردبوو. ڕۆژانە لە لایەنگران و دۆستەکانمانەوە هەواڵمان بۆ دەهات کە هێرش دەکرێتە سەرتان. ئێمەش بە ژمارە چەند پێشمەرگەیەکی کەم بووین و بڕیارمان دا کەمینێکی مەحکەم دابنێین. بۆ ئەوەی لە نزیك چەمەرگە بەر لە هێرشەکە بگرین.

شەو چوینە شوێنی مەبەست و سەنگەرمان چاك کرد، شەو زۆر سارد بوو. لە نیوە شەودا ڕوناکی لایتێکمان لە لاشانمانەوە بینی، کە نزیك بوونەوە دەنگمان لێکردن، مامۆستا جەلال و چەند پێشمەرگەیەك بوون کە لە کانی هەنجیرەوە گەڕابوونەوە، چووبوون بۆ پرسەی والی باریکەیی کە لە داستانی دابان هەلاج شەهید بووبوو. کە مامۆستا جەلالمان بینی زۆرمان پێخۆش بوو، وەزعەکەمان بۆ گێڕایەوە، کە پێش خۆر ئاوابوون هەواڵمان بۆ هاتووە حکومەت سەرلەبەیانی سبەینێ هێرش دەکات. مامۆستا جەلال کۆبونەوەیەکی دیکەی پێکردین و هێزەکەی دابەش کردەوە و کۆتا قسەی ئەوە بوو کە نەبێت دوژمن بەسەر لاشەماندا تێپەڕێت و نەیەڵین بستێك بێتە پێشەوە.

دنیا ڕووناك بوویەوە و ئێمە هەر لە سەنگەرەکانماندا مابووین و هیچ جموجوڵێکی سەربازی نەبوو. بەیانییەکەی هەواڵێکی دیکەمان بۆ هات کە حکومەت خۆی کۆ دەکاتەوە و دەبابەکانی جوڵاندوە و جاشێکی زۆریش لە نێو بازاڕەکەدایە و دیارە نیازی جۆرێك لە هێرش و پەلاماریان هەیە. چەندین ڕۆژ لە کەمینا بووین و بەردەوام لە ئامادەباشیدا بووین، بەڵام هێرش هەر نەکرا، دنیاش ئەوەندە سارد بوو هەندێك لە پێشمەرگەکان نەخۆش کەوتن، چونکە بە شەو تا بەیانی نەدەخەوتین. منیش باسی تۆپەکانی حکومەتم بۆ پێشمەرگەکان دەکرد دەمگوت هەرکات تۆپباران هەبوو خۆتان بە زەویدا بدەن ئیتر هیچ مەترسییەکی نیە. دواتر بۆمان دەرکەوت کە حکومەت شەڕی دەروونیمان لەگەڵ دەکات.

بەو بۆنەیەی کە لەو کەمینەدا بە پێشمەرگەکانم گوتبوو لە کاتی تۆپبارانداا خۆتان بدەن بە زەویدا ئیتر هیچ مەترسییەکی نیە، حەز ئەکەم باسی شتێك بکەم. بە بەری هۆمەر قەڵاوە تۆپێکی (١٠٦) ملیمان هەبوو بەسەر سەیارەیەکەوە بوو، تۆپەکە هێندە کاریگەر نەبوو بەڵام زۆر جار بە مەبەستی بەرزکردنەوەی ورەی پێشمەرگە هەمیشە بە پێشمەرگەکانم دەگوت ئەو تۆپەی هۆمەر قەڵا تۆپێکی زۆر کاریگەرە و گەر ڕەسەدێکی لێزانی هەبێت هیچ لە چنگی دەرناچێت. جارێکیان پێشمەرگەیەك گوتی مام دەروێش چۆن تۆپی دوژمن کاریگەری نیەو ئەم تۆپە بچوکەی خۆمان ئەوەنە ترسناکە بەرامبەر دوژمن. منیش بێ دەنگیم هەڵدەبژارد دیاربوو ئەو پێشمەرگەیە ڕاستییەکەی زانیبوو کە من وەسفی تۆپەکەی خۆمان دەکەم تەنها بۆ ورە بەرزکردنەوەیە.

ماوەی چەند مانگێك بوو کرابووم بە فەرماندەی کەرت، بەشێکی کەرتەکە لەگەڵ خۆمدا بۆ پاراستنی هێڵی دەربەندیخان – قەرەداخ مایەوە و

بەشەکەی دیکە چوون بۆ سەرکردایەتی چونکە هێرشی توندی لەسەر بوو.

لەو پێشمەرگانەی لە قەرەداخ مانەوە و ناوەکانیانم لەبیرە ئەمانەبوون:

١ — فاتیحە سوور

٢ — مەحموود مامەلی

٣ — برایم رەسوڵ بانی بی

٤ — سەعید لالۆسەن شمشێرکوڵی

٥ — سەعید تۆفیق مارف

٦ — مستەفا سلێمان سەراوی

٧ — رەئوف عەبدوڵڵا (مەیدان)ی

٨ — عەلی کەریم وەیس (خڕکنی)

٩ — ئەسعەد غوڵام (مەیدان)ی

١٠ — سەید نامیق (مەیدان)ی

١١ — سەید حسەین سەید عەلی (مەیدان)ی

ئەوانەشی بە فەرماندەیی ئەحمەدە ریشە چوون بۆ شەڕی بەرگری لە سەرکردایەتی ئەمانە بوون:

١ - ئەحمەدە ریشە (گەرمیانی)

٢ — خالید حەسەن عەلی

٣ — زمناکۆ رەشید شاوازی

٤ — عەبدول حەمە عەزیز

٥ — شەهید حەیدەر کەریم خەسرەو هۆرێنی

٦ — جەلیل عەلی ئەحمەد (فەقێ جنەیی)

٧ — جەزا محەمەد (جەزا ئاڕ بی جی)

٨ — فاروق ئەحمەد محەمەد (کانی بی)

٩ — ئەسعەد فایەق محەمەد (میرەدێی)

١٠ — تۆفیق شەریف محەمەد

١١ — فەتاح مەحمود عەبدولقادر (شۆڕش)

١٢ — سەعید عەبدولقادر عەلی

١٣ — برایم رەسوڵ (خانەقینی)

هەندێ جاریش بەپێی پێویست بۆ کاروبارەکانی سەرکردایەتی ئەم کەسانە ئاڵوگۆڕیان پێدەکرا

## سەردانیکردنی محەمەدی برام

بەعس جۆرەها ڕێگەی تاقیدەکردەوە کە پێشمەرگە تەسلیم ببێتەوە یان چەك دابنێت. یەکێك لەو ڕێگەیانە ناردنی برا و کەس و کاریان بوو و هەڕەشەی قورسی لێدەکردن کە بڕۆن کەسوکارەکانییان بهێننەوە. لە باوەخۆشێن بووم لە ماڵی باوەشێخی شێخ عەلی، باوەشێخ پێشمەرگەی بەرگری بوو، ماڵێك بوون زۆر خزمەتی پێشمەرگەو میوانیان دەکرد.

محەمەدی برام لە دەربەندیخانەوە هات بۆلام حکومەت گرتبووی و هەڕەشەی لێکردبوو و ناردبووی بەدوای مندا بەڵکو چەك دابنێم و تەسلیم ببمەوە یا هەر هیچ نەبێت چەك دابنێم و لە دێیەکدا دابنیشم. مامۆستا جەلالی شێخ تۆفیقیش دانیشتبوو لەگەڵماندا، زۆر بە توندی لە محەمەدی برام تورەبووم گوتم چەند ساڵە خەبات دەکەم ئێستا تۆ حەز دەکەیت بە سەرشۆڕی بگەڕێمەوە؟ لە وەڵامدا گوتی زۆرم پێ ناخۆشە چەك دابنێیت بەڵام وازم لێ ناهێنن و هەموو کات بانگم دەکەن و عەزێتم دەدەن و منیش

ناچارم بێم. هەرچەند پێشتر بۆچوونی منی دەزانی لەمەڕ داواکەی بەڵام وەك خۆی گوتی بە ناچاری هاتووم، پاش یەکتر بینین و هەواڵپرسی، نانێکمان پێکەوە خوارد و بە دەستی بەتاڵ گەڕایەوە.

لە ڕاستیدا ئەم سیاسەتەی ڕژێم هەندێ جار کەڵکی هەبووە و سەرکەوتوو بووە و هەندێ پێشمەرگە لەژێر گوشاری کەسوکاریاندا وازیان لە پێشمەرگایەتی دەهێنا. لە بەرامبەردا هەزاران پێشمەرگەی دیکەش هەبووە هەموو کەسوکاری خۆی کردووەتە قوربانی ڕێبازەکەی و گوێی بەو جۆرە هەڕەشانە نەداوە.

## کەمینێك لە گوندی باخان

مانگی شەشی ساڵی (١٩٨٥) بوو، کاك ئاوات قارەمانی فەرماندەی تیپی (٥٥) قەرەداغ بوو. لە گوندی ولیانی قەرەداغ کۆبوونەوەیەکی پێ کردین و بەرنامەمان دانا کەمینێك لە گوندی باخان لە نێوان ناحیەی قەرەداغ و دارە ڕەشە دابنێین. حکومەت گوندەکەی ڕووخاندبوو بەڵام چەند خانوویەکی تێدا مابوو. لەو کاتەدا مەلا ئەحمەدی دسکەرە فەرماندەی کەرتی (٤) بوو منیش جێگری بووم. عەبدوڵڵا دسکەرەیی فەرماندەی کەرتی (١) بوو، جەماله سور فەرماندەی کەرتی (٢) بوو. هەر کەرتە و شوێنی خۆی بۆ دیاری کرا.

بەیانییەکی زوو پێش ئەوەی سەربازی ڕەبایەکان بە واجبات دەر بچن، ئێمە چووینە شوێنی دیاریکراو. من و عەلی حسێن و نەجم ناسراو بە (کوێخا) لەسەر گردێك بووین. ڕێگەی سەرەکی گردەکە ڕووتەنی بوو و شوێنی پەناگەی نەبوو، کاروانێکی جەیش و جاش کەوتنە بۆسەکەوە و لە

هەموو لایەکەوە لێماندان و شەڕ گەرم بوو، منیش بەدەم شەڕەوە هەر هاوارم دەکرد و قسەم بە چەکدارەکان دەگوت. عەلی حسەین گوتی مام دەروێش شوێنەکەمان کەشف دەبێت ئەوەندە هاوار مەکە، لە ناکاو فرۆکەی کۆپتەر هاتە سەر مەیدانی شەڕەکە و بە (BKC) تەقەی لێکرا ناچار ئەوەندە بەرز بوویەوە نەیدەتوانی ئامانجەکانی بپێکێت. عەلی حسین لەڕێی (FM)ی ڕادیۆکەیەوە گوێی لە قسەی فڕۆکەوانەکە دەگرت کە لەگەڵ سەروی خۆیدا قسەی دەکرد و دەیگوت گەورەم بەرگریەکی بەهێز هەیە و ناتوانین نزم ببینەوە.

شەڕ درێژەی کێشاو لە کۆتایدا دوژمن زەبری کوشندەی لێ کەوت و (٢٧) چەکدار بە دیل گیرا و دەستکەوتی شەڕەکەش (٣٠) کلاشینکۆف و چەندین مەخزەن و هەزارەها فیشەکی جۆراوجۆر بوو. لەو نەبەردییەدا پێشمەرگەیەك بە ناوی موشیر شەهید بوو پاشتر لە گۆڕستانی زەیۆمەر بە خاکمان سپارد. شەهید موشیر برایەکی دیکەیشی پێشمەرگە بوو بە ناوی موکەڕەم کە ئەویش لە داستانێکی بێ وێنەدا لە نزیك سلێمانی شەهید بوو.

### کۆچی دوایی محەمەدی برام

لە (١٩٨٥/٨/١٠) ماڵمان لە مچەکوێر بوو، هەواڵیان بۆ هێنام کە محەمەدی برام کۆچی دوای کردووە بە ڕاستی زۆر دڵگران بووم، چونکە لەوە ناخۆشتر ئەوە بوو کە نەمتوانی لە پرسەکەیدا ئامادەبم. ناچار لە ماڵی خۆمان پرسەم بۆ دانا و خەڵك و پێشمەرگە هاتن بۆلام.

ڕۆژێك كۆمەڵێك پێشمەرگە هاتن و مامۆستا جەلالیان لەگەڵ بوو، بە پێشمەرگەكانی گوتبوو دوای ئەوەی سەرەخۆشیمان لە مام دەروێش كرد دەچین لە لەنێوان گوندی سیارە و گوندی بیركێ لەسەر شەقامە سەرەكییەكەی سلێمانی — دەربەندیخان بۆسەیەك دادەنێین، بەڵام كەستان ئەم هەواڵە بە مام دەروێش نەدەن با نەزانێت. هاتن و ماوەیەك دانیشتن و سەرەخۆشیان كرد و ڕۆیشتن. یەكێك لە پێشمەرگەكان لێم نزیك بوویە و دەمی نا بە گوێمەوە و بە سرتەوە گوتی دەچین لای بیركێ كەمینێك دادەنێین. لە ماڵ جگە لەوان هیچ میوانێكی دیكەی لێنەبوو بۆیە بەدوای ئەواندا تفەنگەكەم هەڵگرت و دوایانكەوتم، هەرچەند هاوار و تكایان كرد كە پرسەم هەیە و دڵم برینداره، بەڵام سوور بووم لەسەر ئەوەی هەر بەشدار ئەبم و پێمناخۆشە لە ماڵەوە دابنیشم و هاو سەنگەرەكانم لە شەڕدابن.

پێشتر لە ڕێكخستنەكانی ناو شارەوە هەواڵیان بۆ هاتبوو كە ڕۆژانە مەفرەزەیكی جاش لەگەڵ كاروانێكی سەربازیدا لە دەربەندیخانەوە بەرەو سلێمانی دەڕوات. مامۆستا جەلال تاووتوێی هەواڵەكەی كردبوو بڕیاری دابوو مەفرەزەیەك لە كەرتی (٣ و ٤) كە مامۆستا جەلال خۆی سەرپەرشتی دەكردن پێكبهێنێ و پەلاماری ئەو كاروانە بدەن.

بۆ ئەم مەبەستە لە مچەكوێر و ناوتاقەوە دوای عەسر چوینە شوێنی مەبەست و پێشمەرگەكانمان دابەش كرد و نەخشەی شەڕەكەمان دانا. فاتیحە سوور و عومەر بەلۆسۆیمان لەسەر شاخ دانا بۆ ئەوەی ئەگەر ڕەبایەكە پێی زانین ئەوان تەقەی لێبكەن و نەیەڵن سەربازەكان بێنە دەرەوە. شەهید تەنیا و شەهید باقی و شەهید عومەر و ئەحمەد ئاڕبیجی و كوێخا نەجم چوونە نزیكی جادەكە لە بۆسەدا چاوەڕێی هاتنی كاروانەكەمان دەكرد. لەو كاتەدا جێب قیادەیەك كەوتە بۆسەكەوە و لێماندا ئەگەر پەلەمان

نەکردایە و پێنج خولەکی دیکە چاوەڕوانیمان بکردایە و لەو جێبەمان نەدایە کاروانـە سـەربازییە دیاریکراوەکـە دەکەوتـە بۆسـەکەوە. کاتێـك کاروانەکـە گوێیان لە تەقەکان بوو سڵەمینەوە و لە دوورەوە دابەزین و بە شەڕەوە بەرەو ڕوومـان هـاتن. مـاوەی چـەند سـەعاتێك شـەڕ درێـژەی کێشـا و جیـب قیادەکە تێکشـــکاو چـــەند کـــوژراو و برینـــدارێکیان هـــەبوو. ئێمـــەش بـــە بەرنامـــە پاشەکشەمان کرد بەڵام لەو کاتەدا ڕەبایەکان هاوەن بارانیان کـردین و دکتـۆر حـەمزە بـە سـوکی برینـدار بـوو، مـاوەی چـەند کاتـژمێرێك ڕێگـەی سـەرەکی سلەیمانی دەربەندیخان بەهۆی شەڕەکەوە ڕاگیرا، بەهۆی ئـەم ڕێگیرانە لـەو خەڵکـە زۆرەی کـە هاتوچـۆیان لـە نێـوان سـلێمانی و دەربەندیخانـدا دەکـرد، چـالاکییەکەمان دەنگدانەوەیـەکی باشـی بـە خـەڵکیی گەیانـد و هەواڵەکـە بـە خێرایی زۆربەی ناوچەکەی گرتەوە.

### کێشەی زەوی و زار

لــە ناوچــەی ژێــر دەســەڵاتی شۆڕشــدا هــەر کێشــەیەك ڕووی دەدا بــۆ چارەسـەرکردنەکەی ڕووبەربـەڕووی پێشـمەرگە دەکرایـەوە، ئەگـەر کێشـەکە بچوك بوایە هەر لـە سنوری مـەفرەزە و کـەرت و تیپەکانـدا چارەسـەر دەکـرا، بەڵام ئەگەر گەورەتر بوایە ڕووبەڕووی مەڵبەند دەکرایەوە.

کێشـەیەك زەوی و زار لـە نێـوان هـەردوو گونـدی باوەخۆشـێن و ئیمـام قادردا هەبوو، لەبـەر ئـەوەی هەردوو لایان خزمـی یـەك بـوون ماوەیـەك بـوو هـەر چارەسـەر نـەدەکرا و جارویـار لـە نێوانیانـدا گـرژی دروسـت دەبـوو. پیـاو ماقوڵانی هەردوو گوندەکە سکاڵاکەیان هێنایە بارەگاکەمان. بۆ ئەم مەبەستە

لیژنەیەك لە مامۆستا جەلال و عەلە ڕەش و عەلی حسین و بەندە پێكهێنرا و هەردوو لایەنی كێشەكەمان بردە سەر زەویەكە و بە یەكسانی دادوەریمان كردن و سەرلەنوێ زەویەكەمان بە شێوەیەك دابەشكردەوە كە ماف بۆ هەردوولایان گەڕایەوە و ئەو ڕۆژە نانی نیوەڕۆمان لای سكالاكاران خوارد و كێشەكە كۆتایی پێ هات.

هەردوو لای كێشەكە دوو بنەماڵەی دیاری ناوچەكە بوون و زۆر خزمەتی پێشمەرگە و یەكێتیان دەكرد. كاك حەمە سعید لە ئەنفالەكەدا لە گوندی ئیمام قادر تا دوا هەناسە شەڕی كرد و لە گوندەكەی خۆی و لە ماڵی خۆیدا شەهید كرا و دوو برایشی ئەنفال كران. لایەنەكەی دیكەش كاك جەزا عەزیز باوەخۆشێنی بوو كە ئەویش بەر شالاوی ئەنفال كەوت و لە بیابانەكانی نوگرە سەلمان زیندە بەچاڵ كرا.

## دسپلینی پێشمەرگایەتی

من بۆخۆم لە سەرەتای ژیانمەوە كە فامم كردووەتەوە ئەگەر لە ماڵی خۆماندا بووبم یا لە ماڵی خەڵكی دیكەدا هەرگیز لە ڕووی خواردنەوە كێشەم نەبووە و هەرچی خودا دابێتی خواردوومە، بە كوردییەكەی كەسێكی نەوسن نەبووم. كاتێكیش بووم بە پێشمەرگە لە هەر ماڵێك بوومایە وەك ماڵی خۆمان خودا چی دابایە گوێم پێنەدەدا و هەمیش وا هەستم دەكرد بوومەتە ئەركێكی زیاتر بۆ ئەو ماڵانەی كە لە كاتی پێویستدا و بە ناچاری پەنامان بۆ ئەبردن. بۆیە ئەگەر لە دێهاتەكاندا زۆر بمایناینایەتەوە هاوكاری ماڵەكانمان

دەکرد، وەك بان گێڕان و دار وردکردن بۆ سۆبا و هتد... کاتێکیش لە شۆڕشی نوێدا بوومەوە بە پێشمەرگە، کادیرە سیاسییەکانی کۆمەڵە هەمیشە ڕێنوێنی پێشمەرگەیان دەکرد بەتایبەتی ئەوانەی کە تازە دەهاتن بۆ پێشمەرگایەتی، کە دەبێت ئاکار و ڕەوشتیان لەگەڵ خەڵکی گوندەکاندا جوانبێت لەماڵەکاندا هەرچیان بۆ دانان بیخۆن و بەپێی توانا کەمترین ئەرك بخەنە سەر گوندنشینەکان، کاتێك پێخەفی ماڵان دەهێنن پێی دەخەون بە پاکی خاوێنی بۆیان بگێڕنەوە.

من و عەلە ڕەش زۆر توند بووین لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەی کە ئەو پێشنیارانەیان جێبەجێ نەدەکرد، جاری وا هەبوو لەگەڵ پێشمەرگە دەبوو بە کێشەم و لای فەرماندەکان گلەییان لێدەکردم کە مام دەروێش زۆر توندە لەگەڵماندا. لە ڕاستیدا هەموو شۆڕشەکان و هەموو پێشمەرگە قەرزارباری گوندنشینانین کە لە بژێوی ماڵ و منداڵی خۆیانیان دەگرتەوە و دەیاندایە پێشمەرگە.

خاڵێکی دیکە کە دەبووە کێشە بۆ من ئەوەبوو بەردەوام لەگەڵ فەرماندەکانی سەرووی خۆمدا توندبووم و زۆر جار بەرامبەر بیر و بۆچوونەکانی ئەوان تووشی پەرچەکردار دەبوومە و نەدەچوومە ژێر باری فەرمانێکەوە کە بە ڕاستم نەزانیایە. ئەو کاتانەی پێشمەرگەی ئاسایی بووم و کاتێکیش کە بوومەتە فەرماندە هەرگیز بە غەرەز شەخسی مامەڵەم لەگەڵ کەسدا نەکردووەو پێگەی حیزبم بۆ مەرامی خۆم بەکارنەهێناوە، ئەگەر فەرماندەیەکیش بڕیارێکی دابێت زیانی بۆ حیزب و نەتەوە و میللەتەکەم تێدابوویێت جێبەجێم نەکردووە. هەمیشە ڕێزێکی زۆرم لە مامۆستای ئاینی و مزگەوت و شوێنە ئاینیەکان گرتووە. بە شێوەیەك سەیری خۆم و ڕابردووم کردووە کە دڵسۆزترین کەس بم بۆ شۆڕش و خەباتی کوردایەتی. چل و دوو

ساڵ کاری ڕێکخستن و پێشمەرگایەتیم کە دەکاتە زیاتر لە نیوەی تەمەنم لەو پێناوەدا بەڕێم کردووە و وەك گوتم هەرگیز نەچوومەتە ژێر باری هیچ شتێك کە خۆم باوەڕم پێی نەبووبێت، بەڵام لەبەر ئەوەی خەڵکانێکی دیکە بەم نەفەسەی منەوە کاریان نەکردووە بوونەتە مایەی نیگەرانی نێوانمان و زۆر جار لەسەر ئەم هەڵوێستەشم ڕووبەڕووی لێپرسینەوە و لێپێچینەوە بوومەتەوە و ئەم هەڵوێستەم بووەتە ڕێگر لەبەردەم بەرزکردنەوەی پلەی سیاسی و سەربازی و پلەی لێپرسراوێتیم، بەڵام ئەو کات و ئێستاش ویژدان ئاسوودەم کە مێژووی خۆمم بە پاکی ڕاگرتووە و بۆ پلە و پۆست ویژدان و خەباتی چەند ساڵەم نەفرۆشتووە.

بۆ نموونە لە ناوەڕاستی نەوەدەکاندا نزیکەی پەنجا پێشمەرگەم لەگەڵ بووە خەڵکانێك هەبوون دەچوون بازگەی نایاساییان دادەنا و دەبوونە شەریك لەگەڵ ئەو کەسانەی شۆفڵ و کەرەستەی کارگەکانیان ئاودیو دەکرد و پێی دەوڵەمەند دەبوون و دواتر خەباتی چەند ساڵەی خۆیان بە هەدەر داو بوونە بازرگان و تەنها بیریان لە کەڵەکە کردنی سەرمایەکانیان دەکردەوە، بەڵام من بۆ خۆم ئەو ئیشانەم بە ڕاست نەزانیووە و پاراستنی بەرژەوەنییەکانی میللەت و مێژووی کەسێتی خۆم و خێزانەکەمم بەلاوە گرنگتر بووە. لەگەڵ پێشمەرگەکاندا هەندێجار نەگەر ئەرکی پێشمەرگایەتیمان نەبوایە خەریکی کاری کشتوکاڵی و کەسابەت دەبووین. لە سەردەمی پێشمەرگایەتیدا زۆرێك لە فەرماندە و لێپرساوەکانیش دەیانزانی چەندە دڵسۆزی نەتەوە و شۆڕشەکەمم و بە پاکی خەبات دەکەم، بۆیە زۆر گوێیان بە هەڵچوونەکانم نەدەدا و بگرە زۆر جار ئەوان داوای لێبوردنیان لە من دەکرد.

## داستانی چەمەرگە

لە باوەخۆشێن بووین لەو کاتەدا زۆربەی پێشمەرگەکان بانگکرابوون بۆ سەرکردایەتی. لەسەر خواستی فەرماندەی تیپ لەگەڵ مەحمووی مامەلی و چەند پێشمەرگەیەك مابووبووینەوە. کاك محەمەد عەبدولقادر خەڵکی عەلی ئاوای قەرەداخ بوو، زەماوەندی کرد، پێشمەرگەکانی بانگهێشت کردبوو. هەواڵیان هێنا کە حکومەت هێرشی هێناوە و نزیکی چەمەرگە بوونەتەوە، لەگەڵ مەحموودی مامەلی و هەندێك لە پێشمەرگەکانی کەرتی سێ بە ڕاکردن بەرەو پیری شەڕەکە چووین، ئەوەندە کتوپڕ بوو یەکسەر بوو بە شەڕی دەستە و یەخە و جەیش و جاش تێکشکان و هەندێکیان لەنێو ڕەبایە کۆنێکدا گیرسانەوە. کەرتەکەی ڕەوفی یاسە لە دەوروبەری ناوتاق بوون، کە شەڕ دەستیپێکردبوو و گوێیان لە تەقەکان بووە، هاتن بە هانامانەوە سێ پێشمەرگە بە ناوەکانی (شەهید باقی، نامیقە سوور، عەلی حسین) کەوتبوونە بەردەم ڕەبایەی جاشەکانەوە، کە ڕەبایەکە بە بەرزییەکەوە بووە و مەجالیان نەبووە سەر بهێننە دەر. شەهید باقی بە عەلی حسین و نامیقە سوور دەڵێت: من سەڵتم و ئێوە خێزاندارن ئەگەر بشکوژرێم کێشەی خێزان و منداڵم نیە، لەبەر ئەوە خۆم فیدایی دەکەم و بەرەو ڕووی ڕەبایەکە دەچم و ئێوەش بە خەستی گوللەبارانیان بکەن. باقی بە تەنها دەچێتە نێو ڕەبایەکە و جاشەکان ڕادەکەن. ئەو کات پێشمەرگایەتی بەو شێوەیە بوو، پێشمەرگە ئامادەبوو لە پێناو ڕزگارکردنی گیانی هاوڕێکەی گیانی خۆی بەخت بکات. برادەرەکانیان وایان زانیبوو شەهید بوون. کە پێشمەرگەکانی دیکە گەشتنە شەڕەکە شەهید تەنیا گوللە (ئار بی جی)یەکی نابوو بە ناقیلەکەوە و بەری نەکەوتبوو، گوللە (ئار بی جی) دووەمی پێوە نابوو نەتەقیبوو گڕ لە دوای (ئار بی جی)یەکەوە دەرچوو بوو، حەشوەی گوللەکە دڕابوو، ئەوەندە تیپی

پێوەبوو دەرنەچووبوو تەنیا بە دەست کردبووی بە گوللەکەدا و فڕێی دابوو، ئەگەر ئەو کارەی نەکردایە خۆی و هاوڕێکەشی دەکوشت، شەهید تەنیا پێشمەرگەیەکی چاونەترس و ئازا بوو.

شایانی باسە لەم چالاکییەدا هێزی بەرگری ناوچەکە ڕۆڵێکی کارایان هەبوو لەوانە: مەولوودی حاجی عەبدوڵڵا، ئەحمەدە کوردە، سەعیدی حاجی عەلی، باوە شێخی شێخ عەلی لەگەڵ خۆیدا هەندێ فیشەکی زۆریشی هێنابوو بۆ مەیدانی شەڕەکە.

لەگەڵ کاک ئەحمەد مستەفا ناسراو بە (ئەحمەد ئاربیجی) کە خەڵکی هۆرێن بوو، پێشمەرگەیەکی زۆر ئازا و چاونەترس بوو، یەکی ڕوومانەیەکمان هەڵدایە ناو ڕەبابییەکە و چووینە ناویەوە، نەمزانی مەخزەنەکەم فیشەکی تێدانەماوە، کە ویستم تەقە بکەم زانیم گوتم هەتا مەخزەن دەگۆڕم و دێمە دەست چەکداری ناو ڕەبابییەکە دەمکوژن. ناچار کردم بە بەردێکدا و هێرشم کردە سەر چەکدارە بریندارەکە گوتم بجوڵێیتەوە ئەم ڕومانەیەت پێدا تەقێنمەوە، ئەویش وا تێگەیشتبوو بەردەکەی دەستم ڕومانەیە. بە چەکدارە بریندارەکەم گوت چەکەکەتم بدەرێ ناتکوژین، ئەویش لە ترسی گیانی خۆی چەکەکەی دامێ. من هەرگیز لەگەڵ کوشتن و ئازاردانی دیلدا نەبووم بگرە ڕێزیشم لێدەگرتن.

لەو نەبەردییەدا حامیدی برای حەسەن ئاربیجیشمان لەگەڵ بوو، بەرەو ڕووی ئەو دەڕۆیشتم، هەستم بە حاڵەتێکی نائاسایی کرد، بینیم خوێن لەسکمەوە بە ژێر پشتوێنەکەمدا دێتە خوارەوە، کە سەیری برینەکەم کرد ڕیخۆڵەی خۆمم بینی هاتبووە دەر. لەگەڵ حامیددا بە جامانەکەی خۆم برینەکەمان پێچاو و وردە وردە گەڕامەوە. کاک سەلامی کوێخا عەزیز و حاجی عبدوڵڵای هۆرێنی و جەماعەتەکەیان هاتن بە هانامانەوە و یارمەتیان داین.

لەو نەبەردییەدا جگە لە خۆم کە ئەوە پێنجەم جارم بوو لە پێشمەرگایەتیدا بریندار ببم، سێ پێشمەرگەی دیکە بریندار بوون بە ناوەکانی؛ مەحموود عەلی ڕەحمان ناسراو بە (مەحمووی مامەلی)، کە فیشەك بەرسەری کەوتبوو، عومەر عەلی قادر (خەڵکی سەلیم پیرك بوو) لەگەڵ سدیق ساڵح ناسراو بە (سدیق سیاسیی). چوار کلاشینکۆفیشمان دەستکەوت بوو.

هەڤاڵەکانم بۆ خۆشی دەیانگوت مام دەروێش ئەوە چییە هەر بریندار دەبیت و شەهید نابی! دەمگوت کاکە من گوللەبەندم پێوەیە. بەڕای خۆم یەکێ لە هۆکارەکانی بریندار‌بوونم ئەوەبوو لە کاتی شەڕدا حەماسەت دەیگرتم و هاوارم زۆر دەکرد، لێیاندەن، بیانگرن، بیانکوژن. هەرچەند بەم جۆرە هاوارکردنە زۆر لە ورەی پێشمەرگەکانم بەرزدەکردەوە، بەڵام زۆرجاریش حەماسەتی خۆیشم بەرز دەبووەوە و زیاد لە پێویست دەچوومە پێشەوە. لەلایەکی دیکەشەوە لەبەر ئەوەی هاوار هاواری زۆرم دەکرد چاوی دوژمنم زۆر لەسەر بوو.

بۆ تەداوی برینەکەم چوومە گوندی دێوانە، لەوێ ماڵی حەمەجان حامید زۆر خزمەتیان کردم و ڕۆژانە دکتۆر حەمزە تەداوی دەکردم، ڕۆژێکیان ڕۆستەم عەلی ڕەسوڵ سیارەیی پێشمەرگە بوو هات بۆ لام و لە ڕێگادا کەروێشکێکی ڕاو کردبوو بە دیاری بۆی هێنام.

پێش ئەوەی شەڕی چەمەرگە ڕوو بدات لە هەموو کەرتەکان و تیپی (٥٥)ی قەرەداغ هەندێ پێشمەرگە هەڵبژێردران و نێردران بۆ سەرکردایەتی یا بۆ ئەو شوێنانە بوو کە یەکێتی پێویستی پێیان بوو. ئەو پێشمەرگانەی کە نێردران بە فەرماندەیی ئەحمەدە ڕیشە بوو. لە ناوچەکانی دەوروبەری ئێمەوە دووجار نێردران و هەرجارەی چەند مانگێکیان پێچوو. جاری دووەم لە

ئاوه ژێ و کانی توو و سێروان بووبوون که خالید له ئیزگەی دەنگی گەلی کوردستانەوه بیستبووی له گوندی چەمەرگەی قەرەداغ شەڕێکی گەوره ڕوویداوه و چەند پێشمەرگەیەك بریندار بوون، خەمی منی بووه، چونکه دەیزانی له شەڕدا زۆر دەچمه پێشەوه، به پەله دەچێته لای کاك شێخ جەنگی برای بەڕێز مام جەلال، که به جیهازەکەیان هەواڵێکی دەست بکەوێت. شێخ جەنگی کەسێك دەنێرێته لای عەدەد جیهازەکه، دوای چەند خولەکێك بانگی خالید دەکات و دەڵێت چەند پێشمەرگەیەك بریندار بوون که یەکێکیان فەرماندەی کەرتەکەیه ناوی دەروێش ساڵحه. خالید دەڵێت دەروێش ساڵح مامەی منه.

به پێویستی دەزانم چەند وشەیەکی کەم لەسەر ئەم سێ پێشمەرگه قارەمانه بنوسم که پیاوی ڕۆژگاره سەختەکان بوون.

**شەهید باقی:**

باقی حاجی عەزیز خەڵکی گوندی ناوباره بوو، بەداخەوه له ساڵی (١٩٨٧) له گرتنی ناحیەی سەنگاودا شەهید بوو.

**سید نامیق ناسراو به نامیقه سور:**

خەڵکی گوندی سوڵاوایه و پێشمەرگەیەکی چاو نەترس و ئازا بوو بەداخەوه ئێستا نەخۆشه و باری تەندروستی باش نیه.

**عەلی حسین:**

ساڵی (١٩٥٧) له باوه خۆشێن له دایکبووه ساڵی (١٩٧٦) پەیوەندی کردووه به کۆمەڵەی ڕەنجدەرانەوه، پاشان کەشف دەبێت و ناتوانێت قۆناغی ئامادەیی تەواو بکات بۆیه ساڵی (١٩٧٩) دەبێته پێشمەرگه، هەتا ئێستا بێ دابڕان پێشمەرگەیه.

حکومەت دەیزانی خێزانی پێشمەرگە لە ناوچەکەدایە بە هیچ شێوەیەك دەستی نەدەپاراست، ژیانی لە نێو دێدا تەواو سەخت کردبوو، ڕۆژانە تۆپبارانی ناوچەکەی دەکرد. ناچار لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەی کە ماڵمان لە باوەخۆشێن بوو گواستمانەوە بۆ ئەشکەوتی کاریەلی، چونکە تۆپ باران کەمتر دەیگرتەوە. جارێکیان عەلی حسین هاتبوو بۆ باوە خۆشێن کۆبوونەوەی بە خەڵك کردبوو، دوایی هات بۆ ماڵی ئێمە لەو کاتەدا حکومەت چەند تۆپێکی نا بە باوە خۆشێنەوە و گوللە تۆپێك بەر دار توویەك کەوت لە حەوشەکەی ئێمەدا، ئەوەندە چۆلەکەی زۆری کوشتبوو گوتم مەلا عەلی وەرە با ئەم چۆلەکانە سەر ببڕین و بیکەینە قاوەڵتی نانی نیوەڕۆ.

چالاکی پێشمەرگە ڕۆژ بە ڕۆژ لە فراوانیدابوو، دەست بەسەر سەربازگەی گەورە و زنجیرە ڕەبایەدا دەگیرا، پێشمەرگە لە چالاکی پەلاماردانەوە نەخشەی شەڕی گۆڕی بۆ هێرشی بەرەیی فراوانی چەند مانگە. لە نەبەردییەکدا لە (١٩٨٧/٩/٢٩) کە پەلاماری ڕەبایەکانی بورجەکە و دارەڕەش درا، لە شەڕەکەدا زەبرێکی قورس لە دوژمن درا، بەڵام بەداخەوە چەند پێشمەرگەیەکی قارەمان شەهید بوون. لەوانە فەرماندەی لێهاتوو و پێشمەرگەی سەرەتایی سەعیدی حاجی غەریب سێ تەلانی شەهید بوو.

هەر لەو کاتانەدا بوو لایەنەکانی سەر گۆڕەپانی کوردستان ئاشتبوونەوەی گشتیان ڕاگەیاند و لە چالاکییەکی هاوبەشدا پێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتمانی و پارتی دیموکرات و حیزبی سۆسیالست و حیزبی شیوعی لە شەوی (١٩ لەسەر ٢٠ی ١٩٨٧/٤/) سەنتەری ناحیەی قەرەداخ بە تەواوەتی دەستی بەسەردا گیرا. ئەگەر چی ئاشتبوونەوەی لایەنەکان درەنگ بوو، بەڵام ورەیەکی بەخشیە هێزی پێشمەرگەی کوردستان. بۆیە لە (١٩٨٨/٥/٧) بەرەی کوردستانی ڕاگەیەندرا و سەرلەنوێ کاروباری پێشمەرگە دیاری کرایەوە و ئێمە پاراستنی دەروازەی قەرەداغمان لە قوڵی دەربەندیخانەوە پێ

سپێردرا، ئیتر بە زۆری ئەرکمان لەو ناوچەیەدا بوو و کەمتر دەچووین بۆ بەرەکانی دیکە. تا پرۆسەی ئەنفالی بەدناو بە تەواوی قەرەداخ داگیر کرا لەو ناوچەیەدا ماینەوە.




سەعید حاجی عەبدولقادر　　حاجی عەبدوڵڵا هۆرێن　　مام دەروێش



مام دەروێش　　مەحمود مامەلی

## ئەشکەوتی کاریەلی

ماڵ و منداڵم لە باوەخۆشێن بوو. بە هەمان شێوە خێزانێکی زۆری پێشمەرگەی تێدابوو، بەڵام ڕژێم ڕۆژ بە ڕۆژ تۆپ بارانی ناوچەکەی زیاتر دەکرد و ڕۆژانە فرۆکە دەهاتە سەر ئاسمانی ناوچەکە و ماڵ و حاڵمان بە دەست تۆپ بارانەوە زۆر خراپ بووبوو. هەڵکەوتەی گوندەکەش وەهابوو جێگەی خۆ شاردنەوەی خێزانی نەبوو. وای لێهات بەرە بەرە ماڵەکان باریان دەکرد بۆ شارەکان و ئەوانەی مابوونەوە یان ماڵە پێشمەرگە بوون یا پێشمەرگەی بەرگری میللی یا سەربازی ڕاکردوو بوون. ناچار لەبەر گیانی ماڵ و منداڵ بڵاوەمان لێکرد هەر ماڵەو شوێنێکی ئارامتری بۆ خۆی هەڵبژارد. ماڵی ئێمەو ماڵی حاجی عەبدوڵڵای هۆرێنی و میمکە مینا و هاواری کوڕی، لەگەڵ حاجی مەحمود ئەو پیاوەی کە خێزانەکەی ناوی جەمیلە بوو لە باوەخۆشێن بە موشەکی فڕۆکە شەهید بوو، بۆ جاری نۆیەم ماڵمان بردە ئەشکەوتی (کاریەلی) کە نزیکی باوە خۆشێن بوو چونکە لە شوێنێکی پەنادا بوو، تۆپ باران نەیدەگرتەوە.

پایزی (١٩٨٧) لەوێ بوین و کەپرمان لە بەردەم ئەشکەوتەکەدا دروست کردبوو و بە هەر شێوەیەك بوو دەمانگوزەراند، بەڵام کە دنیا ساردی کرد حاجی عەبدوڵڵا باری کرد بۆ گوندی ئاوەسپی و دواتریش ماڵی میکە مینا و حاجی مەحمودیش باریان کرد و بە تەنها ماینەوە. لەگەڵ منداڵەکان بە قوور و بەرد هەرچۆنێك بوو هۆدەیەکی بچووکمان لە بەردەم ئەشکەوتەکدا بۆ دانیشتنی خۆمان دروست کرد، ئەشکەوتەکەشمان بۆ کەلوپەل و زەخیرە بەکاردەهێنا. لە ماڵی ئێمەوە هەتا ڕەبایەکانی حکومەت لە نزیك

دەربەنـدیخان هـیچ ئاوەدانیـەك نـەبوو، بـەڵام گونـدی ئیمـام قـادر لـە تەنیشتمانەوە بوو ئەم ماڵانەی تێدا بوو: سعیدی حاجی عەلی، والی حاجی عەلی، حەمیدی حاجی عەلی، عادلی حاجی حامید، کەریم کەمەر، حەسەن محەمـەد ئـەمین (حەسـەنی ئافتـاو). ئەمانـە پێشـمەرگەی بـەرگری میللـی بوون، کاك حەسەن ماڵەکەی وەکو تەکیە وابوو زۆر خزمەتی پێشمەرگەی دەکرد.

ماڵی ئێمە سەنگەری پێشەوەی پێشمەرگە بوو. کێشەی دار سوتاندنمان هەبوو. شەخسێك هەبوو گەلەگورگیان پێدەگوت داری زۆری هەبوو وشك بووبوو و شکابوونەوە سەر زەوی، لەبەر ئەوەی نزرگە بوو کەس دەستی بۆ نەبردبوو. فتوام داو لەگەڵ منداڵەکان بە هێستر دارەکەمان هێنا و زستانی ساردی ئەو ساڵەمان پێ بەڕێکرد. تا دەهات ئابلۆقەکان لەسەرمان توند دەبوو. ڕۆژێك ئێسترەکەمان بە حەبل و ڕەشۆکەی ملیەوە بەربووبوو، حەبلەکە لە بەردێك ئاڵابوو. لە شاخی گوڵانەوە دەبابەیەك تۆپی پێوە نابوو هەلاهەلای کردبوو. ڕۆژێکی دیکە گوێدرێژەکەمان نەهاتەوە و تەیارە لێیدابوو. ئەو وڵاخانەی کە هەمان بوون منداڵەکان لە شوێنێکی نەدیوی فرۆکە و تۆپ باران دەیانلەوەڕان. وای لێهات بە ئاستەم خواردنمان دەستدەکەوت، چونکە هەرکەس لە شارەکانەوە بەرەو دێهاتەکان بهاتایە و بگیرایە بە پێشمەرگە دەدرایە قەڵەم. ماوەیەکی کەم بوو ماڵی حاجی عەبدوڵڵا باریان کردبوو بۆ ئاوەسپی، هەواڵ هات کچێکی عازەبیان لە کاتی ئاوی هێناندا لە حەوزی ئاوەکەدا خنکاوە. بەڕاستی زۆرمان پێ ناخۆش بوو. حاجی عەبدوڵڵا پێشمەرگەی سەرەتایی هەردوو شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێ بوو. خالیدی کوڕی لە (١٩٨١/٤/١٧) لەگەڵ برایەکی سەلامی کوێخا عەزیز و چەند پێشمەرگەیەکی دیکەدا لە گوندی حاسڵی شارەزوور لە شەڕێکدا

دژی حکومەتی بەعس شەهید بوو. حاجی عەبدوڵڵا لە ئەنفالە بەدناوەکەدا حەیدەر و فاتیحی کوڕی و خێزانەکەی بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتن، لەبەر ئەوەی خێزانەکەی پەککەوتە بوو پاش چەند مانگێك ئازاد کرا. لەدوای ڕاپەڕین ژنی دووەمی هێنا و سوپاس بۆ خودا دوو کوڕ و کچێکی هەیە و حاڵی حازر لە دەربەندیخان دادەنیشێت و تەندروستی زۆر خراپە و لەسەر جێگە کەوتووە. حاجی عەبدوڵڵا دوو موالیدی هەیە (١٩٢٢ و ١٩٢٧) هەرکامیان ڕاست بێت یەکێکە لە پێشمەرگە بە تەمەنەکانی شۆڕشی نوێ.

میمکە مینا لەبەر خاتری هاواری کوڕی ئەو ژیانە زەحمەتەی هەڵبژارد. هاوار پێشمەرگەی بەرگری میللی بوو بەڵام لە ئەنفالەکەدا گیرا و نەگەڕایەوە.

ژیان لە ئەشکەوتی کاریەلی زۆر سەخت و دژوار بوو. ئەرکی پێشمەرگایەتیمان زۆر قورس بووبوو، لەلایەك ئاگات لە دوژمن بێت لە ناکاودا پەلامارمان نەدات، لەلایەکی دیکەوە خەمی ماڵ و منداڵت بێت لە ئەشکەوتدا سەرمایان نەبێت، ئینجا مشوری خواردنیان بخۆ لەو زستانە توشەدا ئازووقەیان بۆ دابین بکەیت، جگە لە مەترسی تۆپ بارانی کۆپتەر و فڕۆکە کە ئەمانە هەموویان خەم بوون و نەبوو مشوری بخۆی. لەوکاتەدا خێزانم کوڕێکی بوو ناومان نا کامەران گوتمان بەڵکو کامەرانی ڕوومان تێبکات و ببێتە ئاشنامان، بەڵام بە پێچەوانەوە دوو هێندە گوزەرانمان خراپتر بوو و کامەران خۆیشی لەبەر نەبوونی و شیر و پێداویستیەکانی منداڵییەکەی نەخۆش کەوت و لە بێ پزیشکیدا گیانی دەرچوو و لە گۆڕستانی باوە خۆشێن بەخاکمان سپارد. جگە لەو خەڵکە کەمەی لە دەوروبەرمان مابوون لەگەڵ پێشمەرگەکانی ناوچەکە کە سەرەخۆشیان لێکردین، کەسێ نەبوو دەستی ناز بەسەر منداڵەکانمدا بهێنێت. هەرچەندە

کامەران تەمەنی زۆر منداڵ بوو کۆچی کرد، بەڵام کە دایکیم دەبینی لەگەڵ منداڵەکان بەو کزۆڵییە و بەو خەم و خەفەت و جەرگ سوتاوی بە سادەترین شێوازی ژیان لە سەدەی بیستەمدا لە هەموو خۆشییەکی ژیان بێبەرین، جەرگم بۆیان دەسووتا، بەڵام ئەم هەموو نەهامەتییە لە خەبات و تێکۆشان نیگەرانی نەکردم و لە گورو تینی پێشمەرگایەتی کەم نەکردمەوە و بەردەوام بووم لە خەبات و تێکۆشان لە پێناو گەل و نیشتماندا. لەنێو ژیانی پێشمەرگە و شۆڕشدا هێندە تراژیدیای خەمناکم دیوە گەر دەیان چیرۆك و رۆمان یا کاری هونەری گەورە یا دەیان فلیمی گەورەیان لەسەر بکرێت لە ئاستی فلیمە ناودارەکانی جیهان نەگاتە بارتەقای تراژیدییان و نەتوانرێ مافی خۆیان پێ بدرێت.

جەرگ سوتانی ئێمە بە کامەرانەوە نەوەستا ساڵی (١٩٩٢) ماڵمان لە ئۆردوگای نەسر بوو، کاتی خۆی ئیڤایەکی سەربازیمان لە شەڕدا گرتبوو، ئیش و کاری بارەگای پێشمەرگایەتیمان پێدەکرد، کوڕێك ناوی فەلاح علی ئەحمد بوو، شۆفێری ئیڤاکە بوو لە هەمان کاتدا پێشمەرگەش بوو. ڕۆژێکیان فەلاح لەوێ نەبوو شۆفێرێکی دیکە لێیخوڕی بوو. لەبەردەم ماڵی خۆماندا بە بەگ دێتە دواوە بێ ئاگابووە لەوەی کە پشتیوانی کوڕم لە دوای ئیڤاکەوە بووە و دەیکات بە ژێرەوە و هەر لەوێدا گیان لەدەست دەدات. بەڕاستی ڕوداوێکی زۆر جەرگبڕ بوو زۆر کاری تێکردین، بەڵام دیارە قەدەری پەروەردگار وەها بووە منداڵێك لە باوەخۆشێن لە ژێر قەسفی تۆپ و فرۆکەدا لە دایکببێ و پاش (٦) ساڵ لە تەمەن بەو جۆرەو بەو شێوەیە بۆ لای پەروەردگار بگەڕێتەوە.



ئەشکەوتی کاریەلی لە باوەخۆشێن



میمکە مینا، دایکی شەهید هاوار          بەهیە کاکەبرا

باوەخۆشێن (٢٠١٩)

## شەڕی زنجیرە هەڵەتەکانی تارمشێر

پایزی ١٩٨٧ بووماڵمان لە ئەشکەوتی کاریەلی بوو. دوژمن بە سوپایەکی بێ شومارەوە لە کانی ساردەوە هێرشی هێنا، بەڵام پێش ئەوە هەواڵمان هەبوو دوژمن خەریکی خۆکۆکردنەوەیە و نیازی شتێکی هەیە بۆیە هێزێکی زۆری هێناوەتە سەربازگەی دەربەندیخان. لەو کاتەدا زۆرێك لە پێشمەرگەکانی مەڵبەندی یەك چووبوون بۆ شەڕی سەرکردایەتی و پێشمەرگەیەکی کەم لە ناوچەکەدا مابوون و زۆرێکیشیان پێشمەرگەی هێزی بەرگری میللی بوون و چەکی سوکیان پێبوو.

دوژمن بە دەبابە و هەموو جۆرە چەکێکەوە بەرەو ڕووی سەنگەرەکانمان پێشڕەوی دەکرد. ئەچوونە هەر گوندێك ئاگریان پێوە دەنا و تەختیان دەکرد. ئاگامان لێبوو ئاگریان نا بە چەمەرگەوە، دوکەڵی سووتاندنی ماڵەکان هێندە بەرز بووبوویەوە بەرەو ڕوی ئێمە دەهات. لە زنجیرە هەڵەتەکانی تارمشێردا دامەزراین، دوژمن تۆپبارانێکی خەستی تارمشێری کرد. بە برادەرەکانم گوت خۆتان قایم بکەن و تەقە مەکەن و تۆزێ لە شاخەکە وەرنە خوارەوە تا تۆپ باران تەواو دەبێت، چونکە هەتا تۆپ باران بکات هێرش ناکات. هەموو پێشمەرگەکان لە شوێنی قایمدا خۆمان مەڵاس دا، کاتێك تۆپ باران وەستا گوتم با بچینەوە شوێنەکانی خۆمان. پێش ئەوەی شەڕەکە ڕوو بدات، چوار پێشمەرگەم نارد بۆ گردێکی بەرامبەری خۆمان، بێ ئاگا بووم کە پێشمەرگەکان فریا نەکەوتبوون بگەنە جێگەکەیان، کاتێکم زانی دەبابە بە بەردەممانندا ڕەت بوو. دوو گوللەی (ئار بی جی)یم پێوە نان، دەبابەکان گەڕانەوە، بەخێرایی بەسەر گردەکەدا هەڵگەڕام سەیرم کرد سەربازەکانیش بۆ هەمان گرد سەردەکەون، لێیان هاتینە دەست و لێمان دان و تێکمان شکاندن. وەك پیشەی هاوارکردنی خۆم هەر هاوارم دەکرد دەست بە فیشەکەوە بگرن، لەو کاتەدا تالیمی ئەولکەریمە سور بریندار بوو.

بە دەنگی تەقەو تۆپ باران پێشمەرگەکانی ئەو دەڤەرەی بەئاگا هێنابوو هەریەکەیان بەخێرایی بەرەوە شوێنی شەڕەکە بەڕێکەوتبوون. ئەحمەدە کوردە ئەوەندە بە پەلە هاتبوو تاقمەکەی کردبووە ملی و تورەکەیە فیشەکیشی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو. کاك (حەمە قاشتی)یش جێگری تیپی (٥٥)ی قەرەداغ بوو لەو کاتەدا بریندار بوو، بەڵام بە سواری هێسترێکەوە و بەو برینداریەش هات بە هانامانەوە و هەر لە خەمی شەڕکەدا بوو. هەر لەو کاتەدا مام وریا دەلۆیی کە خەڵکی سەرقەڵا بوو لەگەڵ ستاری مام ساڵح و عەلی حسین و عەتای حاجی ئەحمد و دلێر کەرکوکی هاتن بە هانامانەوە و (بی کەی سی) و (ئار بی جی)یان پێبوو کە لەو کاتەدا هاوکارییەکی باش بوو بۆ ورەی ئێمە. دوژمن لە شکاندا بوو وازمان لێنەهێنان و دوایانکەوتین.

لە کاتی شەڕەکەدا چەند گوللە هاوەنێك دەیدا بە نزیك ڕەبایەی سەربازەکاندا گوتم دیارە حکومەت هێندە شپرزە بووە، لێی گۆڕاوە و هاوەن بە خۆیانەوە دەنێت. لە دوایدا بۆم دەرکەوت هاوەنەکان هی پێشمەرگەکانی بزوتنەوەی ئیسلامییە کە لەسەر شاخەکانی پشتمانەوە بارەگایان هەبوو، ئەوانن بۆ پشتیوانی ئێمە هاوەن بە هێزەکانی دوژمنەوە دەنێن. بە هەمان شێوە برادەرانی حیزبی شیوعیش بە فەرماندەیی مام ئەسکەندەر لە چەمی دێوانەوە هاتن بۆ یارمەتیمان. کەرتێکی تیپی (٥٣)ی شێروانەش، برایمە سوریان لەگەڵ بوو لە کەلی پەیکولی بوون کە زانیبوویان شەڕە بە پەلە هاتبوون بۆ یارمەتیمان و لە چەمەرگە یەکمان گرت و دوژمنمان تا نزیك ڕەبایەکانی کانی سارد ڕاونا. لە شەڕەکەدا کۆمەڵێ سەرباز کوژران، بەڵام دوژمن کەسی نەنارد بۆ جەنازەکانیان، چونکە لە شەڕەکانی پێشوتردا گەر سەربازێ بکوژرایە دوژمن خەڵکی مەدنی دەنارد بۆ جەنازەکانیان.

کاك جەمیل هەورامی لەو کاتەدا سەرتیپ بوو، هات بۆ لامان و زۆر خۆشحاڵی خۆی دەربڕی کە بەو هێزە کەمەوە توانیومانە دوژمن بەو شێوەیە

تێکبشـکێنین و زیـانێکی گیـان و مـاددی زۆریـان لـێ بـدەین و دەسکەوتیشـمان هەبێت. کاك جەمیل هەورامی و پێشمەرگەکانی لە ماڵی ئێمە نانیان خوارد و کلاشینکۆفێکی بـە دیـاری دا بـە عـەلی کـوڕم. کـاك جـەمیل کـە ماڵمـانی بـەو شێوەیە بینی لە نێو ئەشکەوتدایە و جێگەو ڕێگەمان زۆر ناڕەحەتە گوتی کە گەڕامەوە بۆ مەڵبەند هەندێ ئازوقەتان بۆ دەنێرم. گوتم کەم و کورتیمان نیە و وەزعمـان باشـە، بـە داخـەوە لـەو شـەڕە گەورەیـەدا پێشـمەرگەیەك بـە نـاوی (والی ڕۆستەم) کە خەڵکی گوندی دێوانە بوو شەهید بوو.

ئـەو پێشـمەرگە و ئـەو کەسانەی هێـزی بـەرگریی بـوون، کـە لـەو شـەڕەدا بەشدار بوون و ناویانم لە یادە، ئەمانەی خوارەوە بوون:

١ – حاجی عەبدوڵڵا هۆرێن

٢ – حسێن دێوانەیی (پێشمەرگەی حیزبی شیوعی بوو)

٣ – کامەرانی ئەسکەندەر (پێشمەرگەی حیزبی شیوعی بوو)

٤ – ئەحمەد کوردە باوەخۆشێنی

٥ – مەولود حاجی عەبدوڵڵا باوەخۆشێنی

٦ – سەعید حاجی عەبدوڵڵا قادر

٧ – حەمە جان دێوانەیی

٨ – جەزا عەزیز (باوەخۆشێنی)

٩ – مەحمود علی (مەحمودی میمکە نەجە)

١٠ – ڕەجەب حەمەئەمین باوەخۆشێنی

١١ – باوەشێخی شێخ عەلی

١٢ – ساڵحی ئەولکەریمە سور

١٣ – تالیمی ئەولکەریمە سور

١٤ – حەسەنی ئافتاو چەمەرگەیی

١٥ – عادلی حاجی حامید چەمەرگەیی

١٦ – محەمەدی حاجی عەلی ئیمام قادری، ساڵی (١٩٨٨) ئەنفال كرا

١٧ – والی حاجی عەلی

١٨ – كاوە سۆڵەیی

١٩ – سەلاح حامید

٢٠ – محەمەد حاجی ئەحمەد كۆڵۆشی

٢١ – محەمەد عەبدوڵڵا سەمین (كانی ساردی)

٢٢– تالیم ساڵح رەحیم باوەخۆشێنی



ستارساڵح كونەقە



عەبدولقادر حاجی محەمەد گوڵانی (ئەسكەندەر)



مام وریادەلۆیی سەرقەڵایی

## شەڕی دووداره

لـە شـەوی (٢٤ لەسـەر ٢٥ی/١٩٨٧/٧) بـە بەشـداری هـەموو تیپـەکانی مەڵبەندی یەك بەرنامەیەك دانرا، کە پەلاماری سەربازگەی دووداره لەسەر جادەی دەربەنـدیخان زەڕایەن لـە نێوان گونـدی چنارە و میرەدێدایـە بـدرێت. لەو کاتەدا دێهاتەکانی ئەو ناوە هەمووی بارکرابوو بۆ ئۆردوگای نەسر، تەنها میرەدێ مابووەوە کە خەڵکی دێهاتەکان بە کاتی لێی مابوونەوە.

پێش ئەوەی بگەینە شوێنی مەبەست کاك سەلامی کوێخا عەزیز یەکێك بــوو لــە فەرمانــدە ئازاکــان، مــار پێــوەی دا و نــەیتوانی لەگەڵمانــدا بێــت و گەڕایەوە. بە فەرماندەکانم گوت ئەو سەربازگەیە بە چەندین ڕەبایەی قایم دەورە دراوە و ڕەبایەکانیش بـە چەندین ئەڵقەی تـەلی دڕکاوی و مـین دەورە دراوە. هەڵکەوتەی ڕەبایەکانیش یاڵن و ڕووتن و گرتنی ڕەبایەکان ئاسان نییە و زۆر ئەستەمە. لەبـەر ئـەوەی هـیچ هەماهەنگیـەکمان لەگـەڵ کەسانی نێـو ڕەبایەکان یا سەربازگەکەدا نیە، هەرکەسێك پەلاماری ئەو ڕەبایانە بدا وەك ئەوە وایـە خـۆی بکـات بـە کۆشـکی کۆمـاری لـە بەغدا و بیـەوێ بیتەقێنێتـەوە. گوتیــان مــادام وایــە مــام دەروێــش تــۆ لەگــەڵ ســاڵحی گۆڕئەســپی و پێشــمەرگەکانتان بچــنە نێــوان گونــدی ســیارە و چــنارە، لەســـەر ڕێگــەی ســـەرەکییەوە هـــەر هێزێـــك لای دەربەندیخانـــەوە بـــە هانـــای ســـەربازگەی دووداره‌وه هات ڕێگەی لێبگرن و لێیدەن.

لــە کــاژێری ســفردا شــەڕ دەســتی پێکــرد و پــەلاماری ســەربازگەکە و ڕەبایــەکان درا. بــەڵام یــەك ڕەبایــەش نــەگیرا و (١١) پێشــمەرگەی قارەمــان شەهید بـوون و چەند پێشمەرگەیەکی دیکەیش برینـدار بـوون. لـە مـیرەدێش ئافرەتێـك بـەناوی ئەمنـە مـەحمود بیرکێـی کـە خێزانـی شـێخ محیـەدینی

عازەبانی بوو، هاوکاری پێشمەرگە بریندارەکانی کردبوو ئەویش شەهید کرا. حاجی فایەق مامە عەزە زۆر بە سەختی بریندار بوو و بە هیچ شێوەیەک نەیدەتوانی خۆی دەرباز بکات، بەڵام کامەران ئەحمەد قادر سیارەیی پێشمەرگە بوو لە کەرتی حەمە قاشتی جێی نەهێشتبوو زۆر بە زەحمەت توانیبووی دەری بکات. تەرمی پێشمەرگە شەهیدەکانیش دەست دوژمن کەوت و بردنیان بۆ دەربەندیخان و لەوێ گۆڕ ون کران.

پێشمەرگە شەهیدەکان:

١ – حارس مارف ڕەسوڵ

٢ – ئەحمد حەسن مەعروف

٣ – فاتیح حەسەن فەقێ ئەحمد میرەدێیی

٤ – جەبار قادر ڕەسوڵ ئاوەسپی

٥ – عەلوان جەلال عەبدوڵڵا سەنگاوی

٦ – دارا حەمە ڕەشید ناوخاس چەموو ژاڵەیی باوکی هەژار

٧ – والی محەمەد عەبدوڵڵا

٨ – عوسمان حاجی عەزیز چەلەبی برای (عەلی چەلەبی)

٩ – حەمە نەزیف حەمە کەریم (نیازی هەورامی)

١٠ – ئەحمەد شێخ حسەین بەلەکجاڕی

١١ – ئومێد محەمەد ئەحمەد

پێشمەرگە بریندارەکان لەوانەی ناوەکانیانم لەیاد ماوە ئەمانەبوون:

١ – مەحمود عزیز مەحمود (مەحمودی مامە عەزە)

٢ – فایەق عەزیز مەحمود (حاجی فایەق)

٣ – سدیق حەمە فەرج فەتاح (حەمە شۆڕش)

٤ – ئاوات تریفەیی

٥ – هادی مەلا حامید کانی ساردی

٦ – ستار دێوانەیی

٧ – سەلام کانی ساردی

٨ – بەکر عەلیاوایی

٩ – محەمەد عەبدوڵڵا سەمین کانی ساردی

١٠ – شەهاب فەتاح سەمین کانی ساردی

١١ – عابید فەقێ جنەیی

١٢ – ئەنوەر کانی ساردی برای حەسەن ئاربیجی

١٣ – عەتا حاجی حەمەمین جافەرانی

١٤ – سەلام کەرکوکی (دلاوەر)

١٥ – جەمال حاجی قادر

١٦ — ئەحمەد حاجی عەزیز بیشتەیی

## شەڕی یەکلاکەرەوە

دوژمن لە هەموو لایەکەوە هێرشی دەهێنا و هەموو جۆرە چەکێکی بەکار دەهێنا، بە چەکی کیمیاویشەوە، حکومەت هێزێکی گەورەی لە دەوروبەری بنکەو بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتی کۆکردەوە و هێرشێکی بەربڵاوی دەستپێکرد. لە بەرامبەردا یەکێتی نیشتمانیش بەرەنگاربوونەی پەلامارەکەی ڕژێم لە هەموو ناوچەکانەوە پێشمەرگەیان ڕەوانەی سەرکردایەتی کرد. تیپی پەنجاو پێنجی قەرەداغیش هێزێکی تۆکمەی نارد. دوژمن بڕیاری دابوو بە هەر نرخێك بێت سەرکردایەتی بگرێت. ئێرانیش هێزێکی گەورەی هێنابوویە سەر سنووری عێراق لە دەوروبەری هەڵەبجەو هەورامان. یەکێتیش بۆ دەرباز بوون لەو پەستانە سەربازییەی کە بۆ سەر سەرکردایەتییەکەی کراوە ناچار بەرەیەکی دیکەی لەگەڵ ئێران لە هەڵەبجەوە کردەوە و سەرەنجام ئێران پێشڕەوییەکی زۆری کرد و توانی هەموو سنووری هەڵەبجەی تا زەڵم داگیر بکات و لە بەرامبەردا هێزەکانی بەعس لە (١٩٨٨/٣/١٦) بە گازی ژەهراوی کیمیابارانی هەڵەبجەیان کرد.

(١٩٨٨/٣/٢٢) لە دەربەندیخانەوە بە ڕاجیمە کە موشەکەکانی هەڵگری چەکی کیمایی بوون گوندی سێوسێنانی کیمایی باران کرد. خەڵکی ناوچەکەش بۆ خۆپاراستن لەم چەکە ترسناکە هیچ شارەزاییەکی نەبوو، پێشمەرگەش هیچ کەلوپەلێکی دژە کیمایی نەبوو، لە ئەنجامدا چەندین هاوڵاتی و پێشمەرگە شەهید و بریندار بوون و دکتۆرەکانی مەڵبەند بەو کەمە دەرمانەی کە هەیانبوو چارەسەری بریندارەکانیان کرد.

دوابەدوای هێرشە کیمیایەکە لە قوڵی دەربەندیخانەوە هێرشی پیادەی دەستپێکرد. پەلاماری ئەمجارە جیاواز بوو لە جارەکانی دیکە ڕووی دەکردە هەر دێیەك لەگەڵ زەوییەکەیدا یەکسانی دەکرد و دەیسوتاند. جیاواز لە شەڕەکانی پێشوو، کە شەڕ دەکرا و شەو دادەهات هێزەکە دەگەڕایەوە، بەڵام

ئەمجارە بە شەو لە هەمان جێگە دەمایەوە و زیاتر خۆی قایم دەکرد و تۆپ بارانی پێشەوەی خۆی دەکرد و بۆ ڕۆژی دواتر سەر لە نوێ هێرشی دەستپێدەکردەوە.

هێرشەکەی بۆ سەر قەرەداغ لە هەموو قۆڵەکانەوە بوو. لە دەربەندیخانەوە بەرەو شاخی زەردە، لە زەڕایەنەوە بەرەو ئاوە کەڵە، لە دارە ڕەشیشەوە بەجۆرێك هێرشەکانی بەرفراوان کردبوو، پێشمەرگەی بەرەیەك نەیدەتوانی بە هانای بەرەیەکی دیکەی هاوسەنگەرەکانیەوە بچێت، وەك پێشتر باسم کرد زۆرێك لە پێشمەرگەکان ڕەوانەی هەڵەبجە و سەرکردایەتی کرابوون. یەکێتی نیشتمانی و بەرەی کوردستانی لەگەڵ سوپای ئێران هەماهەنگیان کردبوو کە هێرش بکەن و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە فراوانتر بکەن، بەڵام سوپای ئێران دوای بەدیهانی ئامانجەکەی خۆی کاردانەوەیەکی ئەوتۆی نەبوو و پێشمەرگە بە تەنها لە گۆڕەپانەکەدا مایەوە.

من بۆ خۆم هیچ ئومێدێکم بە سوپای بێگانە نەبوو دەمزانی بارمان زیاتر قورس دەکەن، ئێران مەرامێکی تری هەبوو، زۆر شەڕ کرا لەگەڵ ئێرانیەکان زۆربەی سەرکەوتنەکان پێشمەرگەکانی یەکێتی تۆماری دەکرد، کەچی لە هەواڵەکانی ئێران کە دەخوێنرایەوە باسی پێشمەرگە نەدەکرا، یان زۆر بە لاوازی دەکرا. چەند ڕۆژێك لەبەردەم سوپای عێراق بەرگریمان کرد، بەڵام هەواڵمان بۆ هات کە سوپای عێراق لە قۆڵی شارەزوور و زەڕایەنەوە هاتبوونە سەر شاخی سۆڵە و ئاوە کەڵە.

لەو کاتەدا سوپا لە دەربەندیخانەوە هێرشی دەهێنا، پێشمەرگەکانی حیزبی شیوعیش بەشداربوون و کوڕێکی مام ئەسکەندەر بەناوی کامەران شەهید بوو. مام ئەسکەندەر فەرماندەی هێزەکەی شیوعی بوو. حەمە لەتیفی مەلا حەسەنی کانی ساردی لە هەمان شەڕدا بە سەختی بریندار بوو. دیاربوو دوژمن بڕیاریدابوو بە هەر نرخێك بێت ناوچەکە بگرێت، چونکە

زۆربەی زۆری هێزەکانی بەرەکانی شەڕی عێراق - ئێرانی گێڕابوویەوە بۆ شەڕی پێشمەرگە.

لەو کاتەدا سەردانێکی کاك عومەر فەتاحم کرد لە مەڵبەندی یەك، تا لەسەر شێوازی بەرگری قسە بکەین. پاش گفتوگۆ کردن بۆچوونی من وابوو بەو شێوەیە بەرگری ناکرێت و خەڵك و پێشمەرگەیەکی زۆر تێدادەچێت و ئێران نایەت بە هانامانەوە. پێویستە بگوترێت لەو کاتەدا ئێران لەبەرەکانی شەڕەوە جموجۆڵێکی ئەوتۆی نەبوو، وەك بڵێیت هەردوو لا ڕێکەوتنییان کردبێت بۆ نەهێشتنی پێشمەرگە. گفتوگۆکەم لەگەڵ کاك عومەردا توندتر بوو گوتم کاك عومەر تۆ ئەندازیاری ڕێگەوبانیت منیش ئەندازیاری شەڕ. کاك عومە زۆر تووڕە بوو بۆیە کاك عومەر غەریب زانی ڕەوشی گفتوگۆیەکە بەرەو خراپی دەڕوات، کۆتایی بە گفتوگۆکەمان هێنا، ئەگەر ڕەوشەکە نالەبار نەبوایە بە دڵنیاییەوە سزا دەدرام.

کاتی سەردانیکردنم بۆ لای کاك عومەر فەتاح، عالیەی مەلا غەفوورم بینی کە خێزانی حەمە لەتیف بوو، ئەحواڵی حەمە لەتیفم پرسی گوتی تەندروستی زۆر خراپە. بەداخەوە پاشتر عالیە خان بەر شاڵاوی ئەنفال کەوت.

پاش بەجێهێشتنی کاك عومەر فەتاح کافیە خانی خێزانیم بینی گوتی مام دەروێش خەیاڵت چیە؟ گوتم کافیە خان بە هیچ شێوەیەك نیازم نیە بچمە ئێران، ئەگەر تەندروستیم باش بێت و تەمەن ڕێگەم بدات منداڵەکانم دەنێرمەوە بۆ نەسر و بە پارتیزانی دەمێنمەوە. گوتی مام دەروێش منیش بەرگی خاکی دەپۆشم و لەگەڵتان دەبم. گوتم کافیە خان جیفارا دەڵێت لە شەڕی پارتیزانیدا نابێت ئافرەتت لەگەڵ بێت.

لە قۆڵەکانی دیکەوە پێشمەرگە بەرەو مەڵبەند دەهاتن. لەو کاتەدا کاك عەدنانی حەمەی مینا بە خۆی و هێزێکەوە کە (٢٦) پێشمەرگە بوون هاتن، کە زۆربەی هێزەکەی هێزی بەرگری بوون. گوتم کاك عەدنان ئێمە چەند

ڕۆژێکە بەرگری دەکەین و دیارە حکومەت بڕیاری داوە نەگەڕێتەوە و لە هەموو شوێنێکەوە پێشڕەوی کردووە و هێزەکانی ڕژێم سەر شاخی سۆڵە و شاخی زەردە و ئاوەکەڵەی گرتووە، بەڕای من بەرگری کەڵکێکی ئەوتۆی نابێت. کاک عەدنان زۆر ورەی بەرز بوو زۆریش ئینکاری کرد و لە قوڵی مچە کوێرەوە پەلاماری هێزەکەی ڕژێمی دا سەرەنجامی هێرشەکە شەهیدێك و دوو برینداربوو جگە لە برینداربوونی خۆی. شەهیدەکە ناوی تۆفیق عەبدوڵلا بوو خەڵکی گوندی گامەخەل بوو لە گەرمیان. کەمالی مام ڕەوف مچە کوێری و جەلالی برای و عەلی حاجی عەبدوڵلای ئەحمەد و باوە شێخی شێخ عەلی بە هێسترێك تەرمی شەهیدەکە و بریندارەکانیان برد بۆ گوندی دوکان لە قەرەداغ، تا لەوێوە ڕەوانەی گەرمیانی بکەن و بریندارەکانیش چارەسەر بکرێن. ناچار کاک عەدنان هێزەکەی بەرەو مەڵبەند کشاندەوە.



راوەستاوەکان لەلای راستەوە: برایم ، سەرکەوت ، نەناسراو ، بۆتان ، جوتیار
دانیشتووەکان لەلای راستەوە: مام دەروێش ، برایم رەسوڵ ، دکتۆر ناسح فایەق ، عوسمان کەلاری
کۆتایی مانگی (٣) ساڵی ١٩٨٨ . قۆپی قەرەداخ – نەخۆشخانەی مەڵبەندی یەك

بارودۆخ تا دەهات سەختر دەبوو، تۆپ باران و کۆپتەر بڕانی نەبوو. بە چەکی کیمیاوی لە گوندی سێوسێنان درا و چەندین هاوڵاتی شەهید و بریندار بوون، ناچار ماڵ و منداڵەکانم هێنایە مچەکوێری ئەمدیوو بەردەم سۆڵە، لەو کاتەدا حەوت منداڵم هەبوو چوار کوڕ و سێ کچ دایکیان نەخۆش بوو، دۆخی ناوچەکەش بەتەواوەتی تێکچووبوو. بەرامبەر بە چەکی کیمیاوی هیچ ئامەدەکارییەك نەکرابوو زۆربەی سووپای عێراق بە هەموو پێداویستییەکانە هێنرابوونە بەرەکانی شەڕ دژی پێشمەرگە. نابەرامبەرییەکی زۆر لەنێوان هێزی پێشمەرگە و سوپای عێراقدا هەبوو، هەم لەڕووی مرۆیی و هەم لەڕووی چەك و چۆڵ و لۆجستییەوە. ڕۆژ بە ڕۆژ هێزی بەرگریکردن لاواز دەبوو، لە کاتی گرتنی ناحیەی قەرەداغدا چەکی قورس و دوو ناقیلە بە ساغی گیرابوو لە مەڵبەند دانرابوون لەلایەن پێشمەرگەوە تەقێندرایەوە. سوپای عێراق چەندین بەرەی شەڕ کردەوە لە هەموو لایەکەوە ئاگرباران بوو، مەڵبەندیش چارەسەرێکی ئەوتۆی بۆ دۆخەکە پێنەبوو، بۆ هەرکوێ دەچوویت مەترسیدار بوو. خەڵکی مەدەنی بەرەو ناوچەکانی ژێردەستی حکومەت دەگەڕانەوە. لە سەرەتادا حکومەت هەندێك نەرمییان نواند و ڕێگەیان بۆ خێزانەکان کردەوە بچنە نێو شارەکانەوە و خەڵکی ئۆردوگا و شارەکانیش بەدەم کەسوکاری خۆییانەوە دەهات.

چەند ڕۆژێك پێش دەستپێکردنی پرۆسەی گرتنی خەڵکی مەدەنی، لەگەڵ خێزانەکانی گوندی مچەکوێر و باوەخۆشێندا منداڵەکانم ناردەوە بۆ ئۆردوگای نەسر. بە ڕێگەی ئاوەکەڵە - دسکەرەدا ڕۆشتبوون. لای دسکەرە حکومەت سەیتەرەی دانابوو، هاوار حەمە کەریم قادر (هاواری میمکە مینا)

کوڕێکی گەنج خەڵکی باوەخۆشێن بوو گیراو بێسەر و شوێن کرا. خۆیشم لە ناوچەکەی خۆماندا مامەوە. کاتێك بە بڕیاری مەڵبەند ناوچەکە بە تەواوەتی چۆڵکرا، نەمدەویست جارێکی دیکە خۆم و منداڵەکانم ئاوارەی ئۆردوگاکانی ئێران ببین، هەم تەمەنم و هەم باری تەندروستیم یارمەتییان نەدەدام بەردەوام بم، ناچار گەڕامەوە بۆ ئۆردوگای نەسر. زۆر ناڕەحەت بووم دەروونم زوخاوی لێ دەتکا بیرم دەکردەوە لە پاش نۆ ساڵ بەبێ دابڕان پێشمەرگایەتی و سێ جار برینداری و هەشت جار بارکردن لە شۆڕشی نوێدا، ئێستا بە ناچاری لە ئۆردوگای نەسر دانیشتووم.

## ژیان لە ئۆردوگای نەسر

لە دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول حکومەتی بەعس بە خەیاڵیدا نەدەهات جارێکی دیکە شۆڕش و پێشمەرگە دەست بە خەبات بکاتەوە، بەڵام لە دوای هەرەس ئەوەندەی پێنەچوو چەخماخەی هەڵگیرسانەوەی شۆڕش بە ڕابەرایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لێدرا. ساڵی (١٩٧٦) یەکەم دەستەی چەکدار ڕووی لە شاخەکان کرد و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گەشەی دەکرد و کەوتنە چالاکی سەربازی.

حکومەتی بەعس ساڵی (١٩٧٨) بە بیانووی پشتێنەی ئەمنییەوە دێهاتەکانی سەر سنوری ڕاگواست. ژمارەی ئەو گوندانەی بارکران و بەر ڕاگواستن کەوتن ژمارەیان (١٤٥٢) گوند بوو[١]، کە زۆربەی ئەو دێهاتانە لانکەی مەفرەزە سەرەتاییەکان بوون. هەموو دێهاتەکانی سەر سنوری

---

[١] لە شارەزوورەوە بۆ ناسریە. نووسینی سەرحەد یونس.

ڕووخاند و کانی و ئاوەکانیشی تەقاندەوە. دێهاتەکانی تاوگۆزی و ناوچەی بەمۆی هێنایەی زەڕایەن و خانووی سادەی بۆ دروست کردن و هەرچەند گوندێکی لە نزیکترین ناحیە یان قەزا کۆکردەوە و لە ئۆردوگایەکدا جێنشینی کردن.

بۆ جاری دووەم و لە گەرمەی شەڕی ئێران - عێراق لە ساڵی (١٩٨٧) بە بڕیاری سەرکردایەتی حیزبی بەعس بارکردنی سەرجەم دێهاتەکانی درەکرد. ئەو دێهاتانەی دەستی حکومەتی پێ ڕادەگەشت ڕایگواستن. لە بانی خێلان و دەرە دۆینەوە تا پردی قەرەگۆل بە قەرەداغ و بەشێکی شارەزورەوە لە ئۆردوگای ئەسر نیشتەجێی کردن و لە بەرامبەر موڵك و ماڵەکانیشیان بڕە پارەیەکی وەك سولفە و عەقار دایە خەڵکەکە، تا بتوانن خانوو و ماڵ و حاڵی پێ دروست بکەنەوە و بە ڕەبایەیی جەیش و جاش دەوری ئۆردوگاکانیشی گرت.

کاتێك هاتینە ئۆردوگای ئەسر ماوەی دوو هەفتە ماڵمان لە ماڵی کاك حامید کانی ساردی بوو، کە برای حەسەن ناریبجی بوو. لە دوای ئەوە خانویەکی تەواو نەکراو هەبوو هی کاك حەسەن گەلاڵی ناسراو بە (حەسەنە ڕەش) بوو بە بێ کرێ چووینە ناوی و پەنجەرەکانمان بە نایلۆن گرت و هەرچۆنێك بوو دەمان گوزەراند.

کاتێك لە قەرەداغ منداڵەکانم هاتن بۆ ئەسر هیچمان بۆ دەرنەچووبوو و بە پێی پەتی هاتبوون و زۆر کەس نەیدەوێرا سلاویشمان لێ بکات. لەو کاتە ناهەموارەدا سمایلی عەزیز خان چەند جارێك هاوکاری کردین، هەروەها کاك ساڵحی حمەخان میرەدێیی (٢٠٠) دیناری بۆ هێنایین. ئای کە یارمەتیەکی زۆر بوو، ئای کە پیاوەتیەکی بێ وێنەبوو. برایمی مامە عەزەشم (١٠٠) دیناری بۆ هێنایین. عێزەتی براشم هەندێ کەلوپەلی بۆ هێنایین و حاجی حەمە ئەمینی باوکی جەزا سوور و تەلیعە خانی خێزانی کە کچی حاجی حەمەخان

داریەڕوولـەیی بـوو، هـاتن بـۆ لامـان و لەگـەڵ خۆیانـدا خـۆراك و هەنـدێ کەلوپەلی پێداویستی دیکەیان بۆ هێناین و برایمی حاجی قادر کانی میلی بە هـەمان شـێوە هاوکـاری کـردین. بەڕاسـتی بـەو هاوکارییانـەی بۆیـان هێنـاین کـەمێك بوژاینـەوە. ساڵحی حەمـە خـان و براکـانی کـە خانەوادەیـەکی بـەڕێز و نیشـتیمان پـەروەری شـاری دەربەنـدیخان و ناوچـەکەن، زۆر هاوکـاری ماڵـە پێشمەرگەیان دەکرد.

کەمالی حاجی قادر زەوییەکی هەبوو لێم کڕی. ئەو وڵاخانەی هەمان بـوو فرۆشـتمن و تـەنها دوو مانگایـانم هێشـتەوە و هەرچـۆنێك بـوو خانویـەکم لەسـەر زەویەکـە دروسـتکرد و ژیانمـان تیـا بەسـەر دەبـرد. حکومـەت ئۆردوگاکـەی بلـۆك بلـۆك کردبـوو و هـەر بلۆکـەی لێپرسـراوێکی بـۆ دانـا، کـە ئاگایـان لـە جموجـوڵی هاوڵاتیـان بێـت. ئـیش و کـار زۆر کـەم بـوو و بەشـێکی زۆری گەنجەکانیش بووبوونـە چـەکداری فەوجـە خەفیفـەکان. هەندێکیشـیان واجبیان نەدەگرت و موستەشارەکان وەرەقەیان بۆ دەکردن و موچەکەیان بـۆ خۆیان وەردەگرت.

هەنـدێك لـە بەرپرسی بلۆکەکان پیاوی چاك بوون و هاوکاری خەڵکیان دەکـرد، لەبـەر ئـەوەی خەڵکەکـە هـەموو یـەکتریان دەناسـی و خزمـی یـەکتر بوون کەس ئیخباری کەسی نەدەکرد. کاتێك دێهاتەکانی قەرەداغ بـەر شاڵاوی ئـەنفال کـەوتن هاوڵاتیـانی ئۆردوگـای نەسـر هـاتن بـە هانـای خەڵکـە لێقەوماوەکـەوە و دەرگـای ماڵـەکانیان خسـتە سـەر پشـت بۆیـان. بـەو هۆیـەوە هەنـدێ کەلوپـەلی نێومـاڵ و ئاژەڵـەکان بـەهۆی یارمـەتی و هاوکـاری خـەڵکی نەسر توانرا لە فەوتان ڕزگاریان ببێت.

کـاك مـەحمود خەڵکی نەمـەڵ بـوو بەرپرسی بلۆکی ئـەو گەڕەکـە بـوو کـە منـی تێدا دەژیـام پیـاوێکی بـاش بـوو هـەر کـات حکومـەت بیویسـتایە پشـکنینی گەڕەکەکان بکات پێش وەخت دەهات و هەواڵی بە خەڵکەکە دەدا و دەیگوت

ئـەوەی ترسـی لـە خـۆی هەیـە خـۆی حەشـار بـدات. بەتایبـەتی لـە کـاتی داگیرکردنـی وڵاتـی کوەیـت لەلایـەن سـوپای عێراقـەوە کـە هـەموو ئەوانـەی کرابوونـە سـەرباز بـە تایبـەت گەنجـەکان لـە سـەربازی هـەڵهاتبوون. هـەرگیز نەمبیسـتووە هـەواڵێك بـە حکومـەت بـدات یـا زیـانێکی بـە هاوڵاتییـەك گەیاندبێت. من خۆم ئەوەنـدە متمامـەن پێـی هەبوو باسی ڕاپەڕینم لا دەکرد، لە هەندێ کاتیشدا بە نهێنی هاوکاری دەکردین.

ژیـان لـە ئۆردوگـای نەسـر بـۆ مـن زۆر نارەحـەت بـوو، کێشـەی بایـەعی، کێشـەی نیشـتەجێبوون، کێشـەی ناسـنامە، ڕەگەزنامـە و خوێنـدنی منداڵـەکان ڕۆژانـە ڕووبـەڕووم دەبـووەوە. سەرچـاوەی داراییمـان هەنـدێ ڕەشـە وڵاخ بـوو عەبـدوڵڵای مـەلا عـەلی باوەخۆشـێنی لەگـەڵ وڵاخـەکانی خۆیانـدا بـۆی دەرکردبـووین و وڵاخـەکانی ئێمەیشـیان هێنابوویـەوە و لـە فـەوتان ڕزگـاری کردبـوون. ئێمـە خێـزانێکی نـۆ کەسـی بـووین و خـەرجی و پێداویسـتیمان زۆر بوو. هادی ئەحمەد سیارەیی وەسـتای دروسـتکردنی خانوو بـوو، دەیزانـی بـاری داراییمـان بـاش نیـە، پێشـنیاری کـرد عـەلی کـوڕم هەرچـەند تەمـەنی مێرمنداڵ بوو لەگەڵ خۆی ببات بۆ کرێکاری، منیش بـە ناچاری ڕەزامەنـدیم دەربـڕی و عـەلی کوڕیشـم پێـی خـۆش بـوو، چـونکە هەسـتی بـە نارەحـەتی گوزەرانمـان دەکـرد. وەسـتا هـادی و وەسـتا محەمـەدی بـرای و وەسـتا ڕۆسـتەم عـەلی سـێ وەسـتای دەسـتڕەنگین و خـاوەن پیـاوەتی بـوون و ببوونـە هۆکـاری دۆزینـەوەی هەلی کار بۆ بەشێکی گەنجەکانی گوندەکەمان.

دوای ماوەیـەك ئـۆقرەگرتن دەسـتم کـرد بـە گـەڕان، سـەردانی ئـەو برادەرانەم دەکرد کە لەسەردەمی شاخ پێکەوە بووین و دەمناسـین و متمانـەم پێیان هەبوو پێکەوە هاوسۆز بووین و ڕووداوەکانمان بـاس دەکـرد و خوازیـاری دەرچەیەك بووین کە سەر لەنوێ خەباتی خۆمان دەست پێبکەینەوە.

یـەکێك لـەو پیاوانـەی سـەردانم دەکـرد فایـەق عـەزیز محەمـەد (فایـەق

شەممەیی) بوو، پیاوێکی جوامێری نیشتیمان پەروەری بەئاگا لە دنیای سیاسەت، کە زۆر جێگای متمانەم بوو. کاك فایەق خەڵکی گوندی (شەممە) بوو لە بناری شارەزوور لە تەنیشت ئاوەکەڵە. لە شۆڕشی ئەیلولدا لە شاخی گولآن لە مانگی (٤)ی ساڵی (١٩٧٤) پێکەوە بریندار بووین، بەڵام کاك فایەق برینەکەی زۆر سەخت بوو، نێردرا بۆ ئێران چونکە دڕکەپەتك (حبل الشوکی) پچڕابوو، هەردوو قاچی لەکار کەوتبوون و نەیدەتوانی جووڵەیان پێ بکات.

ساڵی (١٩٧٩) کاك مستەفا فەرماندەی هەرێم بوو سەردانی کاك فایەقمان کرد لە گوندی شەممە، زۆری پێخۆش بوو کە پێشمەرگە خەباتی چەکدارییان دەستپێکردووەتەوە. کاك مستەفا رێنوێنی کرد بۆ چارەسەر سەردانی دەرەوەی وڵات بکات، ئەوەبوو ساڵی (١٩٨١) سەردانی وڵاتی بولغاریای کرد، بەڵام بەداخەوە نەتوانرا چارەسەری بۆ بکرێت. لە گەڕانەوەیدا رادیۆیەکی (سلڤەر)ی بچووکی بۆ کاك مستەفا هێنابوو کە بە شەپۆلی (FM) گفتوگۆی نێوان فرۆکە کۆپتەرەکانی وەردەگرت، کە دواتر زۆر کەڵکمان لێ وەرگرت.

کاك فایەف (١٨) ساڵ بەو شێوەیە مایەوە، دادە گوڵنازی خێزانی و منداڵەکانی خزمەتێکی زۆر چاکیان دەکرد. من و کاك فایەق لە ئۆردوگای (نەسر) خەباتی رێکخستنمان دەکرد، هەرچەندە سەر بە دوو رێکخستنی جیاواز بووین، بەڵام هەردووکمان دەروێشی کوردایەتی بووین نەك حیزبایەتی.

کاك فایەق لە نزیك ئۆردوگای نەسر زەوی کشتوکاڵییان زۆر هەبوو دەمانکرد بە کشتوکاڵ، لەو کاتەدا لە ئۆردوگای نەسر کاروبار نەبوو ئەو کشتوکاڵە بۆ ئێمە زۆر بەسوود بوو.

کاك فایەق لە مانگی (١١)ی ساڵی (١٩٩٢) دوای ململانێی (١٨) ساڵ لەگەڵ نەخۆشییەکەیدا دڵە گەورەکەی لەلێدان کەوت.



گوڵناز حسەین شەریف      خەڵات فایەق      فایەق عەزیز محەمەد

## ڕاوە ماسی

ماڵمان لە ئۆردوگای نەسر بوو، ڕۆژێکیان لە بازاڕ بووم خەڵکی پێنجوێنیم دەبینی ماسییان هێنابووە بازاڕەکە و کڕیار لێیان خڕۆشابوو. دیاربوو لە ئاوی تانجەرۆی نزیك ئۆردوگای نەسر ڕاویان کردبوو. منیش بڕیارم دا لەگەڵ هەردی کوڕم هەرچەندە بە تەمەن منداڵ بوو بەڵام وریا و زیرەك بوو، بچین بۆ ڕاوە ماسی، تۆڕێکمان پەیدا کرد و لە گوندی سیارەوە بە نهێنی دەچووینە سەر دەریاچەی دەربەندیخان و لە پەنگاوەکەدا تۆڕمان دەخست و ماسیمان دەگرت. لەبەر ئەوەی ناوچەکە چۆڵ بوو خەڵك زۆر بە کەمی دەیوێرا ڕاوە ماسی بکات.

لە چەم و دەریاچەکەدا ماسییەکی زۆر هەبوو. دوو کوڕی عازەبانیش بە ناوەکانی شێخ سەعید عەبدولڕەحمان و شێخ جەمال شێخ حەسەن، کەڵەکێکی بچوکیان دروست کردبوو تۆڕی ماسییان پێ دەخست، کە ئێمەیان بینی گوتیان مام دەروێش هەر ڕۆژێ ئێمە هاتین تۆش وەرە بە کەڵەکەکەی خۆمان تۆڕەکەت بۆ دەخەین و بۆت هەڵدەگرینەوە و بە هەموو شێوەیەك هاوکاریت دەکەین. ئەمە بۆ ئێمە هاوکارییەکی زۆر باش بوو، ڕۆژی وا هەبوو پەنجا کیلۆ ماسیمان دەگرت، لانی کەم (١٠) دینارمان دەستدەکەوت، لەو کاتەدا فەردەیە برنجی (٥٠) کیلۆیی دەکرد. بەو شێوەیە بۆ ماوەیەك بەردەوام بووین و بۆ ئەو ڕۆژ و سەردەمەی ئێمە داهاتێکی باش بوو.

ڕۆژێکیان لەسەر دەریاچەکە بووین ئیخباری کرابووین، کاتێکمان زانی مەفرەزە خاسە هاتنە سەرمان و گرتینیان، گوتیان وەرنە سەرەوە ئەفسەرە ئەمنەکە چاوەڕێتان دەکات. گوتمان ئێمە بۆ بژێوی خۆمان و خێزانمان هاتووین، گەر وانەبێ هیچ کارێکمان نە بەم ئیشە و نە بە ئەم ناوە نیە. زۆرمان هەوڵدا کە نەمانبەن بۆ لای ئەفسەرەکە ئەمنەکە، مەفرەزە خاسەکان کورد بوون، گوتمان هەرچی ماسیمان گرتووە بیبەن بۆ خۆتان، بەس مەمانبەن بۆ لای ئەفسەرە ئەمنەکە، بەڵام هەوڵەکەمان بێسوود بوو، گوتیان ئیخباری کراون و ناتوانین هیچتان بۆ بکەین.

لەگەڵ شێخ سەعید و شێخ جەمال و هەردی کوڕم بە ماسیەکانەوە بردینیانە سەرەوە. ئەفسەرێکی ئەمنی عەرەب چاوەڕێی دەکردین، شێخ جەباری کاك شێخ محەمەدی لەگەڵ بوو. شێخ جەبار کە چاوی بە من کەوت خەمی لێهات، چونکە دەیزانی بمانبەن بۆ دەربەندیخان و سەیری فایلی منیان بکردایە ڕزگار نەدەبووم. شێخ جەبار بەم حاڵەی دەزانی و بوو بە پارێزەرێکی چاکی من.

ڕووی کردە ئەفسەرە ئەمنەکە و گوتی ئەم پیاوە پیرە فەقیرە و خێزان و منداڵی بچوکی هەیە و هیچ موچەیەکی نیە ئەم ماسیانە دەباتەوە بە پارەکەی بژێوی بۆ منداڵەکانی دەستبەر دەکات. قسەکانی شوێنی خۆی گرت و بە ڕاستی بووە فریاد ڕەسم. ئیتر هەندێ لە ماسیەکانیان بۆ خۆیان برد و ئێمەش بەردراین و ئەو هەلەی کەسابەتیشم لە گۆڕنرا.

کاتێك شێخ جەبار ماڵی باوکی لە زەلە ڕەش بوو زۆر هاوکاریان دەکردم، کاتێك منداڵەکانم لە سجن بەربووبوون شێخ جەمالی شێخ محەمەد لە سلێمانیەوە منداڵەکانمی بە سەیارەی خۆی هێنا بۆ زەلەڕەش بەبێ ئەوەی هیچ کرێیەك وەربگرێت.



**دەریاچەی دەربەندیخان**

**شاخەوان مام دەروێش ، محەمەد عەلی مام دەروێش ، عومەر عەبدوڵڵا بیرکێیی، مام دەروێش دەریاچەی دەربەندیخان ساڵی (٢٠١٤)**

## داگیرکرنی کوەیت و شەڕی کەنداو

لە (٢/٨/١٩٩٠) عێراق لە ناکاو پەلاماری کوەیتی داو داگیری کرد. ئەم هەڵەیەی بەعس بۆ نەیارەکانی و بۆ ئێمەی کورد دەرویەکی گەورە بوو لێمان کرایەوە. وڵاتانی جیهان داوایان لە عێراق کرد سوپاکەی لە کوەیت بکشێنێتەوە، بەڵام سەدام ڕازی نەبوو و هەموو هێزەکانی بردە کوەیتەوە. نەتەوە یەکگرتووەکان بە بڕیارێك داوایان لە سەدام کرد خاکی کوەیت جێبهێڵێت. لە بەرامبەردا عێراق مەرجی قورسی بۆ پاشەکشێی سوپاکەی دانا. دواجار نەتەوە یەکگرتووەکان بە بڕیارێك سوپای زۆربەی وڵاتانی بە سەرکردایەتی ئەمەریکا هێنایە کەنداوی عەرەبی و بە زەبری هێز سوپای عێراقیان تەفر و تونا کرد و کوەیتیان گەڕاندەوە بۆ کوەیتییەکان. سوپای عێراقیش هێندە لاواز بووبوو توانای هیچ بەرگرییەکی ئەوتۆی نەمابوو، بۆیە لە ناوەڕاست و خواروی عێراق جەماوەر پەلاماری دام و دەزگای بەعسیان داو زۆربەی شارەکان لەلایەن خەڵکییەوە داگیرکران کە دواتر بەهۆی بەرژەوەندی وڵاتە زلهێزەکانی جیهان گۆڕانکاری لە سیاسەتی ئەواندا ڕووی داو چانسێکی دیکە درایە ڕژێمی سەدام کە بەو هێزە تێکشکاوەی توانی جارێکی دیکە پارێزگاکانی ناوەڕاست و خوارووی عێراق کۆنترۆڵ بکاتەوە.

# قۆناغی پێنجەم

## ڕاپەڕین لە کوردستان

ڕاپەڕین زادەی زوڵم و زۆری ڕژێمی بەعس بوو بەرامبەر گەلی عێراق بە گشتی و گەلی کورد بە تایبەتی، بەعس ئەوەندە زوڵمی کردو پەلاماری خەڵکی خۆی و وڵاتانی دراوسێی دا هەتا کار گەشتە ئەوەی هاوپەیمانان بەهێز سوپاکەی بەعسیان لە کوەیت وەدەرنا و ئەمەش هەلی بۆ گەلانی عێراق ڕەخساند کە جەماوەر پەلاماری دام و دەزگاکانی ڕژێم بدەن و ڕاپەڕین لە خواروی عێراق و لە کوردستانیش دەستی پێکرد.

هێزەکانی بەرەی کوردستانی بە تایبەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان هەر زوو خۆیان کۆکردەوە و کەوتنە جموجوڵ و خۆیان ئامادە کرد بۆ جۆرێك لە ڕاپەڕین. بۆ ئەم مەبەستە بەرنامەی ڕاپەڕینیان داڕشت و نامەیان بۆ هەموو موستەشار و دەسەڵاتدارە چەکدارەکانی ناو ڕژێم نارد و دڵنیاییان پێ دان کە بەرەی کوردستانی وەك پارێزگاکانی دیکەی ناوەڕاست و باشوور نیازی ڕاپەڕینێکی گەورەو سەرتاسەری هەیە و بە نیازن بۆ هەتاهەتایە ڕژێمی بەعس لە کوردستان وەدەرنێن و گەر ئێوەش هاوکار بن ئەوا لە ڕابردوتان خۆش دەبین. ئەمەش هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ سەرکەوتنی ڕاپەڕین.

ڕۆژانە لە ڕێگەی دەنگی گەلی کوردستانەوە خەڵك ئاگادار ئەکرایەوە و بە زمانی عەرەبیش داوا لە ئەفسەر و سەربازەکانی ڕژێم دەکرا کە دەست لە

جەماوەر نەكەنەوە و ژيانيان نەخەنە مەترسييەوە. ئێمەش كەوتينە خۆ سازدان و پەيوەنديمان كرد بە ڕێكخستنەكان و لەگەڵ كاك حەمە قاشتی، ئاسۆ قەڵەو، محەمەد مەدحەت گەلاڵی كاك جەمالە سوور، باوەشێخ شێخ عەلی و مەلا غەفور باوەخۆشێنی و شێخ عەلی ناوێك سەیدسادقی بوو لەم دواييەدا لە ناوی سیروانی خنكا، پەيوەنديمان هەبوو و ئاگاداری ڕەوشەكە بووين، لەگەڵ چەكدارەكانی حكومەت قسەمان كرد و سەركردايەتی يەكێتی لەم كارەدا ڕۆڵێكی كاريگەری بينی لە نامە ناردن بۆ مستەشارەكان و ئەوانەی لە دام و دەزگای حكومەتدا كاربەدەست بوون و ئیستگەی دەنگی گەلی كوردستانيش بە ناونيشانی (زەماوەند كردن) گوڕو تين و ورەيەكی بەرزی دەدا بە جەماوەر.

هێزەكانی حزبی بەعس بەهۆی شكستی شەڕی كوەيت بە جۆرێك لاواز بووبوو نەيدەپەرژايە سەر چاودێريكردنی خەڵك و بزانێت چی دەكەن. دواجار (٣/٥) لە چوارقوورنە و ڕانيەوە ڕق و كينەی خەڵك تەقييەوە و زەماوەنديان ڕاگەياند و گلۆڵەی بەعس كەتە لێژی. (٣/٧) لە سلەيمانی زەماوەند كرا. لە (٣/٨) هێشتا سلەيمانی بە تەواوەتی ڕزگار نەكرابوو و ئەمنە سوورەكە هێشتا بەرگری تێدا مابوو. پەلاماری منەزەمە و دامودەزگای بەعسمان لە ئۆردوگای نەسر دا. يەكەم كەس بووم چوومە سەربانی منەزەمەی بەعس و (بی كەی سی)يەكەم داگرتە خوارەوە. خەڵكێكی زۆر لەدەورم كۆبوونەوە كە بەزۆری خەڵكی سيارە بوون. لە ڕزگاركردنی دەربەنديخان و باوەنوور و كەلار و مەيداندا بەشداربووم.

پاشان بەرەو خانەقين بەڕێكەتين و سێ ڕەبايەمان لە نزيك خانەقين گرت. عەلی شامار سەرپەرشتی قۆڵی ئێمەی دەكرد. لە (١٩٩١/٣/١٩) چووينە نێو خانەقين لە كولەجۆ پێشمەرگەيەكمان بەناوی عەلی حاجی مەولود

سیارەیی شەهید بوو. حکومەت لەگەڵ هێزەکانی موجاهیدینی خەلقی ئێرانی هێرشی هێنا و زۆر مەبەستی بوو خانەقین بگرێتەوە و لەدوای بەرگرییەکی قارەمانانەی خەڵك و پێشمەرگە توانییان خانەقین بگرنەوە. کۆمەڵێك پێشمەرگە شەهید و برینداربوون، لەنێو شەهیدەکاندا دوو برای شاهۆ و چەند ئامۆزایەکی تێدابوو، دوو برای کاك سەلامی کوێخا عەزیز و چوار خزمی نزیکی لەنێو شەهیدەکاندا بوون و تەرمەکانیشیان دەست دوژمن کەوت. سەلامی کوێخا عەزیز فەرماندەیەکی قارەمان و کەسێکی بە وەفاو نیشتمان پەروەر بوو و ئامادە نەبوو شەڕی بر اکوژی بکات چونکە کەسێکی ئاشتیخواز بوو. بنەماڵەی سەلامی کوێخا عەزیز و ناوچەی ئەوبەری سیروان قوربانی زۆریان داوە بۆ کوردستان، هەر لە سەردەمی حیزبی شیوعی و شۆڕش ئەیلول و شۆڕشی نوێ بەتایبەتی لەنێو یەکێتیدا لە ژمارەی پێشمەرگەی شەهید بەشی شێریان بەرکەوتووە. باوك و کوڕ دوو برا و سێ برا نموونەی شەهیدەکانی پێشمەرگەی ئەو بەری سیروان بوون لەنێو ریزەکانی یەکێتیدا. عەزیز حسین مەحمود ناسراو بە مامە عەزە سێ کوڕی شەهید بووە، حەمە فەرەجی کانی بی لە کاتی خۆیدا کادیرێکی چالاك بووە لە ساڵی (١٩٨٠) هیوای کوڕی لە شۆڕشی نوێدا شەهید بووە. باسکردن لە شۆڕشگێڕێتی و شەهیدەکانی ئەوبەری سیروان کۆتایی نایەو ئومێدەوارم کەسێك بتوانێت لە نامیلکەیەکی تایبەتدا دەڤەری ئەوبەری سیروان بە داتا و ژمارەو ناوەکانیان یەکلا بکاتەوە، کە ئەم ناوچەیە چەند شۆڕشگێڕ و دڵسۆز بوون بۆ میللەت و لەو پێناوەدا هەموو کات ڕاستەخۆ بەشداریی کارایان لە خەبات و فیداکاریدا هەبووە و چەندین شەهید و کەم ئەندامی سەنگەریان هەبووەو لە سەردەمی شاخیشدا هەمیشە لانەوماڵیان ببووە لانکەی شۆڕش و کوردایەتی و بە دەیان جار ماڵ وێران بوون و کۆڵیان نەداوە.

لە کاتی ڕاپەڕین بە هەزارەها ئەفسەر و سەرباز بە دیل گیران و نەك سوکایەتیان پێ نەکرا بەڵکو ڕێزیان لێ گیرا و خزمەت کران و بە ڕێزەوە ڕەوانەی کۆتا خاڵی نێوان پێشمەرگە و ڕژێم کران. لەگەڵ یەکەم بڵێسەی ڕاپەڕین موستەشار و چەکدارەکانی ئەفواج خەفیفە دایەنە پاڵ خەڵکە ڕاپەڕیوەکە و بەچەکانەی هەیانبوو یارمەتیدەرێکی باشی هێزی پێشمەرگە بوون. لەبەر ئەوەی جەماوەر و لایەنەکان بە یەك دەست و بێ جیاوازی ڕووبەڕووی دوژمن بوونەوە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا توانرا زۆربەی هەرە زۆری خاکی کوردستان بە کەرکوك و خانەقینیشەوە لە چنگی بەعس ڕزگار بکەن، ئەگەر چی تەمەنی ڕاپەڕین بۆ هەندێ ناوچەی کوردستان تەنها یەك مانگ بوو، بەڵام پەیامێك بوو بۆ سەرانی بەغداد کە میللەتی کورد دەست لە خەبات و تێکۆشان هەڵناگرێت و هەر کات بۆی بلوێ و دەرفەتی بۆ بڕەخسێت لە خەبات و تێکۆشان کۆڵ نادات تا هەموو کوردستان ڕزگار نەکات.

هەر چەند ڕاپەڕین وەرچەرخانێکی مێژوویی بوو لە خەبات و تێکۆشانی میللەتی کورد بەڵام بێ کەموکوڕیش نەبوو، ئەگەر لە ڕووی ڕێکخستنەوە شێوەیەکی باشتر ڕێکبخرایە و هەماهەنگی باشتر لە نێوان جەماوەر و لایەنەکانی بەرەرەی کوردستانیدا هەبوایە زیانەکان کەمتر دەبوو. پاشان لەڕووی ئیدارییەوە ئەگەر ئەو چەك و چۆڵەی دەست جەماوەر و لایەنەکان کەوت بە چاکی بەکار بهێنرایە حکومەتی بەعس نەیدەتوانی هەر وا بە ئاسانی پەلاماری ناوچەکانی کوردستان بداتەوە ، چونکە ئەو سوپایەی کە بەرەو کوردستان هاتەوە سوپایەکی داتەپیوی ماندوو و شکستخواردووی شەڕی کوەیت بوو. هێزەکانی بەعس بە جۆرێك لە ناوچە ڕزگار کراوەکان بێ ئومێد بووبوون لە کاتی گرتنی پارێزگای کەرکوکدا سەدام حسێن بە موکرەم ڕەشید تاڵەبانی گوتبوو داوا لە کوردەکان بکات لە کەرکوکەوە نەوتیان بداتێ

بۆ ئەوەی بیپاڵێون و پێداویستی ناوخۆی ژێر دەسەڵات ئەوانی پێ دابین بکەن و هەروەها ڕێگە بدرێت لە دەروازەی ئیبراهیم خەلیلەوە پێداویستیان پێ بگات[1]. وە کاتێك سوپای عێراق هاتەوە بۆ کوردستان و هاوڵاتیانی کوردستان توانیان سەردانی بەغدا بکەن بینیبوویان کە سوپای عێراق شارەبانی کردبووە سنووری خۆی و ساتر و سەنگەری مەحکەمی لێدابوو بۆ بەرگریکردن، کە ئەمە دەری دەخات بەعس چاوەڕێ نەبووە بەو ئاسانیە کوردستان بگێڕێتەوە. ئەگەر بهاتایە ئەو هەموو چەك و چۆڵەی لە سەربازگەکاندا دەستی بەسەردا گیرا هەر لە دەبابە و تۆپهاوێژ و جۆرەها دۆشکە و چەکی قورس و مام ناوەند بە ڕێکوپێکی لە ناوچەیەکی ئارامی سەر سنوور بپارێزرایە و هەڵبگیرایە بۆ کاتی تەنگانە و سوود لە زانیارییەکانی ئەو هەموو سەرباز و ئەفسەرە کوردانە یا ئەوانەی عەرەب بوون و هاو سۆزی کورد بوون و بە دیل گیران، وەر بگیرایە. دەبوو ئەو موستەشارانەی کە بە خۆیان و چەکدارەکانیانەوە پاڵپشتی ڕاپەڕینەکەیان کرد ئەرکیان بۆ دابین بکرایە و سەرپەرشتی بکرانایە و پلانێك بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای عێراق دابنرایە، گەر ئەوە بکرایە سوپای عێراق بەو ئاسانییە نەیدەتوانی بێتەوە کورستان، دەسەڵاتدارانی عێراق هەر ئەو کاتە بە داخوازییەکانی بەرەی کوردستانی ڕەزامەند دەبوون.

کاتێك سوپای بەعس هاتەوە کوردستان ئەوەندە لاواز بوو هەم لە ڕووی ورەی سەربازەکانیەوە هەم لە ڕووی ئەو چەکانەی بە دەستیانەوە بوو کە بە زۆری زۆری چەکەکان کۆن و بێ کەڵك بوون. کاتێك ڕاپەڕینی دووەم دەستی پێکرد سوپای عێراق لە دوزخورماتووە بە دەبابە و کۆپتەر هێرشی هێنا بۆ کفری، عوسمانی حاجی مەحمود فەرماندەیەکی سەربازی یەکێتی نیشتیمانی

---

[1] دیمانەی موکەڕەم ڕەشید تاڵەبانی لە بەرنامەی (پەنجە مۆر)ی کاوە ئەمین لە کەناڵی روداو.

کوردستان بوو بە خۆی و هێزەکەیەوە لە سووپاکەیان دا و لە ماوەیەکی کەمدا هەموو دەبابەکانیان تێکشکاند و هەتا ماوەیەکی زۆری دوای شەڕەکە دەبابە شکاوەکان لە گۆڕەپانی جەنگەکەدا بە جێمابوون و جارێکی دیکە دوژمن لەو قۆڵەوە هێرشیان نەکردەوە و نێوانی کفری و دوزخورماتوو بوو بە دوا سەنگەری پێشمەرگە و سوپای عێراق.

کاتێك سوپای عێراق هاتنەوە کوردستان نەیاندەتوانی لە جادەی قیر لا بدەن، لە ڕاپەڕینی دووەمیشدا لە پایزی (١٩٩١) فەوجێك لە سوپای عێراق لە بەردەم ئۆردوگای نەسردا خێمەیان هەڵدابوو، بە چاوی خۆم بینیم جەماوەر پەلاماری دان، ژن هەبوو پەلاماری خێمەی سەربازەکانی دا و ڕوخاندی بە سەریاندا و سەربازەکانیان چەك دەکرد. لە هەموو ڕوویەکەوە سوپاکە لە لێواری مەرگدا بوو، دیار بوو ئەو کات وڵاتە زلهێزەکان لە بەرژەوەندیان نەبوو صەدام بڕوخێت، ئەگەرنا لەو هەلومەرجەدا دەڕووخا.

لە هەندێ شوێن جەماوەری ڕاپەڕیوو پەلاماری دەزگاکانی حکومەتیان دەدا و دەسکەوتەکانیان بۆ خۆیان دەبرد، ئەو بەڵگەنامانەی لە ناو دەزگا سەرکوتکەرەکاندا هەبوو نەتوانرا بە باشی کۆبکرێتەوە و لە فەوتان بپارێزرێن، چونکە ئەوانەی کۆکرانەوە کەڵکێکی زۆری لێ وەرگیرا و پاشان لە (٢٠٠٣)دا کرانە گەواهیدەری تاوانەکان و لەکاتی دادگایکردنی سەرانی ڕژێم و لە کۆڕو کۆمەڵە نێو نەتەوەیەکان کەڵکی زۆری لێوەرگیرا بۆ خستنەڕووی رتاوانەکانی سەرانی بەعس لە دژی هاوڵاتیانی کورد.

کاتێك حکومەت ئەوەندە بە لاوازی هاتەوە و تەنها لە ڕێگە سەرەکیەکان بەولاوە نەیدەتوانی بڵاوە بە هێزەکانی بکات، بۆ نمونە لە قۆڵی هەڵەبجەوە تا چەناخچیان هاتبوو واتە؛ (١٠) کیلۆمەتر خۆر هەڵاتی عەربەت. لە عەربەت بەدواوە سەیدصادق و پێنجوێن و هەڵەبجە و ناوچەی هەورامان بە دەست پێشمەرگەوە بوو، لە ئەزمەڕ و هەندێ شوێنی دیکە پێشمەرگە ڕووبەڕووی

سوپا بوونەوە و تێکیان شکاندبوون. حکومەتی بەعس لە لایەکەوە کە بینی کۆڕەوەی هاوڵاتیانی کورد پێکەوە بەرەو سنوورەکانی ئێران تورکیا بەڕێوەیە و ژیانی سەختی ئاوارەییان پێ باشترە و بوونەتە مانشێتی گۆڤار و ڕۆژنامە جیهانییەکان، لەلایەکی دیکەشەوە بەهۆی تێکشکانی سوپا گەورەکەی لەلایەن ئەمەریکاو هاوپەیمانەکانیەوە و بەهۆی سەرکوتکردنی ڕاپەڕینە جەماوەرییەکانی ناوەڕاست و باشووری عێراقەوە سوپاکەی پەرتەوازە بووە حکومەت بە ناچاری پەنای بردە بەر گفتوگۆ.

## کۆڕەو

کاتێك کۆڕەو دەستی پێکرد ئەو هێزەی لەگەڵ مندا بوو لە کەلار بووین. کاتێك سوپای عێراق نزیك بوویەوە پاش چەندین شەڕ و ڕووبەڕووبونەوە بڕیاری پاشەکشە درا و کۆڕەو دەستی پێکرد. هەتا من لە کەلار گەڕامەوە منداڵکانم لەگەڵ ماڵی حاجی مەولود حسین، کە تراکتۆریان هەبوو ڕۆشتبوون هەتا دوو ئاو لە سنوری ئێران. لەگەڵ عەلی کوڕم و محەمەد کەریم پیروەیس ئەو چەکانەی هەمان بوو لەگەڵ خۆمان بردمان و دوو سێ ولاخمان هەبوو دامانە بەر و بەرەو گوندی قەڵبەزە بەڕێکەوتین و دوو ڕۆژ لایان ماینەوە. دواجار حکومەت هات و خەڵك و پێشمەرگە بەرەو سنوری ئێران بە ڕێکەوتن، ئێمەش هەر چەکێکی زیادەمان هەبوو لە نێو گەنمەکانی قەڵبەزە شاردمانەوە و ولاخەکانیشمان تێکەڵ بە ولاخی ناسراوێك کرد و بەرەو لای منداڵەکان ڕۆیشتین. کە گەشتمە لای ئەوان لە دووئاو، منداڵەکانم بینی وەزعیان زۆر خراپ بوو و نەخۆش کەوتبوون. هەموو کاتێکیش دژی

ئەوە بووم بە ئاوارەیی بچمە خاکی ئێران، بەڵام بەهۆی منداڵەکانمەوە ناچار بووم، بۆیە ماوەیکی کەم مامەوە. کە زرووفەکە کەمێك ئارام بوویەوە بڕیاری گەڕانەوەمان دا بەرەو هەڵەبجە.

## گەڕانەوەم بۆ هەڵەبجە

پاش ماوەیەکی کەم گەڕامەوە بۆ هەڵەبجە و نوایەکم بۆ منداڵەکان پەیدا کرد و بۆ خۆیشم بارەگایەکم دانا. ئەو پێشمەرگانەی پێش کۆڕەو لەگەڵمدا بوون پەیتا پەیتا پەیوەندییان پێوە دەکردم و ژمارەمان زۆر دەبوو. پاش ئەوەی هێزی پێشمەرگە خۆی گرتەوە و لە هەندێك شوێن بەرگرییان کرد و دوژمنیان تێکشکاند، بەعس ناچار بوو لەگەڵ بەرەی کوردستانیدا بکەوێتە گفتوگۆ. خەڵکەکە لەنێو شارو ئۆردوگاکانی ئێران بێتاقەت بووبوون و پاش ئەوەی تا ڕادەیەك دڵنیا بوون لە زرووفە ئەمنیەکە وردە وردە دەگەڕانەوە بۆ نێو زێدی خۆیان.

هێزی پێشمەرگەی بەرەی کوردستانیش کەوتەوە ڕێکخستنی هێزەکانی خۆیان. ئێمە وەك هێزی یەکێتی نیشتمانی کوردستان خۆمان ڕێکخستەوە و تەشکیلاتی تازە دانرا و کاك سیروان نەورۆڵی کرا بە فەرماندەی بەتالیۆن و منیش کرام بە جێگری. کاك سیروان هەموو کات دەیگوت مافی تۆیە فەرماندەی بەتالیۆن بیت منیش دەمگوت کاك سیروان لەبەر ئەوەی خوێندەواریم نیە ناسایيە بە لامەوە، ئەوەی بۆ من گرنگە لە هەر پلەیەکدا بم خزمەتی ڕێبازێك بکەم کە جێی باوەڕم بێت.

پاش ماوەیەکی کەم لە جێگری بەتالیۆنەوە بووم بە سەرتیپ لە بەتالیۆنی (١١٧)ی بالانبۆ، کە سەر بە میحوەری هەڵەبجە بوو. بۆ ئەوەی

بارەگای سەربەخۆ بکەمەوە پێمباشبوو سەرتیپ بم نەك جێگری بەتالیۆن. برایمی مامەعەزەم و برایمی کەریم پیرەویس لە تیپەکەدا فەرماندەی کەرت بوون، ئەوەی شایانی باسە لەگەڵ برایم کەریم پیرەویسی زۆربەی کات پێکەوە بووین و پشت و پەنای یەکتر بووین. برایم لە سەرەتای هەشتاکاندا بووە بە پێشمەرگە، لە زۆربەی قۆناغەکانی پێشمەرگایەتیدا پێکەوە بووین، بەڕاستی پێشمەرگەیەکی ئازا و قارەمان بوو، لەڕوی کۆمەڵایەتیشەوە پیاوێکی رەوشت بەرزو رەفیق دۆست بوو.زۆربەی پێشمەرگەکانیش خەڵکی گوندەکانی سیارە و وارماوا بوون، یا خزم و ناسراوی یەکتری بووین. لەو خزمانەی کە لەگەڵ خۆمدا پێشمەرگە بوون، جەمال و کەمال و شوانەی کوڕی کاك فایەق (موانی کۆن)، کە مەعبوبەی دایکیان ئامۆزام بوو. مەولودی خوشکەزام، ئەحمەدی برازام، عومەر حەسەن کەریم، کەریم مەحمود عەزیز، بەختیار مەحمود پیرەویس، ئەبەبەکر عەلی ئەحمەد، خالید عەبدوڵڵا عەبدولقادر، عەبدوڵڵا عەلی فەرەج، کە هەر هەموویان دڵسۆز و ئازا و بە جەرگ بوون بۆ ڕێبازەکەیان. هەرچەند من هەموو ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵمدا بوون بەبێ جیاوازی هەموویانم بە برازا و ئامۆزا و خوشکەزای خۆم زانیوە.

دوای ماوەیەك بارەگامان هێنایە سیدصادق و سەرای سوبحان ئاغا. پاشان هێزی پێشمەرگە هاتەوە نێو شار و وەفدی بەرەی کوردستانییش لە بەغداد مەشغوڵی گفتوگۆ بوو. دواتر بارەگامان هێنایە تانجەرۆ و لەوێوە ئەرکەکانمان جێبەجێ دەکرد. ئۆتۆمبیلێکی نیڤامان هەبوو، فەلاح عەلی ئەحمەد شۆفێری بوو. فەلاح پێشمەرگەیەکی گوێڕایەڵ و بەوەفا بوو ماوەیەکی زۆر لەگەڵمدا پێشمەرگە بوو.



مام دەروێش                                  برایم کەریم پیروەیس

ساڵی (٢٠١٨)

## گفتوگۆی بەرەی کوردستانی لەگەڵ حیزبی بەعس

وەفدی بەرەی کوردستانی چوونە بەغدا و گفتوگۆ دەستیپێکرد و حکومەتی عێراقیش سەر لە نوێ دام و دەزگاکانی لە کوردستان دروست کردەوە و پارێزگارێکی کوردی لە سلێمانی دانا بە ناوی شێخ نەجمەدین نەقشبەندی، بەڵام دام و دەزگاکانی ئەوەندە بێهێز بوون نەیاندەتوانی کاروبارەکانی خەڵك بەڕێوەبەرن، لەبەر ئەوەی ئابلۆقەی نێودەوڵەتی لەسەر عێراق بوو و باری دارایی عێراق بە گشتی زۆر خراپ بووبوو. هەرچەند نێوانی

بەرەی کوردستانی و حکومەتی بەعس هەماهەنگیەکی لاواز هەبوو، بەڵام بۆ جاری دووەم جەماوەر پەلاماری دام و دەزگا سەربازیەکانی حکومەتی داو سەر لە نوێ سوپا چەککرایەوە. دوای ئەوەی ڕەوشی گفتوگۆکان بێ ئومێدیەکی زۆریان پێوە دیاربوو و بەرەی کوردستانی هیچ هیوایەکی بە بەغدا نەما و ڕەوشە نێودەوڵەتییەکەش بەرە بەرە بە قازانجی کورد دەشکایەوە. کە سوپای عێراق لە کوردستان وەدەرنرا حکومەتی بەغدا لە (١/١٠/١٩٩١) هەموو دام و دەزگای ئیداری و بەڕێوەبردنی لە کوردستان کشاندەوە و بە ئەمری واقیع بەرەی کوردستانی جێگەی حکومەتی گرتەوە و لە هەموو شار و شارۆچکەکاندا نوێنەری هەموو لایەنەکان بەشداریان لە بەڕێوەبردندا دەکرد.

## ڕاپەرینی دووەم

سوپای عێراق لە سەربازگە کۆنەکان و ڕێگە سەرەکیەکان سەربازگەیان دانابوو، ئیدارە لە دەستی حکومەتی بەغداد بەڵام بە هەماهەنگی لەگەڵ بەرەی کوردستانیدا بوو. کاتێك بەرەی کوردستانی هیچ ئومێدێکی بە گفتوگۆ نەما ئیتر مانەوەی هێزەکەی حکومەت هیچ بەهانەیەکی نەمابوو بۆیە جەماوەر و پێشمەرگە جارێکی دیکە پەلاماری بنکەو بارەگا سەربازیەکانی بەعسیان دایەوە.

لە ڕاپەڕینی دووەم ساڵح سەرسپی و برایمی مامە عەزەم فەرماندەی کەرت بوون لەو تیپەی کە من فەرماندەی بووم. لە کۆڕەوەکەدا ساڵح سەرسپی دوو چەکی کلاشینکۆفی لە نزرگەی شێخ سادق لە گوندی سیارە شاردبووەوە، دوو هەفتە پێش ڕاپەڕینەکەی دووەم لەگەڵ ساڵحدا چووین بۆ

گونـدی سـیاره و چـەکەکانمان هێنایـەوە. لەسـەر شـەقامی سـەرەکی نێـوان دەربەنـدیخان و زەرایـەن لـە نزیـك گوندەکە کـانی و ئاوێك هەیە لامانـدا بـۆ پشـودان. لـەو کاتـەدا هەماهـەنگی لـە نێـوان سـوپاو پێشـمەرگەدا هـەبوو. ئەفسـەرێك بـە پلـەی نـەقیب لەگـەڵ چەند سـەربازێك لەسـەر کـانی و ئاوەکە بوون. ساڵحی برادەرم عەرەبیەکی باشی دەزانی بەو هۆیەوە زانیمان نەقیبەکە شـیعەیە و هاوسـۆزە لەگـەڵمان، دەسـتمان کـردە گفتوگـۆ و قسـەو باسـێکی زۆرمان لەگەڵدا کرد و پەیوەندیمان دروست کرد ئەگەر شەڕ دروست بوویەوە ئـەوان تەقە نەکەن و بارەگـای سریەی سـەربازیمان ڕادەسـت بکـەن، بارەگـای سریە لەسەر گردێك بوو نزیك ڕێگەی سەرەکی دەربەنـدیخان – زەڕایەن، لـە نێوان گوندی سیارە و چنارە. نەقیبەکە گوتی هەرچی بە من کرا درێخی ناکـەم هەرچەندە ئـامر سـریەکەمان پلـەی ڕائیـدە و سـوننەیە، بـەڵام قسـەی لەگـەڵ دەکـەم. پێشـتریش مامۆسـتا عـەلی حـاجی فـەرەج دێوانـەیی قسـەی لەگـەڵ نەقیبەکە کردبوو.

لـە (١٧/١٠/١٩٩١) کـە شـەڕ دروسـت بوویـەوە هـەر هێـزە و ڕەبایەیـەکی بـۆ دیـاری کـرا. سـەردار ناوتـاقی دانـرا بـۆ ڕەبایـەکانی سـەر شـاخی گونـدی چـنارە. منیش گوتم ئەچم بۆ ڕەبایەی پشتی سیارە چونکە لەگەڵ نەقیبەکە نهێنیمـان دانـابوو. لەگـەڵ پێشـمەرگەکان چووینـە نزیـك ڕەبایەکـە و بـانگی نەقیبەکـەم کرد و پێمگوت سەرکردەیەکی سیاسیمان بە کاروانێکەوە لێرەوە تێپەڕ دەبێت، بۆ پارێزگاریکردنی ئەو لێپرسراوە فەرمان بە ئێمە کراوە چواردەوری هەموو ڕەبایەکانی ئـەم ناوچـەیە بگـرین. ئـەوانیش هێنـدە بێـزار و بێهێـز و کـەم ورە بـوون بـە هـەموو ڕێکـەوتنێك ڕازی دەبـوون، بـەو مەرجـەی ژیانیـان پـارێزراو بێـت. هەنـدێ حـەزەرم وەرگـرت گـوتم نـەوەك دەسـت بکەنـەوە و کارەسـاتێك بخوڵقێـت و پێشـمەرگە شـەهید بکـەن، خـۆم و سـاڵح سەرسـپی و عوسـمانی

مەحمود فەتاح هەردووکیان عەرەبییان دەزانی و چوونە نێو ڕەبایەکەوە. فەرماندەی سریەکە ڕائیدێك بوو، نەقیبێك و دوو ملازمیش لەوێ بوون و زۆر دەترسان، دڵنیام کردنەوە کە بێ خەم بن و گیانیان پارێزراوە.

کەمە کەمە لە شوێنەکانی دیکەوە گوێمان لە تەقە دەبوو دیاربوو شەڕ دروست بووبوو. بە ڕائیدەکەم گوت بارەگاکەمان ڕادەست بکات ئەویش لە لێپرسینەوەی سەروی خۆی دەترسا، جیهازە بێ تەلەکەی هەڵگرت لەگەڵ فەوج قسە بکات خەت نەبوو تا وەڵامێك وەرگرێت. مەبەستی ڕائیدەکە ئەوەبوو کە هەواڵێك بدا بە سەروی خۆی کە ڕوداوێکی وەها ڕوو ئەدات و ناچارن بارەگای سریە ڕادەستی پێشمەرگە بکەن. لەگەڵ ڕائیدەکە بڕیارمان دا بە سەیارەی مەدەنی نەقیبەکەمان نارد بۆ دەربەندیخان کە وەڵامێك بۆ ڕائیدەکە بگێڕێتەوە، نەقیبەکە ڕۆیشت و پاش چەند خولەکێك گەڕایەوە و گوتی ڕێگە نەبووە بچم بۆ دەربەندیخان بەپێی هەواڵەکان سەربازگەی دەربەندیخان خۆی ڕادەستی پێشمەرگە و جەماوەر کردووە. ئامر سریەکەش بە بێ شەڕ و خوێن ڕشتن بارەگای سریەکەی ڕادەست کردین. منیش هەندێ پارەم پێدان و وەرەقەم بۆ ئەفسەرەکان نووسی بۆ ئەوەی لە سنووری ژێر دەسەڵاتی ئێمەدا دەست نەهێننە ڕێگەیان و بە ڕێزەوە ڕەوانەم کردنەوە.

ڕەبایەکە جیهازێکی بێ تەلی گەورە و دوو هاوەنی تێدابوو، ڕادەستی فەرماندەیی و کاك حامیدی حاجی غالیم کرد. هەروەها چەندین چەك و بڕێکی زۆر ئازەوقەی تێدا بوو ئەوەمان بۆ بارەگای تیپەکەی خۆمان هێشتەوە و دواتر سوودێکی باشمان لێ وەرگرت.

## هەڵبژاردن و دروستکردنی حکومەت

کە حکومەتی عێراق دام و دەزگاکانی لە کوردستان کێشایەوە بۆشاییەکی ئیداری دروست بوو، بەرەی کوردستانی کە حاکم و فەرمانڕەوای کوردستان بوو، بڕیاری دا جۆرێکی نوێ لە بەڕێوەبردن بگرێتەبەر. بۆ ئەم مەبەستە بڕیاری پێکهێنانی پەرلەمانیان دا کە بە شێوەی هەڵبژاردن ئەنجام بدرێت. دواجار لە (١٩٩٢/٥/١٩) یەکەم دەنگدان بۆ پەرلەمانی کوردستا دەستی پێکرد و چەند حیزبێك کێبڕکێیان دەکرد بۆ بردنەوەی زۆربەی ئەندامانی ئەو پەرلەمانە و چوار کەسیش خۆیان کاندید کرد بۆ ڕابەرایەتی هەرێمی کوردستان لەوانە:

مام جەلال تاڵەبانی، کاك مەسعود بەرزانی، دکتۆر مەحمود سۆرانی، مامۆستا مەلا عوسمان عبدالعزیز.

جەماوەر بە جۆش و خرۆشەوە چوونە سەر سندوقەکانی دەنگدان، کە ئەوە بۆ کورد شتێکی نوێ بوو و یەکەم جاریش بوو کورد لە باشوری کوردستان بە ئازادانە بچنە سەر سندوقی دەنگدان و نوێنەری خۆیان هەڵبژێرن. لە ئەنجامدا تەنها یەکێتی و پارتی سەرکەوتن و حکومەتیان لە نێوانی خۆیاندا (٥٠) بە (٥٠) دابەشکرد. بەڵام ئەم حکومەتی پەنجا بە پەنجایە خراپ شکایەوە و لە سەرۆکی پەرلەمانەوە هەتا فەڕاشێکیشی گرتەوە و ئەنجامی دەنگدان بۆ هەڵبژاردنی ڕابەر هیچ کارێکی پێ نەکرا.

لە شاری دەربەندیخان مامۆستا مەلا تاهیر خۆراسانی لەسەر لیستی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو بە ئەندام پەرلەمان. دەنگدان بۆ لیست و قەوارەی حزبی بوو نەك بۆ کەسەکان، حیزبەکانیش لە بەرژەوەندی خۆیان کەسەکانیان ڕیزبەند کردبوو. لە (١٩٩٢/٦/٤) یەکەم دانیشتنی پەرلەمان بە

سەرۆکایەتی جەوهەر نامیق سالم و جێگرەکەی نەژاد ئەحمەد عزیز ئاغا یەکەم کۆبونەوەی خۆی کرد و لە (١٩٩٢/٧/٤) حکومەتی هەرێمی کوردستان بە سەرۆکایەتی دکتۆر فوئاد مەعسوم و جێگرەکەی کە دکتۆر رۆژ نوری شاوەیس بوو، پێکهێنرا، پێکهاتەی حکومەت بەم شێوەیە بوو شەش وەزارەت بۆ یەکێتی و شەش وەزارەت بۆ پارتی و حیزبی شیوعی و بزوتنەوەی ئیسلامی و بزوتنەوەی ئاشورییش هەر یەکەو وەزارەتێکیان وەرگرت، بەڵام بەداخەوە ئەم خۆشیەی دروستبوونی حکومەتی هەرێم ماوەیەکی کەمی خایاند، لە دوای چەند ڕۆژێکی کەم لە پەسەندکردنی بڕیاری فیدڕالی بۆ کوردستان لەلایەن پەرلەمانی کوردستانەوە لە ناوچەیەکی هەرێمی کوردستاندا شەڕی پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK) لەگەڵ حکومەتی هەرێم دروست بوو و دوای ساڵێکیش لە دروستبوونی حکومەتی هەرێم سەرەتاکانی شەڕی ناوخۆ وردە وردە بەدەرکەوتن.



## ئابلۆقەی ئابووری و کاریگەرییەکانی

لە دوای ئەوەی خەڵك لە ئاوارە بوون گەڕایەوە و دەرد و چەرمەسەری زۆریان چەشت، ڕوویان لەو گوند و شار و شارۆچکانە کردەوە کە لە سەردەمی بەعس ڕوخێنرابوون، وەك پێنجوێن، هەڵەبجە، سەیدصادق، قەرەداغ، تەوێڵە ....هتد خەڵکی بۆ گەڕایەوە و ئەو خانوانەی دەستی کاولکارییان پێنەگەیشتبوو هەر زوو لە لایەن خاوەنەکانیانەوە ئاوەدان کرانەوە.

لەبەر ئەوەی بەعس لە کوردستاندا نەمابوو خەڵکەکە ترسیان نەمابوو بە کۆمەڵ هەر یەکە و ڕووی لە شوێنی زێدی خۆی دەکردەوە. ئەو دێهاتانەشی کە لە ساڵی (١٩٧٨) بە ناو پشتێنەی ئەمنی ڕاگوازرابوون، گەڕانەوە شوێنی خۆیان و ئاوەدانیان کردەوە. ئەو دەمە جگە لە ئابلۆقەی ئابووری نێودەوڵەتی لەسەر عێراق، ئابلۆقەی حکومەتی عێراقیش لەسەر کوردستان هەبوو؛ واتە کوردستان دوو گەمارۆی لەسەر بوو. گوزەرانی خەڵك زۆر خراپ بوو هەرچەندە حکومەت و پەرلەمان و دەزگاکانی دیکە دەستبەکار بوون، بەڵام نەیانتوانی باری قورسی سەرشانی خەڵك سووك بکەن. حکومەتی هەرێمیش جگە لە گومرگ هیچ داهاتێکی دیکەی لە بەردەستدا نەبوو و ئەزموونی حکومداریشی کەم بوو.

ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکان و ڕێکخراوە خێرخوازییەکان بە هانای خەڵکەوە هاتن و لە هەندێ شوێن دەستیان بە دروستکردنی خانوو کرد و لە زۆرێك لە لادێکان قوتابخانەیان دروست کرد. لە دروستکردنی نەخۆشخانە و چاککردنی ڕێگاوبان و پرۆژەی ئاو و دابەشکردنی خانووی کابینە درێغییان نەکرد.

ئەوەی کێشەیەکی گەورە بوو لە بەردەم ئاوەدانکردنەوەی لادێکاندا ئەو هەموو لوغم و کەرەستە تەقەمەنیانە بوو کە لە زۆربەی گوند و شارە سنوریەکماندا بە درێژایی شەڕی عێراق – ئێران چێنرابوون، هەروەها لە ترسی پێشمەرگە بە شێوەیەکی هەڕەمەکی لە دەوری مۆڵگە سەربازیەکاندا چێنرابوون. ئەم لوغمانە ژیانی خەڵکی خستبووە مەترسیەوە تا ڕادەیەکیش ئاستەنگی لە ئاوەدانکردنەوەی گوندەکان و دووبارە زیندوو کردنەوەی مەزراکان دروست کردبوو، بە هەزاران کەس بە کارەساتی لوغم یا شەهید بوون یا بەشێکی جەستەیان لە دەستدا.

یەکێك لەو ڕێکخراوە نێونەتەوەییەی تایبەت بە لوغم بوو بە ناوی ڕێکخراوی (MAG) هەر زوو هاتنە کوردستان و تا ئێستاش بەردەوامن و توانیویانە ملیۆنەها دۆنم زەوی لە مین پاك بکەنەوە و ملیۆنەها تەقەمەنیان کۆکردەوە و لە ناویان بردن. جەماوەر ئەوەندە بە تاسەی گەڕانەوە بوون بۆ گوندەکانیان شانیان دایە بەر ژیانێکی سەخت و هەر زوو جێگەی باوباپیرانیان ئاوەدان کردەوە و ئۆردوگا زۆرە ملێکانی ئەوانەی ساڵی (١٩٨٧–١٩٨٨) دروستکرابوون هەندێکیان ڕوخێنران و دار و پەردو و دەرگاو پەنجەرەکانیان بردەو و هەریەکەو لە گوندەکەی خۆی بەکاری دەهێنا.

ئەسر و برایەتی دوو ئۆردوگا بوون لە نزیك یەك دروست کرابوون لە (٨٥٪) خانووەکانیان ڕوخێنران و کەرەستە بیناسازییەکان و عامود و تەل و محاویلەکان لێکرانەوە و بە هاوکاری حکومەت شارە ڕوخێنراو و گوندەکانیان پێ ڕووناك کردەوە. حکومەتی هەرێمیش ئەوەندەی لە توانایدا هەبوو لە ڕێگەی دام و دەزگاکانیەوە هاوکاری دەکردن. کۆچ لە شارەوە بۆ لادێکان بە لێشاو دەستی پێکردەوە، ئیش و کار و بژێوی ژیان بە زۆری لە لادێکانەوە دەستدەکەوت، هەر لە (کشتوکاڵ کردن و بەخێوکردنی مەڕومالات و پەلەوەر و باخداری و ڕاوە ماسی و ...هتد).

ڕۆژ بە ڕۆژ ئابلۆقەی ئابووری لەسەر میللەت توندتر دەبوو و دراوی عێراقی بەهایەکی ئەوتۆی نەمابوو، حکومەتی عێراق لە ناوچەکانی فەرمانڕەوایی خۆی پارەی چاپی دروستکراوی هەبوو کاری پێ دەکرد، بەڵام لە کوردستان هەر دراوە سویسریەکەی پێشووی عێراق بەکاردەهێنرا و کاری پێ دەکرا، دراوی سویسری بەهاکەی زۆر زیاتر بوو لە دراوی چاپی عێراقی.

سنورەکانی ئێران ئاوەڵابوون بەڕووی کوردستاندا و زۆربەی کاڵاکان بە کۆڵ و وڵاخ لە ئێرانەوە داهاتن و بە پێچەوانەشەوە. منیش چوومەوە گوندی سیارە و لەگەڵ منداڵەکان کشتوکاڵمان دەکرد و دەستمان کرد بە بەخێوکردنی ڕەشە وڵاخ و ئاژەڵی وەك مەڕ و بزن و چەند سەرێکیش ڕەشە وڵاخمان هەبوو کە بۆ ئێمە زۆر باش بوون، چونکە کڕینیان ئەوەندە گران بوو کەم کەس دەیتوانی بیانکڕێت. لە گوندەکەمان دەستمان کرد بە دروستکردنی خانوو و هەر ماڵێکیش لە لایەن دەزگای (KRO) کابینەیەکیان پێدان. مووچەی مانگانەکەم کە لە پێشمەرگایەتی وەرمدەگرت یەك فەردە ئاردی نەدەکرد، مەوادی خۆراك گران بوو و ڕۆژ بە ڕۆژیش گرانتر دەبوو، بازاڕ ئازاد بوو حکومەت نەیدەتوانی چاودێری بازار بکات، هەرچەند جاری وا هەبوو دەکەوتە لێپرسینەوە لە دوکاندارەکان بۆ ئەوەی نرخ دا ببەزێنن، بەڵام خاوەن دوکانەکان مەوادەکیان دەشاردەوە و بە نهێنی بە نرخێکی گرانتر دەیانفرۆشت. گرانیی بازاڕ هەتا سەرەتای (١٩٩٧) بەردەوام بوو. ئەم نرخانەی لێردا دەینوسم کۆتا نرخی گرانیبوو بە دراوی سویسری:

(١٠٠) دۆلاری ئەمریکی بەرامبەر (٩٥٠٠) دیناری عێراقی چاپی سویسری، بۆ ماوەکیش گەیشتە (٩٧٠٠) دیناری چاپی سویسری.

یەك دیناری عێراقی چاپی سویسری بەرامبەر (٣) تمەنی ئێرانی

١ کغم ئارد (١٣) دیناری چاپی سویسری بوو

١ کغم گۆشت (١٢٠) دیناری چاپی سویسری بوو

١ كغم ڕۆنی ڤیتا (٨٠ بۆ ١٠٠) دیناری چاپی سویسری بوو

١ كغم برنج (٣٠) دیناری چاپی سویسری بوو

١ كغم فاسۆلیا (٣٥) دیناری چاپی سویسری بوو

١ كیس ئارد (٧٥٠ بۆ ١٠٠٠) دیناری چاپی سویسری بوو

١ كاتژمێر زەوی كێڵان بە تراكتۆر (١٢٠) دیناری چاپی سویسری بوو

١ دەبەی (٢٠) لیتری گاز (١٢٠) دیناری چاپی سویسری بوو

ڕۆژانەی ئیشی كرێكارێك (٣٥ بۆ ٥٠) دیناری چاپی سویسری بوو

موچەی مامۆستایەك (٥٠٠ بۆ ١٠٠٠) دیناری چاپی سویسری بوو

مووچە ئەوەندە بێ نرخ بوو خەریك بوو وەك نەبووی لێبێت و بەشی هیچی نەدەكرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەرگای یەك قوتابخانە دانەخرا و بەهۆی كەمی یا نەبوونی مووچە یەك مامۆستا بایكۆتی دەوامی نەكرد، چونكە میللەت دەیزانی حكومەت ساوایە و داهاتی وەهای لەبەر دەستدا نیە تا بتوانێ واجباتی سەرشانی خۆی جێبەجێ بكات. خەڵكەكەش ئەوەندە دڵی خۆش بوو بە حكومەتە كوردستانیەكەی خۆی ئامادەیی هەموو قوربانیەك بوو لە پێناویدا. لەگەڵ ئەوەشدا هەرچیەكت ببوایەو پارەی بكردایە دەفرۆشرا. وڵاتی ئێران و بازرگانەكان سەریان كردە هەرێمەكە و هەرچی مەوادی ئاسن و مەوادی كارگە لە كار كەوتوەكان و شۆفڵ و ئۆتۆمبێلی گەورە هەبوو كڕییان و ئاودیوی ئێرانیان كرد. هەندێ لە لێپرسراوە حیزبیەكانیش لەگەڵ بازرگانەكان دەستیان تێكەڵ كرد و زۆربەی كەلوپەلی كارگەكانیان فرۆشت و پارەكەیان لە تەنكەی باخەڵیان نا. لە بری ئەوەی هەوڵ بدەن كارگەكان سەرلەنوێ بەگەڕ بخەنەوە و بۆ ئاوەدان كردنەوەی كوردستان كەڵكی لێوەربگرن لە بەرژەوەندی خۆیان ئاودیویان دەكرد و تاڵان فرۆشیان دەكرد.

## دەستبەکاربوونم لە مەڵبەندی دووی کەرکووک

کاتێك حکومەتی هەرێمی کوردستان دەستبەکار بوو، کاك مستەفا چاوڕەش بوو بە پارێزگاری کەرکوك و دامودەزگای پارێزگاکەیان لە دەربەندیخان دانا. مەڵبەندی (٢)ی کەرکوکی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانیش هەر لە دەربەندیخان دانرا. کاك مستەفا بانگی کردم گوتی تۆ تەمەنت زۆرە حەز دەکەم ببیت بە لێپرسراوی پێشمەرگەکانی مەڵبەند و سەرپەرشتییان بکەیت و لە دنیەکەی خۆیشت دوورناکەویتەوە و ئەوەندەش ماندوو نابیت ئەگەر بچیتە نێو سوپای یەکگرتووەوە، لەوەی لە شوێنێکی دوور دەوامت هەبێت کە بۆ تۆ زەحمەتە. لەو کاتەدا زوو زوو کاك موستەفام دەبینی وەك لە لاپەڕەکانی پێشوودا باسی کاك مستەفام کردووە و لە ساڵی (١٩٦٥)وە دەیناسم و وەك فەرماندەیەك و سەرکردەیەك حەقی بەسەرمەوەیە و پیاوی ڕۆژە سەختەکانە و جێگە دەستی لە هەر سێ شۆڕشەکی کورددا دیارە، بە تایبەتی لە شۆڕشی نوێدا بە ڕابەرایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و بە ئازایی و خەباتی خۆی پلەکانی پێشمەرگایەتی بڕیوە، هەرچەندە غەدریشی لێکراوە. کاك مستەفا بەرامبەر ئەو پێشمەرگانەی کە لە شۆڕشەکاندا پێکەوە بوون زۆر بەوەفایە و هەمیشە لە پەیوەندیدایە لە تەکیانداو ئەوەی پێی کرابێت بۆ بەرژەوەندی ئەوان کەمتەرخەمی نەکردووە.

کاتێك لە مەڵبەند دەوامم دەکرد لە هەر شوێنێ یەکێتی پێویستی پێم بوایە ئامادە دەبووم، بەڵام لە ساڵی (١٩٩٢) بۆ شەڕی پارتی کرێکاران لەگەڵ عەلە ڕەش ئامادە نەبووین ئەو شەڕە بکەین. کاتێك سەری مانگ چووین بۆ موچەکانمان گوتیان موچەتان ڕاگیراوە لەبەر ئەوەی بەشداری شەڕتان نەکردووە. لەگەڵ عەلە ڕەش توڕە بووین و بە توندی وەڵاممان دانەوە، کاك

شێخ جەعفەر لە جەماعەتی مووچە تووڕە بوو پێی گوتن مووچەیان بدەنێ ئەو دوو پیاوە هەموو تەمەنیان لە پێشمەرگایەتیدا بەسەر بردووە و مافی خۆیانە مووچەکەیان بۆ ببەینەماڵەوە هەرچەندە کەمیشە.



مام دەروێش                مستەفا چاوڕەش

## دیسانەوە پشت شکاندن

لێپرسراوی پێشمەرگەکانی مەڵبەندی (٢) کەرکوکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بووم لە دەربەندیخان. دەوامی زۆر نەبوو لەبەر ئەوەی مووچە کەم بوو ژیان بەرەبەرە سەختتر دەبوو. ئەو کاتانەی دەرفەتم ببوایە لە گوندەکەی خۆمان خەریکی ئیش و کار دەبووم. خەڵك هیوایەکی گەورەی بە حکومەتەکەی هەبوو و دڵخۆش بوون بەوەی کە هەموو لایەنەکان تەبان و پێکەوە ئەزموونی حکومڕانی بۆ پێشەوە دەبەن. جەماوەری ستەمدیدەی کوردستان دوای ئەو هەموو نەهامەتیەی بە سەریدا هات چاوەڕوان بوون ئاهێکیان بە بەردا بێتەوە و بۆ هەتا هەتایە دەنگی تەقە بەر گوێیان نەکەوێت مەگەر لەسەر سنورەکان، ئەویش بۆ بەرگری بێت لە ئەزموونەکەمان. خەڵکی کوردستان چاوەڕوان بوون هەموو لایەنەکان بە یەك دەنگ نەفرەت لە شەڕی برا کوژی بکەن و بیری شەڕی خۆکوژی بۆ هەتاهەتایە لە گۆڕ بنێن. چاوەڕوان بوون سەرکردەکانمان ئەزمونیان لە شەڕی پشت شکاندنی یەکتری وەرگرتبێت و هەرگیز بیری لێ نەکەنەوە، چاوەڕوان بوون دەست لە نێو دەستی یەك بنێن و حکومەتە ساوەکەیان کە خەونی لە مێژینەیان بووە برینی چەندین ساڵەیانی پێ تیمار بکەن و دایکی جگەر سوتاو و منداڵی هەتیوی پێ دڵ خۆش بکەن، بەڵام بە داخەوە هەر جارەی لە شوێنێك و هەر جارەی بە بیانویەکی بێ مانا بڵێسەی شەڕی ناوخۆیان تاو دەداو سەرەنجام وڵاتەکەمانی خەڵتانی خوێن کراو هەرچی داهاتی وڵات بوو بە ئاشی شەڕی ناوخۆدا کرا و ڕۆڵەکانی ئەم گەلە ستەم دیدەیە جارێکی دیکە ڕووبەڕووی شەڕێکی خوێناوی و بێ مانا کرایەوە و بە سەدەها و بگرە زیاتریش لە کەپکی حەمەد ئاغا و سماقوڵی و کانی قرژاڵە و گردی گۆ خوێنیان ڕژا. من بۆ

خۆیشـم لـەو شـەڕە قێزەونـەی تێیکـەوتین جـارێکی دیکـەش لای شـانەدەری لەشەڕی ناوخۆدا بریندار کرام.

ئەو داهاتانەی کە لە گومرگ پەیدا دەکرا و قوتی میللەت بوون کران بە گەرووی شەڕەکەدا و ڕۆژانـە تـەرمی پێشـمەرگەی قارەمـان لـە سەرتاسـەری کوردستان دەهاتەوە بۆ دایك و باوکی جگەر سوتاو.

شەڕی نـاوخۆ ئەوەنـدە درێـژەی کێشا سوپای دراوسێکان دەستێوەردانیان تێداکرد، پـارتی دیمکراتـی کوردسـتان لـە (١٩٩٦/٨/٣١) بـە پشـتیوانی سـوپای عـێراق چـوونە نێـو شـاری هـەولێر، ناچـار هێزەکـانی یـەکێتی نیشـتمانی بـۆ سـەرلەنوێ ڕێکخسـتنەوەی هێزەکانیـان پاشەکشـەیان کـرد بـۆ ناوچـە سـەر سنورییەکان.

ئـەم بـارو زروفـەی شـەڕی نـاوخۆ زۆر دڵگرانـی کردبـووم. دوای ئـەوەی هێزەکانی یەکێتی لە شارەکان پاشەکشەیان کـرد منیش بۆ دورکەوتنەوە لەو وەزعە هەندێك کشتوکاڵم لە چەمی (قوشەلیان)[1] کردبوو، کە لە چەمێکی قوڵدا بوو و دوورە دەست بوو لەوێ خۆم پەنهان دا. لەبەر ئەوەی دانیشتوانی گوندەکـەمان خـەڵکێکی بـاش بـوون و زۆربـەیان سـەر بـە یـەکێتی نیشـتمانی بوون کەس زمانی لێ نەدام و خۆم بە کشتوکاڵ کردنەوە خەریك کـرد. کاتێك هێزەکانی یەکێتی گەڕانەوە و هێزەکانی پارتی تێك شکێنرا منیش گەڕامەوە سەر کارەکەی خۆم لە مەڵبەند.

زۆر باس لە شەڕی ناوخۆ کراوە و زۆری لەسەر نوسـراوە زۆری لـە بارەوە گوتراوە بـەڵام ئـەوەی من دەمـەوێ بیڵێم ئەوەیە کە شەڕی نـاوخۆ زۆرتـرینی کاتـەکانی شـۆڕش و توانـای هێـزی پێشـمەرکەی کوردسـتانی بـەفیڕۆ داوە و

---

[1] چەمی قوشەلیان لە نێوان سیارەو عازەباندایە.

زۆرترین زیانی بە دۆزە ڕەواکەی میللەتی کورد گەیاندووە. کاك نەوشیروان لە کتێبی (پەنجەکان یەکتر دەشکێنن) لەبارەی شەڕی ناخۆوە جوانی نووسیوە، بەڕاستی براکان یەکتر دەکوژن، پشتی یەکتر دەشکێنن، ئەزموون و حکومەتەکەمان لە ناو دەبەن.

ئومێدەوارم ڕووداوەکانی شەڕی ناوخۆ پۆلێن بکرێن و بخرێنە بەر دیدی خوێنەران و نەوەی داهاتوو، تا ببێتە پەند و ئامۆژگاری بۆ ئەوەی چیتر ئەو ڕووداوە تاڵانە دووبارە نەبێتەوە و بۆ هەتا هەتایە لە گۆڕ بنرێن و بخرێنە نێو زبڵدانی مێژووەوە.

## نەوت بەرامبەر خۆراك

لە ساڵ (١٩٩٦) بژێوی خەڵك زۆر خراپ بوو گرانی تەنگی بە خەڵك هەڵچنیبوو، خەڵك هەموو هەوڵێکی دەدا بۆ ئەوەی ژەمە خۆراکی ڕۆژانەی خێزانەکەی مسۆگەر بکات. خەڵکی هەرچی کەلوپەلی نێو ماڵی هەبوو هەمووی فرۆشت. لە لادێکان تا ڕادەیەك گوزەرانکردن باشتر بوو چونکە گوندنشینەکان گەنم و جۆ و تەماتەو و بامێ و سەوزەیان دەکرد و ئاژەڵیان بەخێو دەکرد و بەشی ماڵ و منداڵی خۆیان لێ مسۆگەر دەکرد و زیادەکەشیان لێ دەفرۆشتەوە بۆ پێداویستییەکانی دیکەی ژیان، بەڵام لە شارەکان خەڵك بە زۆری مووچە خۆر بوون و مووچەی مانگانەیان بەشی فەردەیەك ئاردی نەدەکرد ناچار کەتبوونە فرۆشتنی کەلوپەلی نێوماڵ. کار گەیشتە ئەوەی خاوەن ماڵ دەرگا و پەنجەرەی ژوورەکانی دەردەهێنا و دەیفرۆشت. زۆرێك لە خێزانەکان بە کوڕ و کچ و پیر و گەنجەوە دەچوون بە

دوای دەڕاسەوە و گوڵەچنەیان دەکرد و گوڵی کەوتووی دوای دەڕاسەیان کۆدەکردەوە و لەماڵەوە دەیانکوتا، جاری وا بەو حاڵەوە خاوەن گەنمەکەش دەچوو بە گژیاندا، زۆر پیاوی خواناس و مەردیش هەبوو کە خاوەنی گەنم و دانەوێڵە بوون قۆڵی مەردانەیان لێ هەڵدەماڵی و درێخیان نەکرد لە یارمەتیدانی خەڵکە هەژارەکە. خاوەن ئاشەکان دەیانگێڕایەوە کە خەڵك هاتووە بەری گسکی هاڕیوە و بە ناچاری خواردوویانە.

لە سەرەتای ساڵی (١٩٩٦)دا بە تەواوی گرانیی خەڵکی هەراسان کرد و نرخی خۆراك لە لوتکەی بەرزیدا بوو. دواتر لە (١٩٩٦/٦/٢٠) عێراق لەگەڵ ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری ژمارە (٩٨٦) ئیمزا کرد کە لە بڕیارەکەدا هاتبوو عێراق لە ژێر چاوەدێری نەتەوە یەکگرتووەکاندا بڕێك نەوت بفرۆشێت و بە پارەکەی خۆراك و پێداویستەیکان بۆ گەلەکەی بکڕێت. لە (١٩٩٦/١٢/١١) یەکەم کاروانی نەوتی عێراق ڕەوانەی بازاڕەکانی جیهان کرا و لە مانگی (٣)ی (١٩٩٧) یەکەم کاروانی خۆراك گەیشتە هەرێمی کوردستان و لە ڕێگەی بریکارەکانەوە دابەشکرا، کە بریتیبوو لە ئارد، برنج، نیسك، نۆك، فاسۆلیا، ڕۆن، دۆشاوی تەماتە، سابون و تایت، شەکر و چا، شیری منداڵ. بە ڕێکوپێکی و بێ دواکەوتن دابەش دەکرا. بەو بڕیارە عێراق و هەرێمی کوردستان ئاهێکی وەبەردا هاتەوە و خەڵك کەمێك بوژایەوە، بڕیاری ژمارە (٩٨٦) هەر خۆراك نەبوو لە بورای ئاوەدانیشەوە ڕۆڵێکی باشی هەبوو، ئەوە یەکەم جار بوو نەوتی عێراق بۆ میللەتەکەی سەرف بکرێت، هەرچەندە بە فیڕۆدانێکی زۆر لە داهاتەکە دەکرا لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، بەڵام گەلی عێراقی لە برسێتی ڕزگار کرد. بە پارەی نەوت بەرامبەر بەخۆراك چەندین قوتابخانەو نەخۆشخانە دروست کرا و لە بورای پرۆژەی ئاو و دروستکردنی ڕێگاوبان و کارەبا بۆ گوندەکانیش ڕۆڵێکی باشی هەبوو.

دوا بە دوای ئەوەی خەڵك ئاهێكی بە بەردا هاتەوە، لە دوای چەندین جەولەی شەڕی ناوخۆی نێوان پارتی و یەكێتی وردە وردە شەڕ بەرەو كۆتایی دەچوو، ئەوەبوو لەسەر دەستی ئەمەریكا و بە نیۆبژی وەزیری دەرەوەی ئەمریكا (مادلێن ئۆلبرایت) لە (١٩٩٨/٩/٨) تاڵەبانی و بەرزانی ڕێكەوتنی نێوانیان ئیمزا كرد و شەڕ بە كردەیی لە نێوانیان ڕاگیرا و بەڕەسمی هەرێمی كوردستان كرا بە دوو ئیدارە و هەر یەكەو حكومەتی خۆی پێك هێنا و دێگەڵە بوو بە سنور نێوان هەردوولا و هەریەكەیان بەجیا فەرمانڕەوایی ناوچەی خۆیی دەكرد و ناونران زۆنی سەوز و زۆنی زەرد. ئەمەش نیگەرانی جەماوەر و وڵاتە دۆستەكانی لێكەوتەوەو دەبوایە ئەوانیش لەگەڵ دوو ئیدارەدا سەودا و مامەڵەیان بكردایە، كە ئەمەش بۆ ناوبانگی هەرێمی كوردستان باش نەبوو. هەرچۆنێك بوو دۆخەكە تا ساڵی (٢٠٠٣) بە بێ شەڕ درێژەی كێشا، ئیتر لێدانی ڕژێمی عێراق هاتە ئاراوەوە و ڕووخانی دەسەڵاتی سیاسی سەدام حسەینی بۆ هەتاهەتایە لەناوبرد.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم تیشكێك بخەمە سەر ئاوەدانكردنەوەی گوندەكان و بوژاندنەوەی كەرتی كشتوكاڵی.

دوای گەڕانەوەی خەڵك لە ئاوارەیی كۆڕەوەكەی كورد، جۆرێك لە متمانە لای خەڵك دروست بوو كە هەوڵ بدەن بۆ بژێوی ژیانی خۆیان و منداڵەكانیان بگەڕێنەوە بۆ گوندەكانیان و سەرلەنوێ ئاوەدانیان بكەنەوە، بۆیە زۆرێك لە خەڵكی گوندەكان ڕوویان لە گوندەكانیان كردەوە و سەرلەنوێ بنەمایەكی ئابووریيان بۆ خۆیان دامەزراندەوە و دەستیان كردەوە بە كشتوكاڵ و بەخێوكردنی مەڕوماڵات و پەلەوەر، تا ئەو رادەیەی جگە لە پێویستی خۆیان بەشی شارەكانیشیان بەرهەم دەهێناو بۆ فرۆشتنەوەی دەیانناردە شارەكانەوە.

دوای پرۆسەی رزگارکردنی عێراق و دروستبوونی حکومەتێکی نوێی عێراقی دەستوورێکی نوێ بۆ عێراق داڕێژراو لەو دەستوورەدا رێژەی لە ١٧٪ لە بودجەی عێراق بۆ هەرێمی کوردستان تەرخان کرا، بەڵام بەداخەوە بێ ئەزموونی حکومەتی کوردستان و ململانێی حزبایەتی نەتوانرا پلانێکی تۆکمە بۆ ژێرخانی ئابووری کوردستان لەسەر بنەمای بوژاندنەوەی بواری کشتوکاڵی دابڕێژرێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەهۆی زۆری پارەکە بۆ کڕینی لایەنگر کەوتنە دامەزراندنی بەلێشاوی خەڵك لە دامەزراوە حکومی و حزبییەکان، بەمەش کۆچی پێچەوانە لە لادێوە بۆ شار دەستی پێکردەوە و بواری بوژاندنەوەی کەرتی کشتوکاڵی بە جۆرێك هەرەسی هێنا کە ئێستا باجەکەی دەدەین. ئەگەر لەسەرەتاوە ئەو بوودجە زەبەلاحە بۆ کەرتی کشتوکاڵی و بەرهەمهێنان تەرخان بکرایە ئێستا خاوەنی حکومەتێکی خاوەن ئابووری بەهێز دەبووین و لەبری ئەوەی شتومەك لە وڵاتانی دراوسێوە بهێنین دەمانتوانی پشت بە کەرتی کشتوکاڵی ناوخۆیی ببەستین و بگرە دەمانتوانی بازاڕەکانی عێراقیش بە بەرهەمی کوردستان ئاوەدان بکەینەوە. بەداخەوە نەشارەزایی لە ئیدارەدانی هەرێم بۆ خەرجی ئەو بوودجە زۆرە ئیتر دەرگا ئاوەڵا بوو بۆ بازرگانەکانی حزب کە دواتر دروستبوونی گەندەڵی لێکەوتەوە و تەشەنەی کرد بۆ هەموو جومگەکانی ژیان.

# قۆناغی شەشەم

## ڕوخانی دەسەڵاتی بەعس

پێش ئەوەی هێزی هاوپەیمانان بە سەرۆکایەتی ئەمەریکا پەلاماری عێراق بدات، پەڕلەمانی کوردستان کۆبووەوە و کەشێکی ئاشتی لە نێوان یەکێتی و پارتی هاتە ئاراوە، هێزە بەرهەڵستکارەکانی عێراقیش لە کۆبوونەوەی بەردەوامدا بوون بۆ یەکخستنی هەڵوێستیان بەرامبەر ئەو ڕووداوانەی دێن پێش.

هێزی هاوپەیمانان لە کەنداوی عەرەبی لە ئامادەباشیدا بوون، لە کوردستانیش لە ڕووی سەربازییەوە هەندێ جموجوڵی بچوک دەکرا. کۆبوونەوەی بەرهەڵستکارانی عێراق لە سەلاحەدین دەستی بە کارەکانی کرد و هێزەکانی هاوپەیمانانیش پەلاماری عێراقیان دا و سوپای عێراق لە چەند ڕۆژی یەکەمدا هەندێ بەرگریان کرد، بەڵام سەرەنجام بە تەفروتوناکردنی خۆیان کۆتاییان پێهات. دواجار لە (٢٠٠٣/٤/٩) هێزەکانی ئەمەریکا گەیشتنە بەغدادی پایتەخت و کۆتاییان بە حوکمی (٣٥) ساڵەی بەعس هێنا. هاوکات لە کوردستانیشەوە بە هەماهەنگی هێزەکانی هاوپەیمانان لەگەڵ هێزی پێشمەرگەی کوردستاندا پەلاماری کەرکوک و ناوچە کوردستانیەکانی ژێر دەستی ڕژێم درا.

## ئازادکردنی خانەقین

هێزێکی زۆر لە کەلار کۆکرایەوە، منیش لەگەڵ عەلی و هەردی کوڕم و حاجی فەلاح علی سیارەیی و سدیق محەمەد کەوزەیناڵ ناسراو بە (سدیق سیاسی) و برایم کەریم پیروەیس سیارەیی و چەند پێشمەرگەیەك ئامادە بووین، کە کاك مەلا بەختیار سەرپەرشتی بەرەکەی دەکرد و هەندێك ئەمەریکی و بیانی لە سەرباز و رۆژنامەنووسی لەگەڵدا بوو. ئەفسەرەکان جیهازیان پێبوو بەردەوام لە پەیوەندیدا بوون لەگەڵ هێزی ئاسمانی خۆیان.

ئەفسەرێکیان پرسیاری پێشمەرگە بە تەمەنەکانی لە کاك بەختیار کرد، ئێمە هەمووبمان لە دەوریان ڕاوەستابووین کاك بەختیار ناوی هەندێکیانی برد ناوی منی نەبرد، منیش گوتم کاك بەختیار کاتێ من پێشمەرگە بووم ئەو کەسەی تۆ ناوت برد تەمەنی (٨) ساڵ بووە. یەکێك لە بیانیەکان پرسیاری لە مەلا بەختیار کرد کەی دەچنە نێو خانەقین، ئەویش لە وەڵامدا گوتی کەمی ماوە. وەرگێڕەکە هەموو قسەکانی دەکرد بە کوردی و بە پێچەوانەشەوە، منیش ڕووم کرد ئەمریکیەکە و گوتم سبەنێ نانی نیوەڕۆ لە نێو خانەقیندا دەخۆین. ئەمریکیەکە گوتی چۆن دەزانی! گوتم بە فڕۆکەکانی خۆتانا دەزانم. گوتی چۆن؟ گوتم بە نزمی و بەبێ خەم بەسەر خانەقیندا دەسوڕێنەوە، کەواتە هیچ بەرگرییەك نەماوە. ئەمرکیەکە گوتی هەقە ئەم بە تەمەنانە کە ئەزمونی شەڕیان هەیە وانەی کرداری بە خوێنکارەکان بڵێنەوە. هەر وایش دەرچوو بۆ ڕۆژی دوایی خانەقین ئازاد کرا و نانی نیوەڕۆمان لەو شارە خوارد. پێش ئەوەی بچینە نێو شارەوە کاك بەختیار هێزەکانی دابەش کرد و هەر هێزە و بۆ دام و دەزگایەکی دانا بۆ ئەوەی دەستی کاولکاری

نەیانگاتێ. بە شێوەیەکی ڕێکوپێك هێزەکان چوونە نێو شار و بەرگریەکی زۆر کەم کرا و هەر هێزە و شوێنی خۆی گرت و بیناو دام و دەزگاکانیان پاراست. بە پێویستی دەزانم لێرەدا باسی چەند بەسەرهاتێك بکەم کە من و مەلا بەختیاری پێکەوە بەستووەتەوە.

سێ مانگ دەبوو لە هاتنە دەرەوەم بۆ پێشمەرگایەتی، بۆ یەکەم جار و لە یەك کاتدا بە دوو ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی و کۆمەڵە ئاشنا بووم، ئەویش کاك مەلا بەختیار و کاك مستەفا چاو ڕەش بوو. کاك مستەفا لە شەستەکانەوە و لە نزیکەوە یەکتریمان دەناسی، بەڵام لەگەڵ مەلا بەختیار ئەوە یەکەم جار بوو لە نزیکەوە بیبینم. لە سەروو گوندی بەڵخەی قەرەداغ زۆربەی زۆری پێشمەرگەکانی هەرێمی (٥) لەوێ بووین، کە مەلا بەختیار بۆ دەستنیشانکردنی بەرپرسی هەرێمی (٥) کاك مستەفا چاوڕەشی پێ ناساندین و پاشان کۆبوونەوەی پێکردین و ئەم بابەتەم لە لاپەڕەکانی پێشوودا باس کردووە. بەڵام ئەوەی لێرەدا ئەمەوێت باسی بکەم ڕۆڵی مەلا بەختیارە لە شۆڕشی نوێی گەلەکەمان ئەوەندەی کە من ئاگاداری بم.

مەلا بەختیار لە دروستبوونی کۆمەڵەوە پەیوەندی کردووە و ئەندامێکی کارابووە لە ناوچەی خانەقین و دەوروبەریدا و ڕۆڵێکی کاریگەریشی هەبوو لە هەستانەوەی شۆڕشی نوێ، دەتوانم بڵێم پێشمەرگە خانەقینیەکان شوێن دەستیان لە نێو ڕیزەکانی یەکێتیدا دیارە.

مەلا بەختیار لە چەند وێستگەیەکدا فەرماندە و لێپرسراوم بووە، ئەگەرچی جار هەبووە لەفکردا هاوڕا نەبووین، بەڵام هەردووکمان عەودالی سەرفرازی کوردستان و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بووین. چەندجارێك لە کۆبونەوەکاندا بە ئازادی پرسیاری خۆمم لێ کردووە و جاریش هەبووە

پرسیارەکانم دڵبریندارکەر بووە، ئەگەر لەو کاتەدا پرسیارەکانم لە دڵیشی دابێت، بەڵام لە دڵی نەگرتووە و بە ڕوویدا نەداومەتەوە. کاتێکیش لێپرسراوی مەڵبەندی یەك بوو سنوری ئەو تیپەی کە من تێیدا پێشمەرگە بووم تیپی (٥٥)ی قەرەداغ بوو کە سەر بەو مەڵبەندەی ئەو بوو. دەمەوێت شایەتی ئەوە بدەم کە ڕێگری کرد لە شەڕێکی خوێناوی لە نێوان حیزبی شیوعی و یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا، کۆبوونەوەی بە هێزەکانی یەکێتی کرد لە گوندێك لە بناری شارەزوور پێی ڕاگەیاندین کە شەڕی حیزبی شیوعی نەکەین، لە بابەتێکی پێشتردا ئەم ڕووداوەم گێڕاوەتەوە بۆیە باسی ناکەمەوە، تەنها باسی ئەو شتانە دەکەم کە لەو کاتەدا باسم نەکردوون. پرسیام کرد گوتم کاك بەختیار هێزەکانی حیزبی شیوعی لە لایەن یەکێتیەوە ئابلۆقە دراون و دەزگای ڕاگەیاندنی هەردوو لا ئاگری لێ دەبارێت ئیتر ئێمە چۆن دڵنیایی بدەینە هەردوو هێزەکە کە شەڕ ڕوو نەدات؟ مەلا بەختیار گوتی مام دەروێش من دەمەوێت فیلێك بە بازارێکی شوشەدا بەرم و لاشەی فیلەکە بەر شوشەکان نەکەوێت کە هارە بکەنە خوارەوە و هەمووی بشکێت. سەرەنجام توانی ئەو کارە بکات و ڕێگری لە شەڕی ئێمەو حزبی شیوعی کرد.

کاتێك (٢٠٠٣) خانەقین بە تەواوی ئازاد کرا، مەلا بەختیار کارەکانی خۆی گواستەوە بۆ نێو شاری خانەقین و زۆر بە هێمنانە سەرپەرشتی نەهێشتنی سیاسەتی تەعریبکردنی کرد لەو ناوچەیەدا، بەبێ ئەوەی دڵۆپێك خوێن لە لوتی کەسێکەوە بێت. هەموو ئەو عەرەبانەی بە سیاسەتی بەعس بۆ بە عەرەبکردنی ناوچەکە هاتبوون گەڕاندنیانەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان و ڕێگری لە هەڵگیرسانی شەڕی نێوان عەرەب و کورد کرد و هەلی نەدا بە دەستەوە تا کێشەکان گەورە ببێت و ڕاگەیاندنی ناوچەکە و جیهان بۆ مەرامی

خۆیان بیکەن بە هەرا. لەگەڵ عەشایەرە عەرەبەکان قسەی کرد و پێی گوتن خانەقین خاکی کوردستانە بە هەموو یاسا و ڕێسایەك مافی ئێوە نیە بمێننەوە و خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکە گەڕاونەتەوە شوێنەکانی خۆیان و باخ و بێستان و دێهاتەکانیان ئاوەدان دەکەنەوە، مەلا بەختیار بە هەماهەنگی لەگەڵ ئیدارەی پارێزگای دیالەدا توانی زۆربەی هەرەزۆری فەرمانگەکان بەڕێوبەری کوردیان بۆ دابنرێت.

جارێکی تر مۆرکی کوردایەتی بە تەواوی گەڕێندرایەوە بۆ خانەقین. دیارە مەلا بەختیار بە هاوکاری هاوڕێکانی و پاڵپشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئەو کارە چاکانەی کرد بەڵام هەڵسوڕێنەری یەکەم خۆی بووە، ئەتوانین بڵێین مەلا بەختیار ئەندازیاری نەهێشتنی تەعریب بوو بە ئاشتی لەو ناوچەیەدا. کورد توانی هێندە پێگەی خۆی لەو دەڤەرە قایم بکات کە بتوانێ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی پارێزگای دیالە و قایمقامیەتی خانەقین و بەڕێوەبەری ناحیەی مەندەلی و جەلەولا و قەرەتەپە بۆ کورد مسۆگەر بکات، بەڵام بە داخەوە لە دوای (١٦/١٠/٢٠١٧) جارێکی دیکە سوپای عێراق گەڕایەوە بۆ ئەو سنورانەی کە پێش (٢٠٠٣) پێشمەرگەی تیابوو. هەرچەندە پیشمەرگە لە ناوچەکەدا نیە بەڵام ئێساش کورد لەو ناوچانەدا هەر سەنگی خۆی هەیە و کەسێتی مەلا بەختیار کاریگەری خۆی هەیە لە ڕوداوەکانی خانەقین و ناوچەکەدا.



حاکم قادر حەمەجان      مام دەروێش      مەلا بەختیار



دوو سەربازی ئەمریکی      مام دەروێش

## بزوتنەوەی گۆڕان و کاك نەوشیروان

ساڵی (١٩٧٩) بۆ یەکەم جار کاك نەوشیروانم لە نزیکەوە بینی. هەرچەند پێشتریش دور بە دوور یەکترمان دەناسی، بەڵام ئەمجارەیان لە ناوزەنگ تەواو پێی ئاشنا بووم. هەر لە یەکەم بینینمەوە کاك نەوشیروان تەواو سەرنجی ڕاکێشام، پیاوێکی سیاسی خوێندەوار، ڕۆشنبیر، بەوەفا، دەستپاك و بە ڕەوشت، هەموو ئەم خەسڵەتانەی تێدا بەدی دەکرا. بە درێژایی شۆڕشی نوێ چەند جارێك بە دیداری شاد بووم و هەموو کات بە تایبەتی ئەحواڵی پرسیوم.

کاك نەوشیروان بەردەوام لە سەردەمی شاخ و لە سەردەمی حکومڕانی نێو شاریشدا زۆر مەبەستی بوو چاکسازی بکات و ڕیزەکانی یەکێتی لە گەندەڵکاران پاك بکاتەوە، بەڵام کۆسپی گەورە دەهاتە ڕێگەی. پاش ئەوەی لەنێو یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا نەیتوانی بەرنامە چاکسازییەکەی بخاتە بواری جێبەجێکردنەوە. دواجار لە ساڵی (٢٠٠٩) بزوتنەوەی گۆڕانی پێکهێناو بە لیستێکی جیا بەشداری دەنگدانی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کرد و توانی دەنگێکی زۆر بە دەست بهێنێت و ببێتە دووەم لیستی براوەی کوردستان.

جەماوەری کوردستان بەتایبەت دەڤەری سلێمانی لەبەر ئەوەی لە نزیکەوە ئەم پیاوەیان دەناسی و لە سەردەمی شاخیشدا توانیبووی وەك کاریزمایەك لەنێو هێزی پێشمەرگە و خەڵکی ناوچەکەدا بناسرێت، کە ئەم پاڵنەرانە بوونە پاڵپشتێکی بەهێزی بزوتنەوەی گۆڕان بۆ بەدەستهێنانی ئەو ڕێژەیەی دەنگدان، بەڵام بارو زروفی ناوچەکە و باری تەندروستی خۆی ئەو هەلەی هەر بۆ ڕێکنەخست کە بتوانێ ئاواتەکانی بهێنێتە دی. من بۆ خۆیشم هەموو کات لەگەڵ چاکسازیدا بووم و ڕقم لە کەسی گەندەڵ و گیرفان پڕکەر دەبووەوە بۆیە لەگەڵ ئەو بەرنامەیەی بزوتنەوەی گۆڕاندا هاوڕابووم و

هاوكاريشم دەكردن، بەڵام بە داخەوە لە كاتێكدا تینوانی دادپەروەری لە چاوەڕوانی كاك نەوشیرواندا بوون تا كەشتی عەدالەت بگەیەنێتە كەناری ئارام، لە ناكاودا مەرگی كاك نەوشیروان هەموومانی تاساند، ئەو سەركردە مەزنە ئەو ڕابەرە خۆشەویستە لە (٢٠١٧/٥/١٩) كۆچی دوایی كرد بە هەزارەها لە جەماوەری كوردستان خۆڕسكانە و بە چاوی فرمێسكەوە ئامادەی مەراسیمی بەخاك سپاردنی بوون.

منێكی نەخوێندەوار ناتوانم بە وردی لەسەر خەباتی سیاسی كاك نەوشیروان بنووسم بۆیە ئەو لایەنە بۆ خەڵكی پسپۆڕ و بە توانا جێی دەهێڵم كە بتوانێ بە ئەندازەی سەنگی خۆی مافی بداتێ، چونكە ئەم پیاوە هێندە قاڵبووی سیاسەت و مێژوو بووە كە دەكرێ خوێندكارە سەركەوتووەكان، قۆناغەكانی ژیانی بە وردی دیراسە بكەن و شەهادەی ماستەر و دكتۆرای لەسەر وەرگرن.




مام دەروێش نەوشیروان مستەفا هەردی مام دەروێش

## لە کۆتاییدا...
## چەند دێڕێکی کەم بۆ خێزان و منداڵەکانم

من هەر خۆم دەردیسەریم نەچەشت، بەڵکو منداڵەکانیشم بە هۆی منەوە گەلێك زەحمەتیان بینی. خێزانێکی تا ڕادەیەك قەرەباڵغ بووین و خەرجیی ڕۆژانەمان گران بوو، بەڕێکردنی بژێوی ماڵێکی لەم جۆرە بە درێژایی سێ شۆڕشی یەك لەدوای یەك گەلێك زەحمەت بوو. بەهۆی منەوە منداڵەکان نەیانتوانی وەك منداڵانی خەڵکی دیکە لە خوێندن و خۆشییەکانی ژیان بەردەوام بن، چونکە لەنێو شاردا بمانایەتەوە وەك چۆن پێشتر گیران و ڕاپێچی زیندان کران بە هەمان شێوە دەبوو ڕووبەڕووی زیندان و گرتن و ڕاوەدوونان بوونایەتەوە و ڕۆژانە چاوەڕوانی مەرگ بوونایە. بەهێی خێزانم زۆر ئازا و گورج و گۆڵ بوو شانی دایە بەر بەخێوکردنی منداڵەکان. بە هاوکاری منداڵەکان بە کشتوکاڵ کردن و بەخێوکردنی ڕەشە وڵاخ ژیانی خۆیان بەڕێوە دەبرد و گەر منیش دەرفەتم هەبوایە هاوکاریم دەکردن.

هەموو کات خۆم بە قەرزاری بەهێ و منداڵەکان دەزانم گەر توانایی و پاڵپشتی و لێبوردەیی ئەوان نەبووایە هەرگیز نەمدەمتوانی بۆ چەندین ساڵ بە بەردەوامی پێشمەرگایەتی بکەم و خەمی ماڵم نەبێت، دیارە ئەو ئازایەتییە بە گشتی هی خانەوادەکە بووە بە تایبەت هی بەهێی خێزانم بووە، جار هەبوو چەند مانگ لێیانەوە دوور بووم و هەواڵم نەدەزانین. هەرگیز ڕۆژێك دەردە دڵی خۆیان نەدەکرد بە پێچەوانەوە ئەوان خەمی منیان بووە.

لە ساڵانی دوایدا شاخەوانی کوڕم و سیڤانی کچم هەلیان بۆ ڕێکەوت و توانیان زانکۆ تەواو بکەن. لە ڕێگەی ئەم نوسینەوە داوا لە بەهێ و منداڵەکانم دەکەم گەردنم ئازاد بکەن و لێم ببورن، کە بەهۆی بیرو بۆچوونی منەوە زۆر زەحمەتیان بینی. دیارە ئەوانیش دەیانزانی بیرو بۆچوونی من بۆ

سـەرفرازی ئـەوان و میللەتەکەیانـە و ڕۆژێـك دێـت شـانازی بـە خـەباتی نەپسـاوەی سـەرۆکی خێزانەکەیانـەوە بکـەن. زۆر سوپاسـیان دەکـەم ئـەو دەرفەتەیان بۆ من ڕەخسان و گوێیان بە خۆشییەکانی ژیانی خۆیان نەدا لە پێناو بیرو بۆچوونەکانی باوکیاندا. ئێستا ئاسودەم ئەوندەی کە توانیم بۆ نیشتیمانەکەم درێخیم نەکرد و تا ئێستا لە هەموو ڕوویەکەوە بە سەربەرزی و بە پاکی و بە دڵسۆزییەوە بیرو بۆچوونەکانم بگەنمە کەناری ئارام، کاتێك دەبینم خەڵك ڕێزم دەگرن ئەوەندەی تر ئاسودە دەبم.

**پێناسەی زیندانی سیاسی خانەوادەی مام دەروێش**



## چەند وتەیەك، پێویستە باسی بکەم

دوای سەردەمی شاخیش هەمیشە لە خەمی دەوروبەری خۆمدا کەمتەرخەم نەبووم و چەندم پێ کرابێت هەوڵی خۆمم داوە. کاتێك چووینەوە بۆ گوندەکەمان و دەستمان کرد بە ئاوەدانکرنەوەی، پێویستیمان بە خزمەتگوزاری هەبوو. لەگەڵ خەڵکی ئاواییدا زۆر هەوڵم دا بۆ دابینکردنی پڕۆژەی ئاو و ڕاکێشانی تەزووی کارەبا و کردنەوەی قوتابخانە، کە سەردانی دەزگاکانی حکومەتم دەکرد، ڕێزیان لێ دەگرتم و ئیشەکانیان بۆ ڕایی دەکردم، کاتێکیش حکومەتی هەرێم باری دارایی باش بوو، چوومە لای شێخ سەرداری شێخ قادری شێخ تەها، بۆ ئەوەی ڕێگای ئاواییەکەمان بۆ قیرتاو بکات، لەو کاتەدا دکتۆر بەرهەم ئەحمەد ساڵح سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بوو، شێخ سەردار ڕەزامەندی بۆ وەرگرتین و جادەی قیریان بۆ هێناین.

خەڵکێکی زۆریش داوایان لێ دەکردم کە پشتگیریان بکەم بۆ دامەزراندن یا بۆ خانەنشین کردن بە پێی توانای خۆم پشتگیریم کردون و بۆ خانەنشین کردنی پێشمەرگایەتیش ئەوانەی پێشمەرگە بوون پشتگیریم دەکردن، لەوانەیە کەسانێك گلەییان لێ کردبم کە پشتگیری پێشمەرگایەتیم بۆ نەکردوون، داوای لێبوردنیان لێ دەکەم بەڵام ئەوەم بە کارێکی گەندەڵی و بە هەدەردانی دارایی حکومەت زانیوە کە کەسێك پێشمەرگە نەبووبێت و ئێستا بەناوی پێشمەرگەوە خانەنشین بکرێت.

لە ساڵی (١٩٨٤) کاتێك یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و حکومەتی بەغدا لە گفتوگۆدا بوون یەکێتی نیشتیمانی لە ڕێگەی لیژنەیەکەوە زەوی بەینی کانی سارد و دەربەندیخانیان دابەشکرد بەسەر پێشمەرگە و خانەوادەی شەهیدان بەرامبەر بە برە پارەیکی ڕەمزی، کاتێك گفتوگۆ تێکچوو و هەموو

دێهاتەکان بارکران، خاوەن زەوییەکان بێهیوا بوون. کاتێك حکومەتی هەرێمی کوردستان دروست بوو باری ئابوری هاوڵاتیان باش بوو خاوەن زەوییەکان هاتنە لام کە ببم بە نوێنەریان و زەویەکانیان بۆ ساغ بکەمەوە. بۆ ئەم مەبەستە چەندجارێك چوومە هەولێر بۆ لای کاك عیماد ئەحمەد کە ئەو کاتە جێگری سەرۆکی حکومەت بوو، زۆر هاوکاری کردم و بە بڕیارێك زەوییەکانی گێڕایەوە بۆ خاوەنەکانیان.

# بۆ باوکی پێشمەرگەم

**علی مام دەروێش**

**باوکە گیان**

ئێستا تۆ لە گوندی سیارە لە دوا ئارامگای خۆتیت، ئەو گوندەی هەمیشە داکۆکیکاری بەرژەوەندیەکانی بوویت، جۆش داماوم نازانم چۆن و بە چ شێوەیەك شتێك بنووسم شایستەی گەورەیی و خەبات و تێکۆشانی نەپساوەی تۆ بێت، نازانم لە کوێوە دەست پێ بکەم لە کوێدا کۆتایی پێ بهێنم، بەلام هەرچۆنێك بێت ئاوێك بە دەرونی گڕگرتوومدا دەکەم و فرمێسکەکانی چاوم دەسڕم و ئەم چەند دێڕە دەنووسم.

**باوکە گیان**

ساڵی (١٩٧٤) تەمەنم تەنها دوو مانگ بوو بە کۆڵی دایکمەوە لەگەڵ گوڵاڵەی خوشکم ئاوارەی ئۆردوگاکانی ئێران بووین، ئەو کاتە تۆ لە سەرتیز و زۆزك پێشمەرگە بوویت بەرگریت لە میللەت و نەتەوە و لە نیشتیمانێك دەکرد کە کورد و کوردستان بوو.

**باوکە گیان**

وەك خەو بە بیرم دا دێت، کە تۆ پێشمەرگەی شۆڕشی نوێ بوویت و دوژمن بە هەموو توانایەکیەوە بە شوێنتا دەگەڕا، تەنانەت کە بە نهێنی دەهاتیت بۆ سەردانمان لە شوێنی تایبەتدا دەمایتەوە، دیار بوو خۆت لە ئێمەی منداڵیش هەر دەپاراست نەبادا لە نێو منداڵانی ئاواییدا باست بکەین و هاتنەوەکەت ئاشکرا ببێت و ژیانی خۆت و ئێمەش بکەوێتە مەترسییەوە.

**باوکە گیان**

کاتێك سەرباز و جاش دەهاتە گوندەکەمان و هەموو خەڵکی ئاواییان کۆ دەکردەوە، لەبەر ئەوەی تۆ پێشمەرگە بوویت و بەرگریت لە نیشتمان دەکرد، ئەوان من و دایکم و گوڵاڵە و ئەڵوەن و هەردیان سواری ئیڤای سەربازی دەکرد و لە زیندان توندیان دەکردین.

**باوکە گیان**

کاتێك چووی بۆ ناو زەنگ ئێمە لە زیندان بووین، لە گەڕانەوەتدا لە سەردەشت کەلوپەلت بۆ کڕیبووین و لای پێشمەرگەکان گوتبووت بەڵکو هەتا دەڕۆینەوە منداڵەکانم ئازاد کرابن و ئەم دیارییانەیان بۆ دەبەمەوە. لە ڕێگەدا تووشی شەڕێکی سەخت دەبیت، سەرەڕای ئەو هەموو زەحمەت و مەترسیە خەمی دیارییەکانی ئێمەت بووە، کاتێك لە زیندان بەربووین بەو دیارییانەت گەلێك خۆشحاڵت کردین.

**باوکە گیان**

هەم خۆت و هەم ماڵ و منداڵت زەحمەتێکی زۆرمان بینی، هەمیشە ماڵەکەتت بەکۆڵەوە بوو لەم گوند بۆ ئەو گوند لەم ماڵ بۆ ئەو ماڵ، بەڵام تۆ هێندە پشتت بە پەروەردگار و باوەڕەکەت قایم بوو، ڕۆژ بە ڕۆژ ورەت بەرزتر دەبووەوە، ساڵ نەبووە تۆ بریندار نەبیت، کاتێك بۆ دواجار لەسەر تەختەشۆری مردن پاڵخرای هەموو ئەندامەکانی لەشت شوێنی برینی گوللەی پێوەبوو، لەو کاتەدا زۆر هەستم بە سەر بەرزی کرد کە تۆی پێشمەرگە باوکی منی.

**باوکە گیان**

کاتێك ماڵمان لە ئەشکەوتی کاریەلی بوو لە گوندی باوەخۆشێن، مەگەر هەر خودای گەورە خۆی بزانێت چەندە ژیانمان ناڕەحەت و مەترسیدار بوو، بەڵام بە دەنگێکی کزۆڵەو پڕ لە حەسرەتەوە گووتت ئەم هەموو ژیانە ناڕەحەتە کە تووشی ئێوە بووە بە بۆنەی منەوە بووە و منیش بە بۆنەی کوردستانەوە. گەردنم ئازاد بکەن کە قوتابخانەتان فەوتا، زیندانی کران و لە هەموو خۆشیەکی ژیان بێ بەش بوون. حەزم دەکرد ئێوەش لە خۆشترین ماڵ و لە خۆشترین ژیاندا بوونایە، بەڵام ئەوەی دەیکەم بۆ پاشەڕۆژی ڕۆڵەکانی ئێوەو میللەتەکەمە.

لە بیرمە ماڵەکەمان لە جێی یاری منداڵان، ڕومانە و گوللە ئاربیجی و فیشەکی تێدا بوو، شەوگاری زستانمان لەبەر چرایەکی نەوتدا بەسەر دەبرد، شەوگاری هاوینمان لەبەر مانگە شەو بەسەر دەبرد لەبەر ئەوەی نەمان دەوێرا لەبەر تۆپباران چرا داگیرسێنین.

**باوکە گیان**

لەگەڵ دایکم و منداڵەکان لە پێناوی نیشتماندا و لە پێناو مافی زەوتکراوی میلەتەکەماندا باڵی پەپولەیمان دەسوتا. لە زیندان بوین دایکم چوار منداڵی بەخێو دەکرد بۆ جارێکیش گوێم لێ نەبوو گلەیت لێ بکات وە یا سەرزەنشتت بکات ئای دایکە گیان تۆ چەن گەورە بوویت. دایکم زۆر کوێرەوەری چەشت زەحمەتی زۆری کێشا جەرگی سوتا بە بەرچاویەوە منداڵەکانی ناسۆری زۆریان بینی بەڵام قەت یەخەی نەگرتی و لە خەبات ساردت بکاتەوە.

زۆر لـه هاوڕێكانـت پێیـان دەگـوتی خێـزان و منداڵـەكانت زینـدان بـوون بۆچی مووچـەیەكیان بـۆ نـەكراوە، یـا زەوییـەكیان وەرنـەگرتووە؟ لـە ڕاسـتیدا دەتزانی زوڵمیان لێكراوە، بەڵام لە وەڵامـدا دەتگـوت پێم شـەرمە لـە پاش ئـەو هـەموو ماندووبوونـەمان لـە دەرگـای لێپرسـراوێكدا بووەسـتم. هـەتا پێـت نـاخۆش بـوو داوای مـافێكی ڕەوای خۆیشـت بكـەیت، دەتگـوت بـەم شـێوەیەی ئێستام لەبەردەم خودا و گەلەكەمدا سەربەرزم و ئەو خەباتەی كردوومـە بـە ماڵی دنیای ناگۆڕمەوە.

باوكە گیان

كاتێك لـە پرۆسـەی ئـەنفال هـیچ ماڵێكمـان بـۆ دەرنـەچوو لـە خانویـەكدا بـووین سـەرباری ئـەوەی گـەورەترین مـەترسـیمان لەسـەر بـوو مـاڵێكی ڕەش و ڕووت هیچ پێداویستییەكی ژیانی تێدا نەبوو، نە ڕاخەر و نە پێخەف نـە قاپ و قاچاخ، خواردنەكـەت بـۆ دەكردینـە سـەر نـان و بـە دەسـت دەمـانخوارد، بـەڵام ئامـادە نـەبوویت داوای هاوكـاری لەكـەس بكـەیت. لـە پـای ئـەو هـەموو نارەحەتیـە هـەرگیز منـەتت بەسـەر كەسـدا نـەدەكرد و هەمیشـە دەتگـوت ئەركێكی نیشتیمانیی خۆمم بەجێ هێناوە.

باوكە گیان

ئێمەی منداڵەكانت، گوڵاڵە، ئەڵوەن، هەردی، شاخەوان، كـوردە و سیڤان هەموومان شانازی دەكەین كە تۆی سەروەر، تۆی پێشمەرگە، تـۆی خەباتگێڕ باوكمان بوویت. سەربەرزین و شانازیت پێوە دەكەین كە ئێستا لەپای پاكی و خەمخۆریت بۆ گەل و نیشتمان خەڵك تۆیان خۆشدەوێت.

## باوکە گیان

خزمان و هاوڕێ و هاوسەنگەرانت دەیانزانی تۆ چەند ماندووبویت لە شۆڕشـــدا، بۆیـــە هەمیشـــە لـــە یادەوەرییەکانیانـــدا باســـی جـــوامێری و مێرخاسییەکانی تـۆ دەکـەن کـە ئەمـە بـۆ ئێمـە مایـەی شانازی و گـەورەترین سـەرمایەیە. لـە هـەموو کـات و سـاتە سـەختەکاندا پـەروەردگارت لـە یـاد نەکردووە و بەردەوام چۆن بۆ میللەت و نەتەوەکەت دڵسۆز بوویت بە هەمان شێوە نوێژ و ڕۆژو و ئەرکەکانی ئیمانیشت بەجێ هێناوە و هەمیشە پشتیوان بـە پـەروەردگار کارەکانـت بـەجێ گەیانـدووە. هەمیشـە سـوور بـووی لەسـەر ئەوەی ئێمەش نوێژ بکەین و ڕۆژو بگرین و دەستپاك و بەڕەوشت بین و بۆ هـەموو کارێـك ڕوو لـە خـودا بـین، کـاتێکیش بـە جێتهێشـتین و بـەرەو دوا مەنزڵگـەی ژیـان بـۆ بارەگـای خـودا گەڕایتـەوە بـە سـەربەرزی و بـە زمـانی بەڕۆژووەوە ماڵئاوایت لێکردین.

## باوکە گیان

هەرچەندە قەدەری پەروەردگار گەڕانەوەی نیە و مردن سوننەتی ژیانە، بـەڵام حـەزمان دەکـرد ماوەیـەکی دیکـە لامـان بوویتایـە تـا لەسـەر جـێ لـە خزمەتکردنی تۆدا بووینایە. مردنەکەشت کتوپڕ بوو، دڵ بە ئازارم کە ئێستا لەنێوماندا نیت، بەڵام شادمانم کەسێکی وەك تۆ باوکم بووە، کە بە مانای وشە پێشمەرگە بوویت، بە مانای وشە دەستپاك و بە ڕەوشت بویت، بە مانای وشـە دینـدار و بـەوەفا بوویـت. لەگـەڵ خوشـك و براکـانم و خانەوادەکـەمان بڕیارمانـداوە هەمیشـە وەك چۆن فـێرت کـردووین بـەردەوام لەبـەرەی گـەل و جێگەی ڕەزامەندی تۆدا بین، ڕۆحت شادو ئاسودە بێت و بە بەهەشتی بـەرینی پەروەردگار شاد بێت.

**باوكە گیان**

دەزانـم زۆر هیوایـەتت بـوو بیرەوەریـەكانت لـە دووتـوێی كتێبێكـدا كـۆ بكەیتەوە، تا خۆت مابوویت پێكەوە زۆر خەریك بووین، ئەوا ئێستا سوپاس بـۆ خـودای گـەورە بـە هاوكـاری دۆسـتان و هـاوڕێ و هاوسـەنگەرەكانت بـە تایبەتی برای بەڕێز كاك شێخ عەلی عازەبانی كە زۆر ماندوو بووە و هەر لەو كاتەی كە هێشتا خۆت لە ژیاندا مابوویت و ئێستاش بە هەمان گوڕو تین بگـرە زیـاترش هـەوڵی بەجێگەیانـدنی ئاواتەكـەی تۆیـەتی و خۆشـبەختانە بیرەوەریەكانت كۆكراوەتـەوە و پشـت بـە خـودا بـە چاپی دەگەیـەنین، خۆزگـە خۆت لە ژیاندا بوویتایە و بە دەستی خۆت پێشكەشی هاوڕێكانت بكردایە.



# چەند تێکستێکی هاوڕێیانی دەروێش ساڵح

## دەروێش ساڵح، دەروێش بوو بۆ کوردستان

**مستەفا چاورەش (٢٠١٨)**



ناسینی من بۆ مام دەروێش دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوو، پێکەوە پێشمەرگە بووین لەڕیزەکانی حیزبی شیوعی لە ئەوبەری سیروان و دەربەندیخان و قەرەداخ.

کە من چووم ئەو پێشتر لەوێ بوو.پاش ماوەیەك من گواسترامەوە بۆ گەلاڵەو حاجی ئۆمەران، بەڵام مام دەروێش لە سنوری لقی (١٠) مایەوە کە پیاوێکی عەرەب سەرلقیان بوو پێیان ئەگوت ئەبو عەلی. دەروێش ساڵح لەبەر ئەوەی پێشمەرگەیەکی ئازا و قارەمان لێهاتوو بوو هەر زوو جێگەی خۆی کردەوە لە ناو هاوڕێکانیدا، بەو توانایەی کەهەیبوو درێخی لە خەبات نەدەکرد. لە هەموو قۆناغەکانی ژیانیدا لە ریزی میللەتەکەی بووە و لە بەرەی گەلدا بووە، بەبێ ئەوەی هیچ دەستکەوتێکی تایبەتی بۆ خۆی هەبووبێت، پاشتر لە شۆڕشی ئەیلوولیش لە بەرەی شەڕی (سەرتیز) جارێکی دیکە مام دەروێشم بینییەوە هەر پێشمەرگەبوو.

کاتێك شۆڕشی نوێ بە رابەرایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان

هەڵگیرسایەوەو بەرەبەرە دەستەی پێشمەرگە رووی لە شاخ کرد و هەرێمەکان دیاری کران، سیروان تاڵەبانی بە فەرماندەی هەرێمی پێنج دیاری کرا تا ساڵی (١٩٧٩) بەداخەوە لەو ساڵەدا سیروان تاڵەبانی لە شارەزوور شەهید کراو ماوەیەك بوو هەرێمەکە بێ فەرماندە مابوویەوە. بە بڕیاری سەرکردایەتی نێردرام بۆ قەرەداغ و بووم بە فەرماندەی هەرێمەکە، کە گەشتمە قەرەداغ بۆ جاری سێیەم مام دەروێشم بینی پێشمەرگە بوو واتە؛ بۆ سێهەم جار لە سێ شۆڕشی جیاوازدا بەیەك شادبووینەوە. شایانی باسە لەو کاتەدا عەلە رەش، شێخ جەعفەر، مام ڕۆستەم، سامان گەرمیانی، مەحموود سەنگاوی، سەلامی کوێخا عزیز،ساڵحی کوێخا عزیز، سەردار ناوتاقی و گۆران تلەزەیتی... هتد لەوێ پێشمەرگە بوون.

مام دەروێش پێشمەرگەیەکی ئازابوو هەتا ئەو کاتەی لە قەرەداخ بووم سەردەستەی دەستەکەی خۆم بوو لەگەڵ خۆمدا بەشداری زۆربەی ئەو چالاکیانەی کردووە کە لەو دەڤەرەدا روویانداوە.

جارێکیان لەگەڵ دەستەکەیدا لە رێی (دەربەندیخان- سلێمانی) لە نێوان بیرکێ و سیارەدا بۆسەیەکیان دانابوو ئیڤایەکی سەربازی کەوتبووە بۆسەکەوە و لێیان دابوون و کوژرا و برینداریان لێ خستبوون، لەو کاتەدا قەمەرەیەکی تایبەت هاتبوو پێشمەرگەکانی بینیبوو ویستبووی بگەڕێتەوە و دەربازی ببێت بەڵام پێشمەرگەکان تەقەیان لێکردبوو، سەیارەکە پەکی کەوتبوو، کە چووبوونە سەر سەیارەکە لێپرسراوێکی رێکخراویی حیزبی بەعسی تێدابوو بە پلەی (ڕەفیق)، گرتبوویان و لەگەڵ خۆیاندا هێنایان بۆ قەرەداخ لەگەڵ کاك حەمە قاشتی ڕادەستیان کردین. ئەو چالاکییە دوابەدوای ئەوە بوو کە ماوەیەکی زۆر کەم بەسەر شەهید کردنی دکتۆر چیا تێپەڕیبوو لە زەڕایەن، کە کادیرێکی بەرزی دەڤەری قەرەداخ بوو. ئەو چالاکییە لە

کوردستان و ناوچەکەدا دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو.

جارێکی دیکەش بانگ کرام بۆ ناوزەنگ بۆ کۆبونەوەی سەرکردایەتی، لەگەڵ ئەو هێزەی کە ڕۆیشتین مام دەروێشمان لەگەڵ بوو. لە گەڕانەوەماندا لە سەردەشت هەندێ کەلوپەل و پێداویستی خۆمانمان کڕی و بە دیوی عێراقدا گەڕاینەوە، لە گاپیلۆن تووشی کەمینێکی سوپای عێراق بووین، بە زەحمەت دوای چەند کاتژمێرێکی شەڕ نەجاتمان بوو، مام دەروێش ڕۆڵێکی قارەمانانەی هەبوو لە تێکشکاندنی بۆسەکەدا کە بۆمان دانرابوو.

کاتێک کە ئەم قسانە تۆمار ئەکەم لەبارەی مام دەروێشەوە، ئەوە ئازایەتی و قارەمانی و لێهاتوویی خۆیەتی کە من شاهیدی بۆ دەدەم، کە هەموو تەمەنی لە پێناو گەلەکەیدا سەرف کردووە. لە هەموو ئەو ماوە درێژەی خەباتیدا هەرگیز بە خەیاڵیدا نەهاتووە کە بچوکترین زیان بە شۆڕش بگەیەنێت.

هەڵدەگرێت زۆر شت لە بارەی مام دەروێشەوە بڵێین، بەڵام جێی دەهێڵین بۆ خۆی و هاوخەباتەکانی لەبەر ئەوەی خەریکی نوسینەوەی بیرەوەرییەکانیەتی، هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازم.

## مام دەروێش، پێشمەرگەیەکی بە ئەزموون

سەلامی کوێخا عزیز (٢٠١٨)



تەمەنم نۆ ساڵ دەبوو خاڵۆ فەرەجم و کاکە ساڵحم و عەلە ڕەش پێشمەرگەی حیزبی شیوعی بوون، زۆر جار لە ناوچەی ئێمە چالاکی سیاسی و پێشمەرگایەتیان دەکرد و دەهاتنە ماڵی ئێمەو بەنهێنی دەمانەوە.

یەك لەو کەسانەی کە لەگەڵیاندابوو مام دەروێش ساڵح بوو. مام ساڵح پیاوێکی دەست پاك و دەم پاك و بەڕەوشت بوو، بۆیە هەر زوو بووە جێی متمانەی خەڵکی ناوچەکە. جارێکیان لەگەڵ کاکە ساڵحم چوون بۆ ڕاو مام دەروێش هازی هێنابوو، لەگەڵ دایکم بووبە کێشەیان لەسەر چۆنیەتی لێنانی، دیار بوو لای ئەوان واتە؛ لە سیارە بە شێوەکی دیکە لێدەنرا.

مام دەروێش لە هەر شۆڕشێکدا پێشمەرگایەتی کردووە، ئایدۆلۆژیای شۆڕشەکە هەرچییەك بووبێت ئەم لایەنە ئیمانداریيەکەی خۆی پاراستووەو بەردەوام نوێژی دەکرد و لە ڕەمەزانیشدا بەڕۆژو دەبوو.

دوای نسکۆ جارێکی دیکە ڕوومان لە شاخ کردەوەو بووینە پێشمەرگە لە ناوچەی قەرەداخ، پاش ماوەیەکی کەم مام دەروێش وەك پێشمەرگە پەیوەندی پێوە کردین، چونکە پێشتر لەنێو شاردا پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە کردبوو. کە هاتە دەرەوە ئێمە زۆرمان پێ خۆشبوو،

چونکە ئەزموونێکی باشی پێشمەرگایەتی هەبوو لە دێهاتەکانیشدا ناسراوی باشی هەبوو. لەبەر ئەوەی لە شۆڕشەکانی پێشوودا پێشمەرگە بووە، دەمانزانی زۆر سوود لە پلان و بیرو بۆچوونەکانی وەردەگرین. ئەو کات تەمەنی هەڵکشابوو لە عەقڵدا کامڵ بوو پەیوەندی لەگەڵ خەڵکی ناوچەکەدا زۆر باش بوو چونکە دەیزانی چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکات بۆیە هەرکاتێك لە جەولەکاندا مام دەروێشمان لەگەڵدا بوایە بەختەوەر دەبووین، بەڕاستی پیاوێکی سەنگین و نەفس بەرز بوو. لە شەڕدا زۆر ئازا بوو، چەند جارێك برینداربووە. هەمیشە بە قسە خۆشەکانی تین و وزەی پێدەبەخشین. یەکەم جار ساڵی (١٩٧٩) کە کاك مستەفا چاوڕەش هەرێمی قەرەداخی ڕێکخستەوە مام ساڵحی کردە فەرماندەی دەستەکەی خۆی.

دوای ماوەیەکی کەم لە هاتنە دەرەوەی ڕێنوێنی و چاوساغی کردین بۆ چالاکییەك لە کەمپی خوارو لە دەربەندیخان، مامۆستا (جەلالی حاجی شێخ تۆفیق)یشمان لەگەڵدابوو، چالاکییەکەمان بەسەرکەوتوویی ئەنجام داو دەستکەوتیشمان تەنها دەمانچەیەك بوو، لەبەر ئەوەی شوێنەکە لەڕووی سەربازییەوە شوێنێکی ئاسان نەبوو زۆر بەزەحمەت توانیمان چالاکییەکە ئەنجام بدەین، خۆشبەختانە دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو. حکومەت چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد پێشمەرگە بتوانێت بێتە کەمپی خوار لەبەر ئەوەی بە چواردەوریدا چەند سەربازگەیەك هەبوو، رووباری سیروانیش لەبەردەمیدا بوو، مام دەروێش لەو چالاکییەدا ڕۆڵی سەرەکی هەبوو.

لە کۆتایی هەشتاکاندا مام دەروێش کرا بە فەرماندەی کەرت، لەبەر ئەوەی ئەو کاتە ماڵی لە گوندی باوەخۆشێن بوو ئەرکی لەو سنوورە پێدرابوو بەڕاستی ڕۆڵێکی باشی هەبوو لە پاراستنی دەروازەی قەرەداخ لە قۆڵی هەردوو گوندی چەمەرگە و باوەخۆشێن.

## مام دەروێشەکەی سیارە

**مام رۆستەم (٢٠٢٠)**



مـــام دەروێـــش لەوەتـــەی مـــن ناسیومە پیـاوێکی زۆر دڵسـۆز و ئـازا و خۆشەویست بووە، زۆریش ورە بـەرز و بـــووە. لـــە زۆربـــەی چـــالاکییەکانی پێشـمەرگایەتیدا شـوێنە سـەختەکانی بۆخۆی دادەنا، دەچووینە هەر گوندێك بـە قسـە خۆشـەکانی ورەی خەڵکەکـەی بەرز دەکردەوە.

پیـــاوێکی دەســـتپاك و داوێنپـــاك بـــوو. هەمیشـــە جێگـــەی متمانـــەی پێشـــمەرگەو فەرمانـــدەکان و خـــەڵکی ناوچـــەکە بـــووە. مـــن بۆخـــۆم زۆرم خۆشدەویســـت و متمانـــەی تـــەواوم پێـــی هـــەبوو، چـــونکە هـــەر کاتێـــك مـــام دەروێشت لەگەڵدا بوایە هەستت دەکـرد پیـاوێکی گـەورەو ئـازات لەگەڵدایـە، هێندە پشتت پێی قایم بوو گەر ئەو کەسایەتییەت لەگەڵدا بووایە هەستت بە سەرکەوتن دەکرد چونکە هێندە ورە بەرز بوو.

زۆر بەداخـەوە وەك پێویسـت ئاگایـان لـەو پیـاوە گـەورەو ئازایـە نـەبوو، دەبـوو خۆشـترین ژیـانی هەبووایـە لـەپای ئـەو هـەموو دڵسـۆزی و خەباتـە دانەبڕاوەی، بەڵام بـە داخـەوە لای ئێمـە حورمـەتی پێشمەرگە دێرینـەکان وەك پێویست ناگیرێت، کە دەمرێ پاشان بە شان و باڵیدا هەڵدەدەین.

مـام دەروێش جێگەی فەخرو شانازی هەموومان بـوو... هیوادارم خوای گەورە بە بەهەشتی بەرینی شاد بکات.

## مام دەروێش پێشمەرگەیەکی ئازا و قسە خۆش
## محەمەد ڕەشید (حەمە قاشتی) (٢٠١٨)



بەهاری ساڵی (١٩٧٩) بوو. کۆمەڵێک پێشمەرگە لە گوندی بەلەکجاری قەرەداخ بووین لە ناکاو مام دەروێش ساڵح و ساڵحی ئەولکەریمە سوور پەیدابوون و پەیوەندیان پێوەکردین زۆر خۆشحاڵ بووین و گوتمان دەستەکەمان دەستەیەکی ساڵحە.

پێشتریش ساڵحی کوێخا عەزیز پەیوەندی پێوە کردبووین. هەرچەند مام دەروێش بەتەمەن بوو ئێمەش گەنج بووین، بەڵام لەبەر ئەوەی هەستی نەتەوایەتی زۆر بەهێز بوو، نیشتمان پەروەر بوو هەرگیز ماندوو بوونی پێوە دیارنەبوو، لە ڕێکردندا زۆر لە پێشمەرگە لاوەکان بەتواناتر بوو، ئەگەر ئێمەمانان بمانتوانیایە (١٠) کاژێر ڕێ بکەین ئەو دەیتوانی دوازدە بۆ پازدە کاژێر ڕێ بکات.

لەگەڵ مام دەروێش زەمەنێکی زۆر پێکەوە بووین چ لەدەستەکاندا یان کەرت و تیپەکاندا، زۆر یادەوەری خۆش و ناخۆشمان دیووە، لەچەندین چالاکیدا پێکەوە بووین، پێشمەرگەیەکی بە ورەو قارەمان بوو هەمیشە لە شەڕەکاندا ورەی بە هاوسەنگەرانی دەبەخشی و ترسی دەخستە نێو دڵی دوژمنەکانیەوە. مام دەروێش بە واتای وشە شۆڕشگێڕ بوو، ئامادەی هەموو

فیداکارییەك بوو میللەت و نەتەوەکی و بۆ یەکێتی نیشتیمانی کوردستان.

کۆتایی ساڵی (١٩٨١) بوو لە گوندی دوکانی قەرەداغ لە لایەن هەرێمی پێنجەوە تفەنگێکی ڕەشاش بڕنەومان وەرگرتبوو بۆ مەفرەزەکەمان، ئەو کاتە مام دەروێش فەرماندەی مەفرەزە بوو منیش جێگری بووم. هەر ئەو ڕۆژەی ڕەشاشەکەمان وەرگرت بۆ بەیانییەکەی لە گوندی دوکان بەرەو گوندی دەربەن فەقەرە بەڕێکەوتین، پشوویەکمان داو بەرەو گوندی شەممە دەرۆشتین. دوو دوو نێوانمان سەد مەتر دەبوو، مام دەروێش بانگی کرد گوتی: محەمەد (بیگەیەنە)، هەرکاتێك شتێك ڕووی بدایە فەرماندەکە دەیگوت بیگەیەنە ئیتر هەموو پێشمەرگەکان هەریەکە بەوەی پێشی خۆی دەگوت، منیش بەو پێشمەرگەی پێشی خۆم گوت لە دار و شەخسەکە بوەستن نیشمان هەیە. هەموو مەفرەزەکە پانزە کەس دەبووین مام دەروێش هات گوتی: برادەرینە لەبەر ئەوەی ڕەشاشێکمان وەرگرتووە لە ئەمڕۆ بە دواوە دەبێت شەڕی پارتیزانی بگۆڕین بۆ شەڕی بەرەیی (جەبهە)، بە ڕاستی ئەو گوتانەی ئەوەندەی دیکە ورە و هێزی پێ بەخشین. مام دەروێش هەرخۆی بە تەنها ماندوو نەبوو بەڵکو خێزان و منداڵەکانیشی زۆر زەحمەت و دەربەدەرییان بینیوە و چەند جارێکیش لە لایەن دەسەڵاتی بەعسەوە دەستگیر کراوان.

مام دەروێش زۆر زوو هات و بەردەوامی بە خەباتەکەی داو بۆ تەنها ساتێکیش لەو خەبات و تێکۆشانەی دانەبڕا، وەکو بیستوومە ساڵی (١٩٦١)یش بەشداری شەڕی تونەیلی دەربەندیخانی کردووە، کە من ڕێك لەو ساڵەدا لە دایکبووم، بەڵام ئەو لەو کاتەدا لە گەرمەی خەبات و تێکۆشاندا بووەو هەتا ئێستاش کە ئەم خەباتە دەگێڕمەوە مام دەروێش هەر بەردەوامە لە ئەرك و دڵسۆزی بۆ نیشتمان و نەتەوەتەکەی، وەك چۆن پێشتر و لە هەموو

سەردەمەکاندا هەر کاتە و بە شێوازی سەردەمەکە خەبات و تێکۆشانی کردووە. نووسین و باسکردن لەسەر مام دەروێش زۆر هەڵدەگرێت، بەڵام لێرەدا ناکرێ باس لە هەموو سەروەرییەکانی بکرێت بۆیە تەنها چەند شتێکی زۆر کەمو کورت لەنێو ئەو نەبەردیانەدا وەك سەرگوزشتەیەك دەگێڕمەوە.

لە (١٠/٨/١٩٨٠) لە شاخی گوڵان بۆسەیەکمان بۆ ئۆتۆمبێلێکی سەربازی دانا، کە ڕۆژانە هاتووچۆی دەکرد، ئێمە بێئاگا بووین کە دووژمن لە هەموو لایەکەوە هێرشی بۆ قەرەداخ کردووە. دوو ڕۆژ پێش ئەو بەرواره مامەڕیشە کۆمەڵێك ئەندازیاری (ڕووس)ی گرتبوو ڕادەستی کاك مستەفا و ئازاد هەورامی کردبوون. لەناکاو توشی شەڕێکی قورسی نەخوازراو بووینەوە، لە شاخی هۆمەر قەڵا شەڕێکی دەستەویەخە و سەنگەر بە سەنگەر ڕوویدا، مام دەروێش لەو شەڕەدا ڕۆڵێکی زۆر قارەمانانەی بینی و یەکێك بوو لەوانەی قۆڵێکی ئەو شەڕەی گرتبووە ئەستۆو بۆ مێژوو دەیڵێم ئازاییەتییەکی بێ وێنەی نواند. لەو شەڕەدا دوژمن زیانی زۆری لێکەوت، بەڵام بە داخەوە هەردوو فەرماندەی پێشمەرگە (بەختیار باخی سەروو و هیوا حەمەفەرەج کانیبی) شەهید بوون.

مام دەروێش وەك چۆن لە مەیدانی شەڕدا قارەمان بوو، لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە پیاوێکی قسەخۆش بوو. جارێکیان لای گوندی سیارە و بیرکێ بۆسەیەکمان دانا، مامۆستا جەلال و ڕەوفی یاسەشمان لەگەڵبوو، سوویا بەرەو ڕوومان هاتن و بوو بە شەڕ. ئێمە قسەمان پێ دەگوتن و بە عەرەبی دەمانگوت (يسقط نظام الفاشي)٠ مام دەروێش عەرەبی نەدەزانی دەیگوت بڕوخێ سوڵتەی گڵاوەکان.

جارێکی دیکەش لای گوندی میرەدێ بۆسەیەکمان دانا بێ ئاگا بووین لەوەی ژنێك لە گوندەکە مردبوو و خەڵك لە سەرقەبران بوون. سوپا لە

سەربازگەی دوودارەوە بۆمان هاتن و توشی شەڕێکی قورس بووین، مام دەروێش گوتی حەمەی ڕەشە با بڕۆین ئێستا جاشەکان دێنە سەرمان. چەند مەترێك لەمن دوورکەوتەوە گولە هاوەنێك لە پاڵیدا دای بە زەویدا، مام دەروێش هاواری کرد شێخ سمایلی کڵاو قوچ، کە لێی نزیك بووینەوە بینیمان مام دەروێش بریندار بووە، بەڵام توانیمان بەسەلامەتی لە شەڕەکە دووری بخەینەوەو بیگەیەنینە ناوچەی ئازاد کراو.

## کورتەیەك لە چیرۆکی (سەربازێکی ون)

**عەلی حسین (٢٠١٨)**



ئەو سەربازە ونە ئەو پێشمەرگە ماندوونەناسە کە هەموو ژیانی بەخشیوەتە ئامانجێك، مافێکی ڕەوای گەلێکی چەوساوە و ژێر دەستەی داگیر کەران، کە ئەویش گەلی بەشمەینەتی گەلی کوردە لە پارچەی دابڕاوی باشوری کوردستان.

ئەو پێشمەرگە بە وەفایە (ساڵح عەلی فارس) ناسراو بە مام دەروێشە.

مام دەروێش، دووجار دەروێشە بە ڕاستگۆیی و دڵپاکیی و بە وەفایی؛

١) دەروێشی ڕێگەی تەریقەت و خوداپەرەستی بەو پەڕی قەناعەت و ئیخلاسییەوە بۆ یەکتا پەرستیی و گەشتن بە ئامانجی ڕازیبوونی پەروەردگار.

٢) دەروێشی ڕێگەی کوردایەتی بەوپەڕی دڵسۆزی و بێ دریغی کردن، لە سەختی ڕێگاو بە بێ گوێدانە هیچ ناستەنگ و لەمپەرێك لە ئاوارەیی و دەربەدەری، لە برسییەتی و نەداری لە شەونخونی و سەرماو گەرمای سروشت، دژە کردەوەی داگیرکەران یەك زەرە لە ورەو بیر و باوەڕی ئەم تێکۆشەرەی کەم نەکردووەتەوەو بە پێچەوانەوە زیاتر پشوو درێژو سووربوونی لەسەر خەبات زیادی کردووە.

ئەم تێکۆشەرە گەر بەمانا شۆڕشگێڕییەکەی بڵێین تێکۆشەر و خەباتگێڕێکی تا سەر ئێسقان پاك و بەوەفاو ڕاستگۆ و ئازا و کۆڵنەدەر بووە.

له هەردوو ڕێگاکەدا، هەمیشە لە ناخۆشترین و سەخترین هەلومەرجدا خودا و نیشتمان و خەبات و ڕزگاری لەبیر نەکردووە و هەمیشە لە هەڵمەت و پەلامار و داستانەکاندا بە ئیلهام وەرگرتن و پشتبەستن بە پەروەردگار و لەوێشەوە ئیمانی بەڕەوایی و ڕاستی ڕێگاکەی بووتە دەروێشێکی ڕاستەقینەی سەنگەری بەرگری و تێکشکانی دوژمنانەکانی، ئەم تێکۆشەرە بە ئیمانە ئەم پێشمەرگە دڵسۆز و ڕاستگۆیە، نە لە قوتابخانەیەك وانەی خوێندووەو نە لە حوجریەکی مزگەوت ئیجازەی وەرگرتووە و نە لە هیچ کۆلێژ و پەیمانگایەکی سەربازی وانەی خوێندووە، تەنها قوتابخانەی ئەو بۆ فێربوون و ئەزموونی سەربازی و هونەری جەنگ تەنها شۆڕش و سەنگەری پێشمەرگایەتی بووە، کە سەدان تێکۆشەری وەك دەروێش باشترین وانەیان لێ وەرگرتووە.

شتێکی دیکە کە ئەم تێکۆشەرە جیا ئەکاتەوەو بە بۆچوونی من نموونەی کەمە، ئەویش لایەنی ئەخلاقی و بە وەفاییەتی، چونکە ئەم پێشمەرگەیە هەرچەند نەخوێندەوار بووە، بەڵام لەڕووی هۆشیارییەکەیەوە زۆر لە دەوروبەرەکەی بە ئاگابووە و لە ڕووی هەڵسوکەوت و تێکەڵاوی خەڵکەوە پیاوێکی زۆر کۆمەڵایەتی و هاوکاری خەڵکی هەژار و زەحمەتکێش بووە و هیچ کات خۆی لەسەروی خەڵکەوە دانەناوە. بە تایبەت لە نێو هێزی پێشمەرگەو بنکە و بارەگاکانداو هەمیشە بەوپەڕی خۆنەویستیی و سادەییەوە خزمەتی کردووە، چووبێتە هەر ماڵێك وەك برا و خوشك و دایك هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەو خێزانانەدا کردووە، دیارە دەروێش بەردەوام لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا ژیاوە هەر لە سەرەتای ساڵانی شەستەکانەوە تێکەڵاوی خەبات بووەو زۆربەی ناوچەکانی کوردستان گەڕاوە.

ئەوەندەی بەندە کە وەك هاوڕێ و هاوسەنگەر و پێشمەرگەیەك چەندین ساڵ لە نزیکەوە خەباتمان کردووەو لە سنوورێکدا بووین، هەرچەند من وەك

کادیرێکی سیاسیی پێشمەرگایەتیم کردووە، بەڵام لە زۆر هەلومەرجدا پێکەوە بووین یان لە سنوورێکدا کارمان کردووە، ئەوەی کە من تێبینیو زانیاریم لەسەر کەسایەتی ناوبراو هەبووە بەم کورتەیە کە باوەڕ ناکەم حەقی خۆیی پێ بدەم، بەڵام هیوادارم ژیاننامەو خەباتو تێکۆشانی ئەم سەربازە دڵسۆزانە ببنە دەرس و وانە بۆ قوتابیانی ڕێگای خەبات و تێکۆشانی کوردایەتی. ئومێدی تەندروستی باشو تەمەن درێژی بۆ هەڤاڵ و هاوڕێم (مام دەروێش) دەخوازمو داوای لێبوردن لە کەم و کورتی نووسینەکەم دەکەم کە دەکرا زۆر زیاترو قوڵتر بچومایەتە نێو بەسەرکردنەوەی ئەم هاوڕێو هاوسەنگەرە سەربەرزەم.

## مام دەروێش، پێشمەرگەیەکی قارەمان

**جەلال شێخ تۆفیق (٢٠٢٠)**



مام دەروێش پێشمەرگەیەکی ئازا و قارەمان هەتا بڵێی چاو نەترس، رەفتارو کردار جوان، خۆنەویست و بەخشندە، دەست پاك و داوێن پاك، هەرگیز هیچ حسابێکی بۆ دوژمنەکەی نەدەکرد و لە کاتی پەلاماری دوژمندا هەمیشە لە ریزی پێشەوە بوو، دوژمن لە شەڕگەدا چەند بەهێز بووایە لای مام دەروێش وەك کارتۆنێکی پڕ لە هەوا بوو.

رۆژێکیان لەگەڵ هەردوو شەهیدی قارەمان، شەهید باقی و شەهید تەنیا قسەمان دەکرد ئەوان باسی ئازایەتی مام دەروێشیان کرد، گوتیان ئەگەر لە شەڕدا مام دەروێشمان لەگەڵ بێت وا دەزانین دەبابەمان لەگەڵدایە و هەموو جوڵەیەکی ئەو پیاوە وورەمان پێدەدات.

لە شەڕی گوندی چەمەرگە مام دەروێشمان لەگەڵدا بوو کە رۆڵێکی قارەمانانەی تێدابینی. لەو شەڕەدا بریندار بوو. فیشەکێك لە نزیکی کەمەری دابوو لە پشتیەوە دەرچووبوو. کە بینیم زۆر ترسام کە شەهید ببێت، چونکە شوێنی برینەکەی زۆر مەترسیدار بوو و پێشتریش پێشمەرگەم بینیبوو کە فیشەك بەر ئەو ناوچەیەی جەستەیان کەوتبوو شەهید بووبوون.

زۆر بیرم لێ ئەکردەوە لەلایەك بەتەمەن بوو منداڵەکانیشی ورد بوون.
بە پەلە ناردمەوە بۆ دواوە بۆ گوندی باوەخۆشێن و تا شەڕەکە تەواو بوو و گەڕاینەوە هەر خەمی ئەوم بوو. کە گەڕاینەوە بۆ باوەخۆشێن مام دەروێش بەپێی خۆی هات بە پیرمانەوە، کاتێك کە بینیم لەلایەکەوە خۆشحاڵ بووم بەپێی خۆی دەگەڕێت، لەلایەکی دیکەشەوە دەترسام تووشی خوێن بەربوون ببێت و شەهید ببێت. ئێمە لە خەمی ئەودا بووین ئەویش لە خەمی ئێمەدا بوو، یەکەم شت گوتی زۆر لە خەمی ئێوەدا بووم چونکە هێزەکەی ئێمە کەم و هێزەکەی دوژمن زۆر بۆیە زۆر خەمی ئێوەم بوو شوکر بۆ خوا هەموو سەلامەت بوون. ئیتر خۆم پێ نەگیرا گوتم ملی ئێمە دەشکا، تۆ کێ پێی گوتوویت بگەڕێ، لە ماڵ دانیشە با تووشی خوێن بەربوون نەبیت. لە وەڵامدا گوتی خەمی منتان نەبێت هیچ عەیبێکم نیە. لەو کاتەشدا خۆنەویست خەمی هاوڕێکانی بوو.
بە کورتی مام دەروێش هەرچی باشەیەك هەیە لەودا هەبوو، لەبەر ئەوە نە بە نووسینێك و نە بە کتێبێك ناتوانرێ باسی لێوە بکرێت. هەزار سڵاو بۆ رۆحی پاکی مام دەروێش و هەموو شەهیدانی کوردستان.

٢٠٢٠/١/١٨

دانیمارك

# چەند دێڕێکی بچووك بۆ (کتێبە گەورەکەی مام دەروێش)

## ئازادە ڕەش (٢٠١٩)



پیاوە پۆڵاینەکەی هەرێمی (٥) و سنوری قەرەداغ، من هەر لە سەرەتای دروستبوونەوەی شۆڕش و پێشمەرگە، ناوی مام دەروێشم بیست، بەڵام بۆ یەکەمجار لە کۆتایی ساڵی (١٩٨١) کاتێك هێزی هەرێمی (٥) بۆ پەڕینەوە بۆ شارباژێڕ لە گوندی زەڵەڕەش کۆبوونەوە، من بە دیداری مام دەروێش شاد بووم.

پاش ماوەیەکی کەم لە کاتی گەڕانەوەیان لە شارباژێڕ بۆ قەرەداغ لە ڕێگەی دوکانیان لە پشتی خەراجیان بە ئۆتۆمبێلەکەی شەهید حەمە سعید سێتەلانی وەرگەڕان و مام دەروێش دەستێکی بریندار بوو ، چەند ڕۆژێك تا لەگەڵ ئێمە بوو لە بناری شارەزوور پێم خۆش بوو وەك کوڕێکی خۆی خزمەتی بکەم، هەرچەندە دەستی بریندار بوو، بەڵام هێندە کردە بوو پێوەی دیار نەبوو، هەمیشە مایەی هێزو ورە بوو بۆ ئێمەی پێشمەرگە... بەردەوام مام دەروێش بە حەوت پێشمەرگە حیساب دەکرا، بۆ هەر کار و چالاکییەك کە دەیانگوت مام دەروێش واتە؛ بە تەنها حەوت پێشمەرگە، ئێمە وەك هێزی پێشمەرگەی سنوری قەرەداغ بەردەوام مام دەروێش لەگەڵمان بووە وەك

فەرماندەیەکی بەهێز و کارامە هەمیشە مایەی ورە بەرزی بووە بۆ ئێمە. لە هەموو شەڕە تفەنگ و چالاکییەکدا مام دەروێش شوێندەستی دیاربووە و ناوبانگێکی بۆ خۆی دیارکردووە.

ساڵی (١٩٨٣) لەگەڵ برایانی حیزبی شیوعی تووشی شەڕ هاتین، بەڵام بە فەرمانی مەلا بەختیار وەك لێپرسراوی مەڵبەندی یەك و بەهادین نوری بەرپرسی ناوچەی سلێمانی حیزبی شیوعی بڕیار درا شەڕ نەکەوێتە ناوچەی قەرەداغ و سنوری مەڵبەندی یەك، چونکە هەردوولا باوەڕیان بە شەڕکردن نەبوو هەرچەندە لە نزیك گوندی مەسۆیی قەرەداغ و گوندی گۆمە زەرد دوو هێزی ئێمە و حیزبی شیوعی پێکا هەڵپژان و چوار کوژراوی لێکەوتەوە، بەڵام وەك کارەسات حیساب کرا، چونکە شەڕ کردن خواستی هیچ لایەك نەبوو. لە دوای ئەو شەڕە هێزەکانمان لە یەك دوور کەوتنەوە و بڕیاردرا هێزی هەردوولا لە یەك دووركەونەوە، تا شەڕی نەخوازراو دروست نەبێت.

ڕۆژێك مام دەروێش بە کارێکی تایبەت بەرەو دوکان دەچێت و دەکەوێتە نێو هێزێکی برایانی حیزبی شیوعی و دەستبەسەری دەکەن. کاتێك من هەواڵەکەم زانی زۆر خەمی مام دەروێشم بوو، چونکە خۆشەویستی هەموومان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا شیوعیەکان پێشتر چوار کەسیان لێ کوژرابوو دەترساین تۆڵە لە مام دەروێش بکەنەوە، لە کاتێکدا ئەو شەڕی ئەوانی نەکردبوو. لەو کاتەدا من جیهازێکی (١٠٥)ی کۆڵەپشتم پێبوو، جیهازەکەی من لە کاتی پەیوەندیدا ناوی ئاگر بوو، جیهازەکەی مەلابەختیار ناوی ئەزمەڕ بوو، لە حاجی مامەند خالیدی پورە مینا ئیشی پێ دەکرد، من بە پەلە سەرکەوتمە سەر شاخی پشتی فەقیرەو پەیوەندیم کرد بە ئەزمەڕەوە، گوتم ئەزمەڕ هەر ئێستا کاك مەلا بەختیارم بدەرێ، ئەویش هاتە سەر خەت و گوتی چی بووە؟ گوتم مام دەروێش بە تەنها چووەتە دوکان و

لەڕێگادا کەوتووەتە نێو هێزێکی شیوعیەکان و دەستبەسەریان کردووەو خۆیشت دەزانی بڕیارە ئێمە شەڕ نەکەین. گوتی ئێمە سنورمان جیاکردوەتەوە ئێوە بۆ دەچنە سنوری ئەوان؟ گوتم بە هێزەوە کەس نەچووە تەنها مام دەروێش بە تەنها بۆ کارێکی تایبەتی خۆی چووە. گوتی هەر ئێستا پەیوەندی دەکەم بە کاك (بەهادین نوری)یەوە، خۆ ئەگەر مام دەروێش شتێکی لێبێت ناتوانین بەر لە هەڵگیرسانی شەڕی نێوانمان بگرین، پاشان لەڕێی وتووێژەوە کێشەکە کۆتایی پێهات و مام دەروێش ئازاد کراو ئێمەش زۆر خۆشحاڵ بووین بە گەڕانەوەی. مام دەروێش ئەم دەسگیرکردنەشی بووە مایەی خێرو بووە هۆی زیاتر نزیك بوونەوەی ئێمەو شیوعییەکان و متمانە لە نێوانمان دروست بوو ، واتە؛ مام دەروێش هەمیشە ڕەمز بوو بۆ خەبات و شۆڕش و پێشمەرگایەتی.

## پێشمەرگەیەکی بەتەمەن
## عەلی شێخ عەبدولقادر عازەبانی
## (٢٠١٨)



پـایزی (١٩٨٠) بـوو لـە نزیـك گوندەکـەمان (عازەبـان) باخێکمـان هەبوو نزیکی ئاوایی بوو، باخەکە لە شـوێنێکی چـەپەرو نـەدیودا بـوو، رۆژانە سەردانی باخەکەم دەکرد.

لـەو کاتـەدا تەمـەنم نزیکـەی (١٠) سـاڵێك دەبـوو، رۆژێـك وەك هـەر رۆژەکانی دیکە بەرەو باخەکە بەڕێکەوتم، کاتێك کە نزیك بوومەوە گوێم لە دەنگە دەنگێك بوو، کە زیاتر نزیك بوومەوە بینیم هەشت نۆ چەکداربوون و جلی خاکییان لەبەربوو، چومە لایان و سڵاوم لێکردن، لە کاتی گفتوگۆی نێوان خۆیانـدا بـۆم دەرکـەوت کـە پێشـمەرگەن. هەرچـەندە پێشـتر چـەند جارێـك پێشمەرگەم دیبوو، بە شەو دەهاتن و نانیان دەخواردو دەرۆشتن، بەڵام ئەوە یەکـەم جـارم بـوو بـە رۆژ بیـانبینم. دیـار بـوو ئـەوان چاوەڕوان بـوون خـۆر ئاوابێت و بۆ پشوودان و نانخواردن بێنە ماڵەکان. لەو کاتەدا حکومـەت بەهێز بـوو، پێشـمەرگە زۆر بـە وریاییـەوە مامەڵـەیان لەگـەڵ ڕووداوەکـان دەکـرد. کاتێك دانیشتم لایان، پرسیاری نـاو دێیـان لێکـردم، لەنێو ئەو پێشمەرگانەدا یـەکێکیان لـە هـەموویان بەتەمـەنتر بـوو و مانـدوێتی زیـاتری پێـوە دیـاربوو،

لەوە دەچوو تفتی‌و تاڵی ژیانی زۆر چەشتبێت، چونکە بە سەرنجدانێکی کەم چەندین چیرۆك‌و بەسەرهاتی خەمناکت لە سیمایدا دەخوێندەوە، دیاربوو زەمانە زۆری ڕەتاندبوو، چونکە تاڵە تاڵە مووە سپییەکانی شاهیدییان بۆ ئەزموونی خاوەنەکەیان دەدا. لە ڕادەربڕیندا پیاوێکی بەئاگا بوو، هەر زوو خۆشەویستی خۆی بۆ بەرامبەرەکەی نیشان دەدا، لە کاتی قسەکردندا کە ڕوویان تێدەکرد بە مام دەروێش ناویان دەهێنا، لەو دەستەیەدا کاك حەمە قاشتیشیان لەگەڵدا بوو، دیاربوو هەردووکیان پلەی لێپرسراوێتیان هەبوو. کە گەڕامەوە بۆماڵەوە باسەکەم گێڕایەوە کە وەسفی پێشمەرگەکانم کرد باوکم گوتی ئەوەی تۆ وەسفی دەکەیت دەروێشساڵحە، خەڵکی گوندی سیارەیە، ئەو پیاوە لەوەتەی دەستی تفەنگی گرتووە پێشمەرگەیە. ئیتر لەو کاتەوە ئەو ناوە لە زەینمدا تۆمار بووە، هەرکات پێشمەرگە دەهات بۆ گوندەکەمان سەیرم دەکرد تا بزانم مام دەروێشیان لەگەڵە، هەر جارێك کە دەهات سەرنجی شێوەیم دەدا دەمبینی تاڵە سپییەکانی زیاتر دەبوون و گەواهی کۆڵنەدان و ورەبەرزی خاوەنەکەیان نمایش دەکرد. کاتێك خەڵکی دەیانبینی بەو تەمەنەوە چەکی شەرەفی لە شان کردووە ئەوەندەی دیکە باوەڕیان بە شۆڕشەکە پتەوتر دەبوو.

لە کۆتایی ساڵی (١٩٨٧) دەچووم بۆ سەردانی ماڵە خزمەکانمان لە گوندی قامیشان لە قەرەداغ. لەو کاتەدا دەبوایە زۆر بە وریاییەوە بڕۆشتیتایە، چونکە ئەو دێهاتانە حکومەتی بەعس حیسابی پێشمەرگەی بۆ دەکردن. کاتێك گەیشتمە قەرەداغ لای پێشمەرگەکان ئەحواڵی مام دەروێش ساڵحم پرسی دیاربوو هەموویان بەچاکی دەیانناسی. پێشمەرگەیەك گوتی چەند ڕۆژێك لەمەوبەر بینیومە، ماڵەکەیان لە ئەشکەوتێك دایە لە دەرەوەی گوندی باوەخۆشێن.

لـه(١٩٩١/٣/٨) كـاژێر (٩)ی سـەرلەبەیانی لـە نۆردوگـای نەسـر مـام دەروێـش و كۆمـەڵێك پێشـمەرگە لـە گرتنـی منەزەمـەی حیزبـی بـەعس دەگەڕانەوە، مام دەروێش (BKC)یەكی بە شانەوە بوو، كە هی منەزەمەكەی بەعس بـوو گرتبـوی. پیاوێـك پرسـیاری لێكـرد دەروێش سـاڵح نیازی چـیتان هەیـە؟ لـە وەڵامـدا گـوتی بـە گـوێ چـەمی سـیرواندا هـەتا جەبـەل حـەمرین دەڕۆین و ناوەستین.

له ساڵی (٢٠٠٣) تەمەنم گەیشتبووە (٣٣) ساڵ و تاڵە ڕەشەكانی سەر و سیمام مـاڵ ئاواییان لێ دەكـردم و بە خێرهاتنی تاڵە سپیەكانیان دەكـرد، مام دەروێش ساڵحم بینی هەر پێشمەرگە بوو چەكی لە شاندا بـوو، كاتی پرۆسـەی ئـازادی عـێراق بـوو ئـەویش بـەخۆی و چـەكەكەی شـانیەوە لـە ڕزگـار كردنـی خانەقین دەگەڕایەوە.

شـایەنی باسـە مـام دەروێـش كاتێـك دەچـێت بـۆ پێشـمەرگایەتی هـیچ بەرژەوەندیـەك و كێشـەیەكی تایبـەتی نـەبووە، نـە سـەربازی هەڵاتوو بـووە، نـە كێشـەی كۆمەڵایـەتی هـەبووە، نـە خـاوەنی موڵـك و زەوی و زار بـووە، تـەنهاو تـەنها بـاوەڕبوونی بـە كێشـەی میلەتەكـەی وای لێكـردووە ڕوو لـە شـاخ و پێشـمەرگایەتی بكـات. لـە قـەزای دەربەنـدیخان كـار و موچـەی هـەبوو، بـەڵام زوڵم و زۆرداری ئـەو كاتـەی ڕژێمی پێ قبـوڵ نـەكرا هەر بۆیە مـاڵ و منداڵ و موچەی جێهێشت و ژیانی سەخت و پڕ لە دژواری پێشمەرگایەتی هەڵبژارد.

مـام دەروێـش لـە شـۆڕشـە چـەكدارییەكانی پێشـوودا بەشـدارییەكی كـارای هەبووە و ئـەزموونی شـاخی تـاقیكردبووەوە، دەیزانـی دەردەسـەری زۆر بـۆ مـاڵ و منداڵـەكانی دروسـت دەبێـت، چـوونە شـاخ لـەو كـات و سـاتانەدا ئەوەنـدە سـەخت بـوو هـەر مـام دەروێشـەكان بـوو توانیـان سـنگ بدەنـە بـەر و بـە ورە پۆڵاینەكەیان شەوەزەنگی میللەت و نیشتمان ڕووناك بكەنەوە.

لەمەیدانەکانی ڕووبەڕووبوونەوەدا چەندین جار برینداربووە، ئێستاش ئاسەواری برینەکان بە جەستەیەوە دەبینرێت. ئێستا کە ئەم دێڕانە دەنووسم هەرگیز بارتەقای خەباتی پڕ لە زەحمەتی ئەو پیاوە ماندوونەناسە نییە، کە لەپێناو گەلەکەیدا هەموو خۆشی تەمەنی بە شۆڕش و خەبات و تێکۆشان بەخشی.

جاربەجار لە بۆنەکاندا مام دەروێشم دەبینی دەیگوت هەتا خۆم ماوم ئاواتمە ئەو خەباتەی کە کردوومە یا ئەو ڕووداوانەی کە خۆم بەشداریم تێدا کردووە لە کتێبێکدا کۆی بکەمەوە و بیکەمە دوا ئاواتی ژیانم. منداڵەکانیشی ئاواتەخوازبوون ئەم ئاواتەی باوکیان بهێننەدی، هەرچەند کەسانێکیش بەڵێنیان پێدابوون، بەڵام خۆیان لە بەڵێنەکەیان بواردبوو.

بەندە پێشنیارم بۆ کردو هەموو ئامادەییەکم نیشاندا بەوەی کە چی لە توانامدا هەبێت و بە من بکرێت دەستباری ببم و درێغی نەکەم و گوڵ بە گوڵ و سواڵە و مەڵۆ و شارا لەگەڵیا لە خەرمانێکدا کۆبکەمەوە و پێکەوە شەن و کەوی بکەین و لە بێژنگ و تەتەڵەی بدەین و خەرمانی سووری بەری ڕەنج و خەبات و تێکۆشانی مام دەروێش لە دووتوێی یادەوەرییەکدا پێشکەش بە خوێنەرانی بکەین و ببێتە بەشێکیش لە مێژوو بۆ نەوەکانی داهاتوو.

**خەبات دژی ستەمی چینایەتی**

**حەمە جەمیل بانی خێڵانی (٢٠٢٠)**



هەرچەندە ئێستا تەمەنم (١٠٠) ساڵە و یادەوەرییەکانم لەگەڵ دەروێش ساڵحدا بە باشی نایەتەوە یاد، بەڵام پێمخۆش بوو لە نووسینەوەی بیرەوەرییەکانیدا بەشدار بم کە خانەوادەکەی بە نیازن چاپی بکەن. چونکە من و دەروێش ساڵح مێژوویەکی دێرینمان هەیە.

پێش ئەوەی ببینە پێشمەرگە. لە گوندی سیارە سەردانم دەکرد ئەو کات ئەو لە رێکخستنەکانی حزبی شیوعی کاری دەکرد منیش لێپرسراوی بووم. دوای ماوەیەکی زۆر لە کاری رێکخستن لە ناوەڕاستی شەستەکاندا پێکەوە لە لقی (١٠)ی حزبی شیوعی بووینە پێشمەرگە و لە زۆربەی شەڕەکانی ئەو سنوورە بەشداریمان کردووە و دەروێش بەشدارییەکی کارای هەبووە. بۆ نموونە لە شەڕی بانی خێڵاندا هێندە ئازابووە بە برنەوێکەوە پەلاماری (ناقلە)یەکی سەربازی دابوو.

هاوڕێ ساڵح کوردێکی پاك بوو... لای حیزب و هاوڕێکانی پیاوێکی بەڕێز خۆشەویست بوو، ئێستا کە یادی دەکەمەوە شەهیدەکانی ساڵی (١٩٦٣)ی گوندی سیارەم دێتەوە یاد.

## نیوسەدە فیداکاری
## مەحمود مەلا مارف ئەحمەد برندەیی (٢٠٢٠)



لە شۆڕشی ئەیلول و لە نێو ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لەگەڵ مام دەروێش پێکەوە پێشمەرگە بووین و لە چەندین شەڕ و داستاندا پێکەوە بووین. لەوانە شەڕی رەسوڵە قووڵە لە پشتی تونێلی دەربەندیخان و شەڕی پەیکوڵی و کانی سارد، هێندەی من ئاگادار بم دوو جار بریندار بووە.

مام دەروێش پێشمەرگەیەکی ئازا و قارەمان و لە شەڕەکاندا زۆر بە ورە بوو، خاوەنی نیوسەدە خەباتە بۆ نەتەوەکەی. پیاوێکی سەخی تەبیعەت دەم پاك و دەست پاك و رەوشت جوان بوو و هەرگیز لەخۆی نەگۆڕاوە. هێندە پێشمەرگەیەکی خۆڕاگرو بە ئەزموون بووە مافی خۆیەتی پەیکەرێکی بۆ بکرێ، چونکە هەرچییەك بۆ ئەم پیاوە بکرێ هێشتا کەمە.

کۆچی دوایی مام دەروێش هەموومانی غەمبار کرد، بەتایبەت هاوسەنگەران و عەودالانی کوردایەتی. نەمری و سەربەرزی بۆ مام دەروێشی قارەمان و تێکۆشەر... سەربەرزی بۆ خانەوادەکەی.

## مام دەروێش، مامێکی بەوەفا

## عەلی شەهید قادر (٢٠٢٠)



مام دەروێش ئەو هاوڕێ بە وەفایەی باوکمە، کە لە شۆڕشی ئەیلولدا پێکەوە پێشمەرگە بوون و لە یەك سەنگەردا بەرگرییان لە خاکی کوردستان کردووە تا ئەو ساتانەی لە داستانی سەرتیز و هەندرێن، باوکم گیانی خۆی دەبەخشێتە نیشتیمان..

لەبیرمە ماڵمان لە دەربەندیخان بوو لە خانووی مامە عەلە رەشدا بووین. ئەو سەردەمە من منداڵ بووم زۆر جار مام دەروێش کە مووچەی لە فەرەمانگەکەی وەردەگرت، دەهاتە ماڵمان و دەیگوت تا بەشی برازاکانمی لێ نەدەم بەشی منداڵەکانی خۆم نابەمەوە بۆ گوندی سیارە.

بەراستی مام دەروێش کەسێکی بەوەفا، نیشتمان پەروەرێکی پشوو درێژ، پێشمەرگەیەکی قاڵبووی خەباتی نەتەوایەتی، خەباتگێڕێکی ئازاو بە ورە، خۆشەویست لەنێو دۆست و برادەرەکانیدا، فەرماندەیەکی دڵسۆز بوو بۆ گیانی پێشمەرگەکانی.

درووود بۆ گیانی پاکی

## مشتێك له نموونه‌ی خه‌رمانی پیاوێكی جوامێر
## گوندنشینانی گوندی سیاره

مام ده‌روێش پێش ئه‌وه‌ی كۆچی دوایی بكات و بۆ هه‌تاهه‌تایه به‌جێمان بهێڵێ به نیازی كۆكردنه‌وه و نووسینه‌وه‌ی بیره‌وه‌رییه‌كانی بوو، چه‌ند جارێك هاته نێو گوند كه زێدی خۆی بوو، وه‌لێ به‌داخه‌وه مه‌رگ رێی پێنه‌دا تا خۆی له ژیاندا بوو به چاپی بگه‌یه‌نێت، پاشان زانیمان خانه‌واده‌كه‌ی خه‌ریكی ئه‌و كاره‌یه ئێمه‌ش وه‌ك خه‌ڵكی گونده‌كه‌و وه‌ك كه‌سوكاری مام ده‌روێش حه‌زمان كرد به چه‌ند دێڕێك سۆزی خۆمان له دووتوێی یاده‌وه‌رییه‌كانی مام ده‌روێشدا بخه‌ینه‌ڕوو.

مام ده‌روێش له ته‌مه‌نی لاوێتییه‌وه چووه‌ته كۆڕی خه‌بات و تێكۆشان و دژی داگیركه‌رانی كوردستان چه‌كی مه‌ردایه‌تی له‌شان كردووه. پێشمه‌رگه‌یه‌كی ئازا و پیاوێكی به وه‌فاو دڵسۆز بووه بۆ گونده‌كه‌مان. به‌رده‌وام خه‌مخۆری به‌رژه‌وه‌ندییه‌كانمان بووه. كاتێك حكومه‌تی هه‌رێمی كوردستان دامه‌زرا به‌و رێز و خه‌باته‌ی چه‌ندین ساڵه‌ی كه هه‌یبوو له ده‌رگای هه‌موو به‌رپرس و دامووده‌زگا حیزبی و حكومییه‌كانی ئه‌دا بۆ هێنانی پرۆژه‌ی خزمه‌تگوزاری وه‌ك كاره‌با، ئاو، قوتابخانه و رێگاوبان بۆ گونده‌كه‌مان.

مام ده‌روێش پیاوێكی خۆشه‌ویست بوو و رێزێكی تایبه‌تی هه‌بوو لای هه‌موو دانیشتوانی گونده‌كه. به كۆچكردنی جگه له‌وه‌ی زۆر خه‌مباری كردین، زیانێكی گه‌وره‌ش بوو بۆ له‌ده‌ستدانی دڵسۆز و خه‌مخۆری دێیه‌كه‌مان. دواكارین له یه‌زدان رۆحی شاد بكات و به به‌هه‌شتی به‌رینی خۆی بسپێرێت.



## بۆ مەرگی مام دەروێش
## کەمال غەفور قەرەتۆغانی[1]

(١)

دەروێش تا بڵێیت کەسێکی ژیر بوو
چینی چەوساوەو خاکی لەبیر بوو
پیاوێکی ڕاست و دڵساف و پاك بوو
لە دڵسۆزیدا کەسێکی تاك بوو
خەڵکیی ئەیناسن لە نزیك و دوور
لە دڵسۆزیدا نەیبووە سنوور
هەتا ئەو کاتەی لە ژیان ماوە
بۆ نیشتمانی زۆر تێکۆشاوە
هیلاك نەبووە قەد لە تێکۆشان
کەمتەرخەم نەبووە ڕۆژێ لە ڕۆژان

---

[1] کەمال غەفور قەرەتۆغانی، لە ساڵی (١٩٤٥) لە هەڵەبجە لەدایکبووە و هەر لەوێ خوێندنی قۆناغی سەرەتایی تەواو کردووە. ساڵی (١٩٦٥) پەیوەندی کردووە بە پارتی دیموکراتی کوردستانەوە و بووە بە پ م بەرپرسی سەربازی لقی قەرەداغ. لە شۆڕشی ئەیلول پێکەوە لەگەڵ مام دەروێش پێشمەرگە بوون. تا نسکۆی ساڵی (١٩٧٥) بەردەوام بووە و دواتر چووەتە ئێران و دوای چەند مانگێك گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی. ساڵی (١٩٧٦) لە کارگەی شەکری سلێمانی دامەزراوە. دواتر لەگەڵ دروستبوونەوەی شۆڕشی نوێدا پەیوەندی کردووە بە ڕێکخستنەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە و تا ڕاپەڕین بەردەوام بووە و لەکاری ڕێکخراوەیی دانەبڕاوە و ئێستاش ئەندامی مەکتەبی کۆمەڵایەتی ئەو حزبەیە و بەردەوامە لە نووسینی شیعر.

لە بەرخۆدان و لە خواپەرستی
هەرگیزاو هەرگیز نەیکردووە سستی
هەم پیاوی مزگەوت هەم شۆڕشگێڕ بوو
پیاوێکی ئازاو مەرد و دلێر بوو

(٢)

هەموو تەمەنی بن بەردو دار بوو
پڕ لە ناخۆشی و غەم و ئازار بوو
قەت هیلاك نەبوو ئەو لە تێکۆشان
لە تێکۆشان بوو بەبێ پشوودان
سەرێکی نەویست لەناو سەری بەرز
سەرێکی نەویست بێ هێز و پڕ لەرز
سەرێکی نەویست هەردەم بە کزی
دوور بێت لە سەران بژی بە دزی
سەرێکی نەویست بپژێ لە مەیدان
سەرێکی نەویست لە گوێ ئاگردان
سەرێکی نەویست لە کۆمەڵ و کۆڕ
هێندە قورس بێت ملی بکات شۆڕ
سەرێکی نەویست لە قەدو باڵا
لە ناو سەرانا دیاربێت وەك ئاڵا
سەرێکی نەویست کە لەکەدار بێت
بە لاشەیەوە هەر وەك و بار بێت
سەرێکی نەویست وەك تۆپی ئاسن
لەناو سەرانا گشت کەس بیناسن
نەی ئەویست سەری لە سەران دوور بێ

گەر سەری بشکێ و گەر بە خوێن سووربێ
بە شایەتی خەڵك نەك بە قسەی خۆی
خەڵکانی زۆر هەن شایەت ئەدەن بۆی
لەناو سەرانا لە زۆر جێگەو شوێن
زۆر جاریش سەری سوور بووە بە خوێن

(٣)

لە شەستەکان ئەو گەنجێك بوو
لە گوندێك بوو
کە گوندەکەی دوور لە شار بوو
لە چینێك بوو کە ئەو چینە
ماندووبوونی پێوە دیاربوو
کارو کاسپی گوندنشینیش
یان شوانی بوو یا جوتیاری بوو
لەو کاتەشدا کە کوردستان
پڕ لە غەم و پڕ ئازار بوو
ئەو کاتە بوو داگیرکەران
تەڕو وشکیان بە یەکەوە
گشت ئەسووتان
لە دێهات و لە شاخەوە
تا ئەگاتە ڕەز و بێستان
کوردستانیان ئەکرد وێران
ئەو کاتەش بوو
تروسکەیەك بەدی ئەکرا لە کوردستان
بۆ ڕزگاری خاك و وڵات
لە دوژمن و داگیرکەران

لەو کاتەوە بەرگی خاکیی کردە بەری
بێ گوێدانە هیلاك بوون و
لەناوچوون و دەردەسەری
لەو کاتەوە کە ئەو توانی
چەك هەڵبگرێ چەك کاتە شان
بۆ ڕزگاری وڵاتەکەی
لە دوژمن و داگیرکەران
لەو کاتەوە لە ژیانی
تاقە یەك جار
چەك لە شانی نەکەوتە خوار
لە سەدان شەڕی خوێناوی
بەشدار بووە و بووە ناوی
لە ژیانیدا هەتا ماوە
لە هیچ شەڕێك نەترساوە
لە هیچ کات و هیچ سەردەمێ
هەرگیز ورەی بەرنەداوە
یاخود ورەی نەڕووخاوە
لە ژیانیدا هەتا مابوو
عەشقی کوردو کوردستانی
لەنێو ناخ و لە دڵدا بوو
زۆر بۆ گەل و نیشتمانی
دڵ و دەروون پڕ ئازارو
پڕ لە غەم و پڕ لە ئێش بوو
ئەوەی کە من باسی دەکەم
ئەو کەسەیە نازناوەکەی
مام دەروێش بوو

# مەرگی لە ناکاو

ڕاستە باوکم تەمەنی کردبوو، بەڵام تەندروستی زۆرباش بوو و تا ڕادەیەك زاکیرەی زۆر باش بوو بەو پێیەی ڕۆژانە لەگەڵیدا بووم و بیرەوەریەکانمان دەنووسییەوە هەموو بەسەرهاتەکانی دەهاتەوە یاد و بۆی دەگێڕاینەوە. ماوەیەکی زۆر بەردەوام پێکەوە لە نووسینەوەی یادەوەرییەکانیدا بەردەوام بووین، لە ناکاو لە بەرواری (٢٠١٩/٥/١٦) ڕێکەوتی (١١)ی ڕەمەزان کاژێر (٢:٣٠) دوای نیوەڕۆ دڵە گەورەکەی لە لێدان کەوت، کە هەمیشە بۆ سەرفرازی نیشتمان لێی دەدا، ئێمەش خزم و خەڵکمان ئاگادار کردەوە و دوای بەجێهێنانی فەرزەکانی ئاینی ئیسلام لەسەر وەسیەتی خۆی لە گوندی سیارە بە خاکمان سپارد.

دۆست و هاوسەنگەر و خزمان زۆر گلەییان کرد کە نە ئەبوایە بەو خێراییە ئەسپاردەمان بکردایە و دەبوو مەراسیمێکی شایستەی سەربازیانەی بۆ بکرایە، بەڵام لەبەر ئەوەی کەشوهەواکەی زۆر گەرم بوو کاتەکەش مانگی ڕەمەزان بوو خەڵکەکە بە ڕۆژوو بوون، حەزمان نەکرد لەوە زیاتر خەڵکەکە زەحمەت بکێشن. ئەگەر توانرا بە هاوکاری هەموولایەك لە ساڵیادەکەیدا مەراسیمێکی شکۆی بۆ ڕێك دەخەین کە شایستەی خەبات و ماندوبونی بێت.

لێرەوە دەستخۆشی و سوپاسگوزاری هەموو ئەو خەڵکە دەکەین کە لە ڕێوڕەسمی بە خاك سپاردن و بەڕێکردنی پرسەکەیدا ئامادە بوون و هاوخەممان بوون و سوپاسی ئەوانەش دەکەین کە بە هەر هۆیەك بێت بۆیان نەکراوە یا نەیانتوانیوە ئامادەی پرسەکە بن بەڵام بە نوێنەرایەتی خۆیان یان بە تەلەفۆن یان بە بروسکە بەسەریان کردووینەتەوە. سوپاسی هەموو لایەك دەکەین لە خەمەکەیان کەمکردینەوە.



خانەوادەی مام دەروێش



عەلی شێخ عەبدولقادر    عەلی مام دەروێش

## گلەیی نامە
**ستار ساڵح (٢٠١٩)**

بە رەوای ئەزانم لەناخەوە ئەم گلەییە لەپێشدا ئاراستەی حزبەکەی خۆم بکەم، بۆچی و بە چ هۆکارێك؟

بۆ مەرگی تێکۆشەرێك، پێشمەرگەیەکی دڵسۆز و ماندوی رێگای کوردایەتی کە بەڕای من هێندەی کردووە بۆ گەل و نیشمانەکەی کە نەك قەرزی سەرشانی بەزیادەوە داوەتەوە، بەڵکو سەرجەم حزبەکانی ساحەی کوردستان بە کۆن و نوێوە قەرزاری ئەم تێکۆشەرەن، بەڵام بەداخەوە بۆ دوا سەفەری ماڵئاوایی لە گەل و نیشتمانەکەی، وەك پێویست پێشوازی لە کۆچەکەی نەکرا بۆ بەرێکردن و دوا ماڵئاوایی رێورەسمێکی شایستە رێك نەخرا کە بارتەقای ئەو تەمەنە دوورو درێژەی قوربانی و فیداکاری ئەو کەڵە پیاوە بێت، کە وەك وەفایەك بۆی وەڵامی گونجاوی دۆست و ناحەزانی ئەم گەل و نیشتمانەی بدایەتەوە.

دوور لە بیرکردنەوەی تەسکی حزبایەتی کە ئەو زاتە زۆر دوور بوو لە خۆبەستنەوە بە فکری تەسکی حزبایەتی، هەمیشە و بەڕاشکاوی پابەندی کوردایەتی و نیشتمان پەروەری راستەقینە بوو تا ئەو کاتەی بە یەکجاری کۆچی کرد. ئەو تێکۆشەرە ماندوونەناسەی رێبازی کوردایەتی (ساڵح عەلی فارس) ناسراو بە مام دەروێش ساڵح.

یادی بەخێر و سەرفراز بێت

# ئەلبومی وێنەیی





وەزارەتی دارایی و ئابووری
بەڕێوەبەرایەتی گشتی خانەنشینی
بەڕێوەبەرایەتی خانەنشینی پێشمەرگە

﴿ ناسنامەی خانەنشین ﴾

زنجیرە: ٧٠٥
پلە: عمید
شوێن: دەربەندیخان

بەڕێوەبەری خانەنشینی پێشمەرگە / سلێمانی



**کەمال شاکر. بەخشینی مەدالیای ڕێزلێنانی پێشمەرگە دێرینەکان**



ڕێزلێنان

پێشمەرگەی دێرین بەڕێز صالح عبد خارص وێڕای مەدالیای ڕێزلێنان

سوپاسی هەستی شۆڕشگێڕانە و خۆڕاگریتان دەکەین لە جولانەوەی کوردایەتی و شۆڕش و پێشمەرگایەتی ڕۆڵتان

هەبووە لە سەنگەری شەرەف، شایستەی ڕێز و سەربەرزی گەلەکەمانن، دووبارە ڕێز

بۆ پێشەوە بڕوە و سەرکەوتن

کۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەکانی کوردستان






مام دەروێش     نەوشیروان مستەفا     فەلاح عەلی ئەحمەد



خالید حەسەن عەلی          عەلی حسەین          مام دەروێش          قادر برای شەهید بەختیاری باخ



مام دەروێش          برایم ئەحمەد (برایمە سوور)          حاجی عەبدوڵڵا هۆرینی



(٢٠١٣) کەرکوك

راوەستاوەکان لای راستەوە: سەرکەوت عیزەت – مام دەروێش – رێبوار عەزیز فارس – عەلی دەروێش ساڵح – ئازاد عەزیز فارس – مەهدی محەمەد عەلی – شوانە فایەق – جەلال فایەق حەمە رەشید

دانیشتووەکان: مەهدی عەبدوڵڵا کاکەبرا – ئەحمەد محەممەد عەلی – محەمەد شوانە – سۆران حسەین عەلی



منداڵەکە محەمەد عەلی مام دەروێش – سەربازێکی ئەمریکی – مام دەروێش – ئەنوەر دۆڵانی



شەهید کەریم رەسوڵ مەحمود
خالید حەسەن فارس
دانیشتوو: عەلی مام دەروێش
گوندی سوڵە (١٩٨٢)



عەلی مام دەروێش　　عەلی شێخ عەبدولقادر　　مام دەروێش



حاجی محەمەد مەحمود رەحمان　　　　مام دەروێش



عوسمان محەمەد عەلی دەلۆ – عەبدولڕەحمان ئەحمەد دەلۆ – مام دەروێش
عەبدوڵڵا ئەحمەد عەبدولقادر ناسراو بە (عەبدوڵڵا دەلۆ) – حاجی سەرتیپ رەشید



مەهدی کاکە برا – حسەین عەزیزخانی دەلۆ – عەلی مام دەروێش – ئازاد عەزیز فارس
سۆران حسەین عەلی فارس – مام دەروێش



مام دەروێش – م. نوری حەمە رەشید – شاخەوان مام دەروێش – عەبدوڵڵا کاکەبرا



عوسمان فایەق　　　مام دەروێش　　　فەتاح مەدحەد گەڵاڵی



عومەر عەبدوڵڵا میران　　　مام دەروێش　گوندی سارە (٢٠١٣)



برایم حاجی قادر کانی میلی          مام دەروێش



کاروان عەلە رەش عەلی شێخ عەبدولقادر مام دەروێش خانم خێزانی عەلە رەش عەلی مام دەروێش

(٢٠١٦)



سیڤان مام دەروێش - مام دەروێش - هەردی مام دەروێش
(٢٠٠٨)



فریشتە خێزانی عەلی مام دەروێش - مام دەرەێش - شەیما خێزانی شاخەوانی مام دەروێش



محەمەد حەمە کەریم و هەردی مام دەروێش – فوئاد مەولود – گوڵاڵە و ئەڵوەن مام دەروێش

دانیشتووەکە: فاتم خوشکی مام دەروێش

گوندی مچەکوێر (١٩٨٦)

# پرسه و ماته مینی

پرسه و غەمباری دەرئەبڕین بۆ کۆچی دوایی:
پێشمەرگەی دێرینی گەلەکەمان:
"صالح علی فارس" سیارەیی "ناسراو بە مام دەرویش"
خوای گەورە سەبوری هەموو لایەك بدات و
کۆچکردووش بە بەهەشتی بەرین شاد بکات.
"کۆمیتەی ڕێکخستنی دەربەندیخانی ی.ن.ك"

پرسەی کۆچکردوو
پێشمەرگەی دێرین (صالح علی فارس)
دەلۆیی ناسراو بە مام دەرویش سیارەیی
باوکی علی و هەردی و حاجی شاخەوان
ئەمڕۆ ١٧/٥ یەکەم ڕۆژی پرسەکەیەتی
لە مزگەوتی حاجی صالح کەلالی
انا لله وانا الیه راجعون
خزمانی دەلۆیی

پرسەنامەی مەکتەبی سیاسی بۆ کۆچی پێشمەرگەو تێکۆشەری دێرین ساڵح عەلی فارس

.

بەداخ و کەسەرێکی زۆرەوە، هەواڵی کۆچی دوایی پێشمەرگە و تێکۆشەری دێرینی یەکێتی، ساڵەح عەلی فارس ناسراوبە مام دەروێش -مان پێگەیشت.

مام دەروێش لە پێشمەرگە قارەمانەکانی سەرەتاکانی شۆڕشی نوێ گەلەکەمان بوو بەڕابەرایەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و بەشی زۆری تەمەنی بۆ خەبات لەپێناوی ئازادی سەرفرازی گەلەکەمان تەرخانکرد.

بەم بۆنە خەمناکەوە پرسە و سەرەخۆشی ئاراستەی بنەماڵەو کەسوکار و هاوڕێ و هاوسەنگەرانی دەکەین، هاوبەشی پرسەو پەژارەیائین.

هیواداریین ئەمە دواناخۆشیان بێت و ڕۆحی مام دەروێش بۆ هەمیشە شادبێت.

راگەیاندنی مەکتەبی سیاسی
یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان
ئەنجومەنی ناوەندی



الاتحاد الوطني الكردستاني
المجلس المركزي

PATRIOTIC UNION OF KURDISTAN
CENTRAL COUNCIL

بەڕێزان/ خانەوادە و کەسوکاری سەربەرزی تێکۆشەری دێرین (سالح عەلی فارس)

بابەت / بروسکەی ماتەمینی

سڵاوی خەبات و تێکۆشان...

بە داخ و پەژارەیەکی قوڵەوە هەواڵی کۆچی دوایی پێشمەرگە و تێکۆشەری دێرین ( سالح عەلی فارس ) ناسراویە مام دەرویشمان پێگەیشت، بەناوی سکرتاریەت و سەرجەم ئەندامانی ئەنجومەنی ناوەندییەوە هاوخەمی و ماتەمینی و دڵگرانی خۆمان رادەگەیەنین و سەرەخۆشی لە خانەوادە و کەسوکار و هاوڕێ و هاوسەنگەرانی دەکەین .

مام دەرویش لە پێشمەرگە قارەمانەکانی سەرەتاکانی شۆڕشی نوێ گەلەکەمان بەرابەرایەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو، بەشداری چەندین دەستان و ئەبەردی کردوە و پیاوێکی قارەمان و دڵسۆز و تێکۆشەر بوو زۆربەی تەمەنی خۆی لە پێناوی کوردایەتیدا تەرخان کرد.

داواکارین لە یەزدانی مەزن رۆحی پاکی مام دەرویش بەبەهەشتی برین شاد بکات و ئەوە دوایین ناخۆشیتان بێ.

انا لله وانا الیه راجعون



٥/ ١٦

ئەنجومەنی ناوەندی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

٢٠١٩/٥/ ١٦

# پێرست

- مام دەروێش دەروێشی کوردایەتی و کوردستان بوو

مەلا بەختیار

-مام دەروێش لە هەموو قۆناغەکانی خەباتدا لەبەرەی گەلدا بوو.

مستەفا چاوەڕەش

- مام دەروێش لە پێشمەرگایەتیدا هەرکات لەگەڵتدا بووایە هەستت دەکرد کە پیاوێکی گەورە و قارەمانت لەگەڵدایە.

مام ڕۆستەم

- مام دەروێش پیاوێکی دەم و دەست پاك و بەڕەوشت بوو، بۆیە هەر زوو بووە جێگەی متمانەی خەڵکی.

سەلام کوێخا عزیز

- مام دەروێش ساڵی 1981 پێی گوتین دەبێت شەڕی پارتیزانی بگۆڕین بۆ شەڕی بەرەیی.

محمد قاشتی

- مام دەروێش بەڕاستی پیاوێکی ڕاستگۆ و دڵپاك و بەوەفا بوو.

علی حسین

- مام دەروێش هەمیشە ڕەمز بووە بۆ خەبات و شۆڕش و پێشمەرگایەتی.

ئازادە ڕەش

- مام دەروێش خاوەنی نیو سەدە خەبات بوو بۆ نەتەوەکەی.

محمود مەلا مارف

- مام دەروێش تەنها و تەنها باوەڕبوونی بە کێشەی میللەتەکەی وایلێکرد بۆ پێشمەرگایەتی ڕوو لە شاخ بکات.

علی شێخ عبدالقادر عازەبانی

- مام دەروێش پیاوێکی بەوەفا و ڕەمزی تێکۆشان بوو.

دانیشتوانی گوندی سیارە